# تیـۆری رۆمان

(تیۆر ـ رەخنە ـ لێدوان )




یان وات
دەیڤید لاج
دەیڤید دەیچز
جان هاڵپڕین
ئالێن ڕۆب گرێ
رەیمۆند ویلیەمز
جان ستۆلووردی
ئارنۆلد کێتل
پیتەر فاکنەر

**وەرگێڕ: حوسێن شێربەگی**

# نێوەرۆک:

## سەرەیا:

سەربوردی ئەم کتێبە لە دەسپێکی وەرگێڕانەوە تا ئەم کاتە کە لە قەوارەی کتێبدا دەگاتە دەستی خوێنەر، سەربوردێکی پڕ لە کارەسات و بەزمەسات و رووداوی تاڵ و شیرینە و ئەنجام و کۆتاییەکەی بە رواڵەت رەنج بەبایی‌یە بۆ منی وەرگێڕ. هەر لەو کاتەوە کە دۆستێک ئەم کتێبەی پێ ناساندم و دنەی وەرگێڕاندنی خستە هەناومەوە، چ ئەو ساڵە وەختەی سەرقاڵی وەرگێڕان و پێداچوونەوە و پیت چنینی بووم ، چ ئەو مانگانەی گۆڤارێک سێ وتاری لە پێنج ژمارەدا لە چاپ دا و چ ئەو کاتانەی بە دوای چاپکردنی لە قەوارەی کتێبدا بووم، هەر هەمووی کارەسات و بەزمەسات بووە، بەڵام ئەمە با بمێنێتەوە بۆ کاتی خۆی و مێژووی وەرگێڕانی تیۆری ئەدەب لە نێو ئێمەی کورددا.

بەڵام ئەم کتێبە دوو مەبەستی گەورەی لە بەرچاو گرتووە: ١ــ شرۆڤەی مێژووی سەرهەڵدان و گۆڕانکاری رۆمان.

٢ـ ناساندنی ئەو تەکنیکانەی لە نووسینی رۆمانە جۆراجۆر و جیاوازەکاندا دەکار کراوە. گشتی ئەم وتارانە بوونەتە وتاری کلاسیکی و ئاکادیمیکی و لە زانکۆ گرینگ و ناودارەکانی وڵاتە پێشکەوتووەکاندا وەک وانە لە یانەکاندا دەخوێندرێن و لە لایەن هەموو تاقمە جیاوازەکانی بواری ئەدەبدا پەسند و ئەوتۆن و بایەخی تایبەتیان هەیە. ئەو خوێنەرەی ئەم کتێبە موتاڵا بکات زۆر قوڵ و بەربڵاو دەگەڵ گۆڕانکاری رۆمان و تیۆری رۆمان و قوتابخانەکانی رۆمان و چەمک و وتەزا و کێشە و تەکنیکەکانی رۆمان لە سەرەتاوە تا هەنووکە بە وردی دیوناسی دەبێ و گۆشە نیگایەکی روونی لەم بابەتە وەچنگ دەکەوێ. هەر وەکو وەرگێڕی فارسی ئەم کتێبە (دوکتۆر حوسێن پایەندە) وتوویە، منیش هیوادارم ئەم کتێبە بەشدار بوونێکی من بێت لە ناساندنی رۆمان و تیۆر و رەخنەی رۆماندا. وێڕای رێز و سوپاسی زۆرم بۆ کاکە رەزا عەلی‌پوور کە ئەم کتێبەی پێ ناساندم و رێز و سوپاسی زۆرم بۆ کاکە حەمەدەمین شاسەنەم کە لە پیتچنینی ئەم کارەدا زۆر زۆرم پێوە ماندوو بوو و زەحمەتی زۆری بەم کارەوە کێشا.

چما کەم و کوورپییەکتان لەم وەرگێڕان و کتێبەدا بینی زۆرم پێ‌خۆشە ئاگادارم کەن.

بە سوپاسەوە: حوسێن شێربەگی (٦٢٢٥٤٣١)

# سەرهەڵدانی رۆمان

نووسەر: یان وات (Ian Watt)

## ریئالیزم و چەشنی ئەدەبی رۆمان

زۆربەی ئەو پرسیارە گشتی‌یانەی بۆ لایەنگرانی رۆماننوسانی سەدەی هەژدە و بەرهەمەکانی ئەوان لە ئارادایە، هێشتا وەڵامێکی قنیات سازی نەدۆزیوەتەوە. بڕێک لەم پرسیارانە بریتین لە: بڵێی رۆمان «چەشنێک» ئەدەبی تازە بێ؟ گریمان وەڵام «بەڵێ» ش بێ ـ کە بە گشتی هەر وایە ـ هەروەها چما بیسەلمێنین کە دانییل دیفۆ، ریچارد سۆن و فیلدینگ یەکەم رۆماننوسان بوون، ئەم پرسیارە قوت دەبێتەوە کە جیاوازی رۆمان لە گەڵ ئەو چیرۆکە پەخشانییانەی کە پێشتر بۆ وێنە لە یۆنانی کۆندا و لە سەدەکانی نێوەڕاستدا، یان لە فەڕانسای سەدەی حەڤدەدا دەنووسرا چیە؟ بڵێی بۆ سەرهەڵدانی ئەو لایەنە جیاوازانە لە زەمان و شوێنێکی دیاریکراودا، هۆکارێکی تایبەت هەبێ؟

ئەم پرسیارە هەمە لایەنانە، هەمیشە دژوارن و وەڵامدانەوەی ئەوان چەتوونترە. ئەم چەشنە پرسیارانە بە تایبەت لەم باسە تایبەتیانەدا پۆشراوەیە، چونکە دیفۆ، ریچاردسۆن و فیلدینگ هیچکامیان بنیاتنەری قوتابخانەیەکی ئەدەبی «بەو واتا باوەی» نەبوون: لە راستیدا نیشانەی کار تێکردنیان بە ئاسەوارەکانیانەوە زۆر کەم دیارە و پێناسەی چیرۆکەکانیان وەها لە گەڵ

یەکدیدا جیاوازی هەیە کە لە یەکەم نیگادا وامان دێتە بەر نەزەر کە بە پرسیار بوونمان سەبارەت بە چۆنیەتی سەرهەڵدانی رۆمان، هەر بەم راڤە بناغە لاوازانەوە دەتوانین بیسەلمێنین کە «نبوغ» و «هەڵکەوت» لە گۆڕێدا بوون، یانی هەمان سەری دوو نێو چاوانی ژانووس و گریێ پووچکەی مێژوو. ئەم جۆرە وەڵامدانەوەیە ناتوانین بە جارێ لە بەر چاو نەگرین، بەڵام یارمەتییەکی زۆریش بۆ دۆزینەوەی پرسیارەکانی ئێمە ناکەن. بەم هۆکارەوە ئەم لێکۆڵینەوەیە رێگەیەکی دیکەی گرتۆتە بەر. پێش گریمانەی ئێمە ئەمەیە کە هاونەوەبوونی ئەم سێ رۆماننووسە بگرە بە «هەڵکەوتێکی رەها» نەبووبێ، بێج لە نبووغی ئەوان. بارودۆخی ئەو سەردەمەش لە سەرهەڵدانی ئەم چەشنە ئەدەبەدا ـ یانی رۆمان ـ دەستی تێدا بووە.

بە پێی ئەم پێش گریمانەیە لەم لێکۆڵینەوەیەدا حەول دەدەین هەتا بزانین ئەم بارودۆخە باشەی ئەدەب و کۆمەڵایەتییە کامانە بوون و دیفۆ، ریچاردسۆن و فیلدینگ بە چ چەشنێ کەڵکیان لێ وەرگرت.

لەم لێکۆڵینەوەیەدا دەبێ لە پێشدا وەسفێک لە تایبەتمەندییەکانی رۆمان پێشکەش بکەین، وەسفێکی وا کە لە لایەکەوە ئەوەندە گشتی بێ تا هەموو ئەو شتانەی کە ئاسایی‌یانە لە چەمکی رۆماندا دەگونجێن، لە خۆیدا بگرێ و لە لایەکی دیکەوە هێندە سنووردار بێ هەتا چەشنەکانی پێشووی ئەدەبی گێڕانەوە لە خۆیدا نەگرێ. خودی رۆماننووسانی نێو براو لەم بەستێنەدا چەندانیان یارمەتی ئێمە نەداوە. باوەکوو ریچارد سۆن و فیلدینگ خۆیان بە داهێنەری چەشنێکی تازەی چیرۆکنووسی دادەنا و رایان وابوو کە بەرهەمەکانیان نیشاندەری دابڕانێک لە چیرۆکی حەماسی ـ ئەویندارانەی لە برەو کەوتووە، بەڵام نە ئەوان و نە هاوسەردەمەکانی ئەوان هیچکامیان تایبەتمەندی ئەم چەشنە ئەدەبە تازەی کە ئێمە حەوجێمان پێیەتی بە دەستەوە

نادەن. لە راستیدا ئەوان تەنانەت نەیانهەویست لە سەر جیاواز بوونی شوناسی چیرۆکەکانیان هەر بە گۆڕینی ناوی «چەشنی ئەدەبەکەی» جیاوازی بوونەکە بیسەلمێنن و هەر لە دوایـین ساڵـەکانی سـەدەی هـەژدەدا بـوو کـە زاراوەی «رۆمان» تەواوەن برەوی پەیدا کرد.

تـوێژەرانی مێـژووی رۆمـان بـە هۆکـاری ئاسـۆی روانـینی بەربـڵاوتریانەوە یارمەتییـەکی زۆر زێـدەیان بـە دابینکـردنی تایبەتمەندییـەکانی تایبـەت بـەم چەشنە ئەدەبە تازەیە کرد. ئەوان بە گشتی بیرۆکەیان وایـە کـە ریئـالیزم ئـەو تایبەتی‌یە بەرچاوەیە کـە بەرهەمـەکانی رۆماننووسـانی پێشقەدەمی سـەدەی هەژدە لە ئەدەبی چیرۆکی دەورەکانی رابردوو جیا دەکاتـەوە. حەتمـەن لـە پێش قەبووڵ کردنی ئەم مەرجـەدا «کـە چیرۆکنوسـانی هـەموو بەسـتێنەکان، بێج لە ریئالیزم پێکەوە جیاوازی‌یان هەیـە» دەبـێ لـە پێـشدا خـودی زاراوەی ریئـالیزم زیـاتر راڤـە بکـەین، لانی کـەم بـەم هۆکـارەوە کـە وەرگـرتن و سـەلماندنی بـە بـێ شـەرت و مـەرجی ئـەو لـە حـوکمی تایبـەتی شوناسـی «رۆماندا» شک بۆی دەچێ دەلالەت لە سـەر ئـەم رایـە ناعادڵـانەیە بکـا کـە هەموو چیرۆکنووسان و چەشنە ئەدەبە جۆراوجۆرەکـەی رابـردوو بـە شـوێن شتێکەوە بوون کە جیا لە راستەقینە بووە.

زاراوەی ریئالیزم لـە بـاری رەخنـەیی‌یـەوە بـە گـشتی لـە گـەڵ قوتابخانـەی ریئالیستەکانی فەڕەنسی دێتەوە یاد. بە رواڵـەت ریئـالیزم بـۆ یەکـەم جـار لـە ساڵـی ١٨٣٥دا وەکـی وەسـفێکی جـوانی ناسـین بـۆ جیـاوازی «راسـتەقینەی ئینـسانی» نەقاشـی‌یـەکانی رامبرانـد لـە «خەیاڵـات خـوازی شـیعر ئاسـای» شێوەکارانی نوێ ـ کلاسیک دەکار کرا وپاشان لـە ساڵـی ١٨٥٦دا لـە دوای دامەزراندنی گۆڤارێک بە نێوی «ریئالیزم» کە ویراستارەکەی دیۆ رانتی بوو، بـووە زاراوەیـەکی ئـەدەبی. بـە داخـەوە لـە پـاش قـسە و باسـێکی تونـد و

بوغزاوییانە کە سەبارەت بە هەوێنی کارەکانی «رەدە خواروو» و خوازینەی بە ئیستلاح دژ بە نەریتی ئاکاری ئەو دا بە سەردا هات، لە بە کەڵکبوونی وشەی ریئالیزم تاکوو رادەیەکی زۆر کەم بۆوە. لە ئاکامدا لەوە بە دوا ریئالیزم بە گشتی بە واتای پێچەوانەی «ئایدیالیزم» دەکار کرا و ئەم واتا نادروستە ـ کە لە کردەدا رەنگدانەوەی سەنگەری نەیارانی ریئالیستەکانی فەڕەنسی بوو ـ لە راستیدا بەشێکی گەورە لە نووسەرانی رەخنەیی و مێژوویی سەبارەت بە رۆمانی هێناوەتە ژێر سێبەری خۆیەوە. زۆر جار وا دادەندرێ کە مەبەست لە پێشینەی رۆمان، دۆزینەوەی هەودایەکە وا لە نێوان تەواوەتی ئەدەبی چیرۆکی کە لە چاخەکانی پێشوودا ژیانی چینە ژێردەستەکانیان کێشاوەتەوە، پێوەندی پێکدێنێ. بەم هۆیەوە بۆی دەچێ چیرۆکی «ژنە کەیبانووی ئافسێسی» ریئالیستی یە، چونکوو نیشان دەدا ئیشتیای نێرمایی دەتوانێ بە سەر خەم و خەفەتی ژنی خاوەن مێردا زاڵ بێ، بەم چەشنە حیکایەتی تەوس ئاسای هۆنراوەیی یان چیرۆکی قەلاشان ریئالیستییە، چونکە کردەوەی ئینسان لەواندا جۆرێکە کە سەرکەوتنی هۆکارەکانی ماددی یا نەفسانی پیشان ئەدا.

بە پێی ئەم پێش گریمانەیە، رۆماننووسانی سەدەی هەژدەی ئینگلیز و هەروەها ڤۆرتیر (فەرهەنگنووسی فەڕەنسی، ١٦٨٨ ـ ١٦١٩)، سکروو ( ١٦٦٠ ـ ١٦١٠، شاعیر، رۆمانووس و شانۆ نووسی فەڕەنسی) تەشقی سەرووی ئەم نەریتە ئەدەبی یە دەژمێردرێن. لە نێو رۆمانەکانی دیفۆ، ریچاردسۆن و فیلدینگ‌دا لە گەڵ دزی کردنی «ماڵ فلاندرز» و ریایی کردنی «پامێلا» و زیناح کردنی «تام جۆنز»دا پێوەندی‌یەکی پڕاوپڕ هەیە.

بەڵام دەکار کردنی زاراوەی ریئالیزم بە شێوەی ناوبراو ئەم گرفتە گەورەیەی هەیە: ئەو شتەی کە بەڵکەم سەرەکی ترین تایبەتمەندی رۆمان

لە جیاتی چەشنێکی ئەدەبە، بە کەم بایەخی دەنوێنێ. بێتوو ڕۆمان هەر بەم هۆکارەوە بە ریئالیستی دابنێی کە لایەنە ناحەزەکانی ژیان ڕەسم دەکات، ئەو کاتە ڕۆمانمان هەتا پێچەوانەی چیرۆکە حەماسی ـ ئەویندارەکان داشکاندووە. کەچی لە ڕاستیدا بێ شک ڕۆمان تێدەکۆشێ بەو ئەزموونانەی وا لە گەڵ ڕوانگەیەکی ئەدەبی تایبەتدا سازگارە، قنیات نەکات و هەموو ئەزموونە جۆراوجۆرەکانی ئینسان بکێشێتەوە. دەسا دەتوانین بڵێین ریئالیزمی ڕۆمان دەربڕی ئەو چەشنە ژیانەی کە نیشانی دەدا نیە، بەڵکوو دەربڕی «چۆن نیشاندانی» ئەو ژیانەیە.

هەڵبەت ئەم ڕایە زۆر لە ڕوانگەی خودی ریئالیستەکانی فەڕەنسی دەچێ کە زۆر توند جەختیان دەکرد چما ڕۆمانەکانیان زۆرتر لە گەڵ وێنەی ڕەنگ و لوعاب کراو و سەلماندراو، لە زۆربەی کێشە جێ گرتووەکانی ئاکاری و کۆمەڵایەتی و ئەدەبی سروشتی ئینساندا جیاوازی هەیە، هەر بەم هۆیەوەیە کە ڕۆمانەکانی ئەوان بەرهەمی لێکدانەوەی زۆر بە وردی ژیانن یانی لێکدانەوەی زانستی و بێ لایەنگرانە ترێکە لەوەی کە تاکوو ئەو سەردەمە کرابوو. هیچ ئاشکرا نیە کە ئاوها عەینییەت خوازییەکی زانستییانە بایەخێکی بەرز و دڵخواز بێ، حەتمەن لە کردەوەشدا جێ بەجێ نابێ. بەم حاڵەوە خاڵی زۆر گرینگ ئەمەیە کە ریئالیستەکانی فەڕەنسی ڕاست لەو ئاستەدا کە ڕۆمان وەکی چەشنێکی ئەدەبی تازە بۆ یەکەمجار بەردەوام مەبەستەکان و شێوازەکانی خۆی بە وردی دەناسییەوە، سەرنجی خۆیان بەرەو بابەتێک وەرسووڕاند کە ڕۆمان لە هەر چەشنە ئەدەبێکی دیکە زەقتر دایدەمەزراند، یانی هاودەنگی بەرهەمی ئەدەبی لە گەڵ ئەو ڕاستەقینەیەی کە لەودا لاسایی بەرهەم کراوەتەوە، ئەو بابەتە لە ڕاستیدا سروشتێکی مەعریفەت ناسەکی هەیە و دەسا وا دێتە بەر نەزەر کە شوناسی ریئالیزمی ڕۆمان چ لە سەرەتای

سەدەی هەژدەدا و چ لە دەورەکانی دواییدا ـ بە یارمەتی کەسانێک دەتوانین بە باشترین شێوە روونی کەینەوە کە ئەمانە پسپۆڕی شیکاری و لێکدانەوەی چەمکە سەڵتە عەقڵی‌یەکانن، یانی بە یارمەتی فەیلەسوفان.

## بەشی یەکەم:

## پاش بەستێنی فەلسەفی

ئەم دژوازییە رواڵەتییە هەر تازە فێر بووانی ئەم باس و خواسە سەر سووڕماو دەکات، چونکە زاراوەی ریئالیزم بە واتای تایبەتی وشەوە لە فەلسەفەدا بە ئاوها روانینێک لە راستەقینە دەوترێ کە بە جارێ لە گەڵ دەکار کردنی گشتی ئەودا دژایەتی هەیە. ریئالیزم لە فەلسەفەدا بۆ وەسفی روانگەی ریئالیستە ئیسکۆلاستیکەکانی سەدەکانی نێوەڕاست دەکار دەکرا کە بیرۆکەیان وابوو: گشتی‌یەکان، چەشنەکان یا رەبەن ـ ەکان کە «راستەقینە»ی بە راستین، نەک پاژەکان کە شتگەلێکی نارەبەنن و هەر بە هێزی هەستەکانی ئینسان فام دەکرێن. لە یەکەم نیگادا وا دێتە بەر نەزەر کە ئەم خاڵە یارمەتییەکی پێشەوە چوونی باسەکە ناکات، بەڵام هەر ئەم نامۆیی‌یەی ریئالیزمی ئیسکۆلاستیک لانی کەم ئەم بەهرەیەی هەیە کە سەرنجی ئێمە بەرەو یەکێ لە تایبەتمەندییەکانی رۆمان کە هەر وەک مانا فەلسەفییە گۆڕدراوەکەی «ریئالیزم»ی ئەمڕۆیی هەیەتی، رادەکێشێ: رۆمان لە سەردەمی تازەدا سەری هەڵدا، یانی ئەو دەورەیەی کە لایەنگری گشتی فیکری ئەو بە هۆی فڕێدان ـ یان لانی کەم تێکۆشان بۆ فڕێدانی ـ چەمکە گشتییەکان، پێوەندی خۆی دەگەڵ میراتی کلاسیک و سەدەکانی نێوەڕاستدا پساندووە.

هەڵبەت لەوەیدا کە تاک دەتوانێ لە ڕێگەی فامستی[1] هەستەکانەوە «ڕاستی» بناسێتەوە، تەختەی بازدانی ڕیئالیزم لە سەردەمی تازە دایە. ئەم ڕایـە ڕەگ و ڕیشەی لە فەلسەفەی دێکارت و لاک دایە و هەوەڵ کەڕەت لـە ناوەڕاسـتی سەدەی هەژدەدا «تامس ڕید» ئەو شتەی بـە تـەواوەتی دەربـڕی. بەڵـام ئەمـە ڕوونـە کـە ڕاسـتەقینە بـوونی جیهنـانی دەرەکـی یـان ڕاسـتەقینە بـوونی زانیارییەک کە ئێمە لە ڕێی هەستەوە وەگیرمان دەکەوێ یارمەتییەکی وامان لە بۆ ڕوون بوونـەوەی باسـی سـەبارەت بـە ڕیئـالیزم لـە ئەدەبـدا ناداتـێ. بـە گـــوێرەی ئـــەوەی کـــە تەقریبـــەن هـــەموو مرۆیـــەک لـــە ســـەردەمە جۆراوجۆرەکاندا، بە پێی ئەزموونی تایبەتی خۆیانەوە، لە ڕێگەی جیـاوازەوە ناچار بە وەها ئاکامێک گەیشتوون، کە ئەدەب بڕێک لە مەترسی زەبری ئەم سانا بیرکردنەوە مەعریفەت ناسەکییانەدا بووە، هەروەها دەبێ سـەرنج بـدەین کە بەشی گەورەی بنەما دیاریکـەرەکانی مەعریفـەت ناسـەکی ڕیئالیـستی و هەروەها قاڵمە قاڵمێ وا لەم خاڵانە پێک هاتووە، هێندە تایبەتی‌یە کە ناتوانێ کارتێکردنێکی زۆری بە سەر ئەدەبدا هەبێ ئەو شتەی لە ڕیئالیزمی فەلسەفیدا بایەخی بۆ ڕۆمان هەیە، تایبەتمەندییەکی زۆر گشتی تـری هەیـە و ئـەو شـتە زیاتر زاتی گشتی تێفکرینی ڕیئالیـستی و شـێوەکانی تـاوتوو کـردنی ئـەو و هەروەها زۆر گیر و گرفتی دیکە پێکی هێناون.

ڕیئالیزمی فەلسەفی بە گشتی تایبەتمەندییەکی ڕەخنەیی، دژ بە نەریت و تازە داهێنەرانەی هەیە و شێوازەکەی ئەمەیە کە تاکی توێژەر دەبێ زەیـنی خـۆی لە تان و پۆی هەموو گریمانەکانی ڕابردوو و بیر و بڕوا سەلەفییەکانی ڕزگار بکات و سەرقاڵی لێکدانەوەی پاژی ئەزموونەکان بێـت، هـەروەها ئـەم دام و دەزگـا فەلـسەفییە سـەرنجێکی تایبـەت ئەداتـە واتـا ناسـین، یـانی چۆنیـەتی

[1] فامست: ئیدراک، حالیبوون

یەکگرتنەوەی وشەکان لە گەڵ راستەقینەدا. گشتی ئەم تایبەتمەندییانەی جیاکەرەوەی ریئالیزمی فەلسەفی، دەگەڵ تایبەتمەندییەکانی رۆماندا لێکدەچن، یانی ئەو تایبەتمەندییانەی کە سەرنجی ئێمە بەرەو هاودەنگی تایبەتی بەڕاستەقینەی ژیان و ئەدەب کە لە زەمانی دیفۆ و ریچارد سۆنەوە لە ئەدەبی چیرۆکی دا بوونەتە باو، رادەکێشێ.

## ئـ بیچم «گرێ چن»

ئەو شتەی بووە هۆی ئەوەی دیکارت ببێتە فەیلەسووفێکی گەورە، زیاتر لە هەموو شتێ ئەو شێوازە بوو کە ئەو گرتی، لە بەر ئەوەی ئەو هیچ شتێکی بە بێ دەلیل نەدەسەلماند. کتێبەکانی لە ژێر ناوی «گوتار لە شێوازدا» (١٦٣٧) و «تێڕامان» دەورێکی گرینگیان لە هاتنە ئارای ئەم گریمانە تازەیەدا هەبوو کە گەیشتن بە راستینە، شتێکی تەواوەن تاکە کەسییە و تاک لەم رێگەدا دەبێ بە لۆژیک لە نەریتە کۆنەکان دابڕێ و لە راستیدا بزانێ کە مەرجی گەیشتنی ئەو بە راستی، کاتێ زیاتر دەبێ کە خاڵی بەرێ کەوتنەکەشی خودی راستی بێ. رۆمان ئەو چەشنە ئەدەبەیە کە ئەم گۆڕینی لایەنی تەوەرەیی و نوێ هێنەرانەیە لە کامڵترین فۆرمی خۆیدا نیشان دەداتەوە. چەشنەکانی ئەدەبی پێش رۆمان نیشاندەری ئەم راستییە بوون کە بەرهەمی ئەدەبی لە چوارچێوەی فەرهەنگەکاندا دەخولقێن کە بە گشتی راستی لە سەر بناغەی پێملبوون بە شێوازی سەلەفی هەڵدەسەنگێنن. بۆ نموونە بیچمی حەماسە کۆنەکان و سەردەمی رۆنیسانس لە سەر بناغەی مێژووی رابردوو یا ئەوسانە قەدیمەکان بوو و دادوەری سەبارەت بەوەی نووسەر، چەندە ئەو بیچمەی هونەرمەندانە داڕشتووە، بە گشتی لە سەر ئەم پێوانەیە دەکرا کە ئەو تاکوو چ رادەیەک تایبەتمەندییەکانی ئەم چەشنە ئەدەبەی پاراستووە و ئەو تایبەتمەندییانەش بە نۆرە خۆیان لە نموونە پەسندکراوەکانی ئەو چەشنە

ئەدەبە جیا دەبوونەوە. بۆ یەکەمجار رۆمان شەڕێکی تـەواو عـەیاری دەگـەڵ ئەم نەریتەی ئەدەب دامەزراند و پێوانەی گشتیشی ئەمەکدار بوون، سەبارەت بە ئەزموونی تاکە کەسی بوو کە دایم و دەرهەم تایبەتی تاکە، دەیجا نوێ و داهێنەرانەیە و بەم چەشنە رۆمان، بە لۆژیـک ئـامێرێکی ئـەدەبی فەرهەنگییـە کە لەم چەند دەیەی ئەمدواییانەدا بایەخێکی بـێ وێنـەی بـۆ هـەوێنی تـازە و داهیـنانی تازە داناوە و هەر بەم هۆیەوە ناوێکی واتاداری هەیە.
بـڕێ دژواری تونـد کـە زۆر کـەس رایـان وایـە کـە لـە شوناسـی رۆمانـەوە هەڵدەستێ، دەتوانین بە گوێرەی ئەم جەخت کردنە لە سەر تـازەیی داهێنـان بـە باشـی بـزانین. زۆر جـار پێویـستە لـە پـێش داوەری کـردن سـەبارەت بـە بەرهەمێک کە لە چەشنێکی دیکەی ئەدەبدا نووسراوە، دەگەڵ نموونـەکانی ئـەو چەشـنە ئەدەبـەدا دیونـاس بـین. هەڵـسەنگاندنی ئێمـە لـەو بەرهەمـە بـە رادەیەکی زۆر پێوەنـدی بەمـەوە هەیـە کـە بـزانین نووسـەری ئـەو بەرهەمـە چەنـدەی توانیـوە نەریتـەکانی فـۆڕمی و مـەعنایی ئـەو چەشـنە ئەدەبـە لـە بەرهەمەکەی خۆیدا بڕازێنێتەوە. لە لایەکی دیکـەوە، دەبـێ سـەرنج بـدرێتێ کە لاسایی کردنەوەی بەرهەمەکانی دیکەی ئەدەب،بە هەر لەونێک بـێ، بـۆ رۆمان بێ هێزی و لاوازییەکی گەورە دادەندرێ و هۆی ئـەوەش ئاشـکرایە: بە گوێرەی ئەوەی یەکەم مەبەسـتی رۆمـاننووس ئەمەیـە خوێنـەر وایـدادەنێ ئەزموونەکانی ئینسانی بێ کەم و کوڕی بۆ وی دەگوێزرێتەوە، چما نووسەر سـەرنجی خـۆی بـۆ نەریتـەکانی پێکهاتـەی پێـشوو بقۆزێتـەوە، هـەر سـەرکەوتنەکەی دەخاتـە مەترسـییەوە. هـۆی ئـەوەی زۆر جـار وا هەسـت دەکرێ رۆمان لە هەمبەر کردن دەگەڵ تیراژێـدی یـان قەسـیدەدا فـۆڕمێکی تایبـەتی نیـە، بـە گومـان ئەمەیـە: هـەژاری رۆمـان لـە بەسـتێنی نەریتـە رواڵـەتییەکاندا رواڵـەتەن ئـەو نرخەیـە کـە رۆمـان دەبـێ بـۆ ریئالیزمەکەی،

خەرج بکات. بەم حاڵەشەوە لە پلەی هەمبەر کردندا دەتوانین بڵێین فرێدانی بیچمە سەلەفییەکان، گرینگتر لە نەبوونی نەریتی رواڵەتی لە ڕۆمان دایە. هەڵبەت بیچم، باسێکی سانا نیە و کێش کردنی رادەی سەرەکی بوون لە بیچمێکی تایبەتدا هەمیشە دژوارە، هەمبەر کردنێکی گشتی و بە پێویست بیچکۆلانە لە نێوان ڕۆمان و چەشنە ئەدەبەکانی پێش ئەودا، جیاوازییەکی ئەوتۆمان پێ نیشان ئەدات: دیفۆ و ریچارد سۆن یەکەم چیرۆکنووسانی گەورەی ئینگلیزین کە بیچمی بەرهەمەکانیان لە ئوستوورە، مێژوو، ئەوسانە یان ئەدەبی سەردەمەکانی پێشوو هەڵنەگرتۆتەوە.

ئەم خاڵە ئەوان لە کەسانێکی وەکوو جێفری چۆسر (شاعیری ئینگلیزی، ١٤٠٠ـ١٣٤٠) سپنسر (شاعیری ئینگلیزی ١٥٩٩ـ١٥٥٢) شەکسپێر (شاعیر و شانۆنامە نووسی ئینگلیزی)، جان میلتۆن (شاعیری ئینگلیزی ١٦٧٤ـ١٦٠٨) جیا دەکاتەوە، چون ئەوانە وەکی نووسەرانی یۆنان و ڕۆمی کۆن بە پێی نەریت لە بیچمە سەلەفییەکانیان کەڵک وەردەگرت و ئەمانە لە ئاکامدا پێش گریمانەی گشتی سەردەمی خۆیان سەلماندبوو کە دەیوت لە بەر ئەوەی سروشت بە بێ کەم و کووڕییە و ئاڵوگۆڕ ڕێی پێ نابات، پێشینەی مێژوویەکەشی ـ چ بەم چەشنەی لە ئەفسانە و کتێبە پیرۆزەکاندا هاتووە و چ بەو چەشنەی لە مێژووی نووسراوەدا تۆمار کراوە ـ یەکێ لە ئەزموونە پەسندەکانی تۆشەبەرەی ئینسانە. ئەم ڕوانگەیە تاکوو سەدەی نۆزدە هەر وا بەردەوام بوو. بۆ وێنە نەیارانی بەڵزاک بە بۆنەی ئەم رایەی ئەوەوە، گاڵتەیان بە هۆکاری سەرنجدانی لە رادەبەدەری ئەو بۆ ڕاستەقینەی زەمانە دەکرد ـ کە بە بڕوای ئەوان لە عەینی حاڵدا لە پاش دەورەی ڕۆنیسانس خوازیارییەکی ڕوو لە زیاد بوون بەرەو جێگیر کردنی ئەزموونی تاکە کەسی لەجیاتی نەریتی گشتی لە جێگەی دوایین پێوانەی ڕاستەقینە پێکهات

و وا دەنوێنێ کە ئەم دەورەی لە تێپەڕبوونە بەشێکی گەورە لـەپاش بەستێنی فەرهەنگی سەرهەڵدانی رۆمانە.
خاڵی گرینگ ئەوەیە کە مەیل کردن بەرەو نوێ و ئۆریژیناڵ بـۆ یەکـەمجار بە شکلێکی هەرە بە هێز و توانا لە ئینگلیزی سەدەی هەژدەدا پەرەی سەند و تەنانەت چەمکی «ئۆریژیناڵ» هەر لەم زەمانەدا گـۆڕدرا و ئـەو وشـەیە واتـای تازەی گرتـە خـۆی. لـە مەوبـەر دیتمـان چونکـە لـە سـەدەکانی ناوەڕاسـتدا بڕوایان بە «راستی»ی گشتییەکان بوو، ریئالیزمیش بە واتای باوەڕ بە ئیمکـانی وەرگرتنی راستەقینە لە رێگەی ناسـینی هەسـتەوە بـوو. بـەم چەشـنە زاراوەی «ئۆریژیناڵ»یش کە لە سەدەکانی نێوەڕاستدا بە واتای «لە سەرەتاوە خـاوەنی هەبوون» بوو، دەکار دەکرا، مانای «وەرنەگیراو، سەربەخۆ و خالیسی» گـرت و لەو کاتەوە ئیدوارد یۆنگ لە کتـێبی سەردەمـسازی خۆیـدا بـە نـاوی «بـیر کردنەوە سەبارەت بە نووسـینی ئۆریژینـاڵ» لـە ١٧٥٩دا لـە وەسـفی ریچـارد سـۆندا ئـەوی «چ لـە بـاری ئاکـاری و چ لـە بـاری ئۆریژینـاڵ بوونـەوە، نابیغەیەک» نێو نا، ئەم وشەیە وەکی زاراوەیەکی جێی رێز بە واتای «تـازە یـا دەست لێنەدراو لە تایبەتمەندی یان شێواز»دا دەکار دەکرا.
کەڵـک وەرگـرتن لـە بیچمـە غـەیری سـەلەفییەکان لـە رۆمانـدا یـەکێ لـە درەوشاوەیی‌یەکانی سەرەتایی و رەنگبێ جیـاوازی ئـەم جـەخت کردنـە لـە سەر تازەهەوێنی بووە. بۆ نموونە، دیفۆ لە سـەرەتای کـاری چیرۆکنووسـیدا سەرنجێکی زۆری نەئەدایـە روانگـەی رەخنـەیی بـاوی ئـەو سـەردەمە ـ کـە هێشتاش خوازیاری کەڵک وەرگرتن لە بیچمە سەلەفییەکان بوون، کەچی بە پێچەوانـە لێدەگـەڕا هـەتا چیرۆکـەکانی رەوتی سروشـتی خۆیـان هـەبێ و کەسێتییە سەرەکییەکانی هەر بەو چەشنەی کـە بـە رای ئـەو ماقووڵـانە بـوو،

هەڵس و کەوت بکەن. دیفۆ بەم کارەی خۆی داهێنەری لقێکی نوێ و گرینگ بووە لە ئەدەبی چیرۆکدا.

ئەو بیچمی بە تەواوی کردە پێملی فۆڕمی بیرەوەری ژیاننامەی تایبەتی و ئەم کارەشی، لە رۆماندا حوکمی راگەیاندنی بوێرانەی سەرەکی بوونی ئەزموونی تاکە کەسی هەبوو، راست وەکوو «فیکر دەکەمەوە، دەیجا هەم»ی دیکارت لە فەلسەفەدا کە هەر ئەم حوکمەی هەبوو.

لە پاش دیفۆ، ریچارد سۆن و فیلدینگ هەر کامیان بە شێوازی تایبەتی خۆیان درێژەیان دا بە کەڵک وەرگرتن لە بیچمە غەیری سەلەفییە تازە داهێنراوەکان یا هەتا رادەیەک لە سەر رووداوەکانی سەردەمی خۆیان و ئەم کارە لە پاشتردا بووە خاڵی سەرەکی رۆماننووسین. هەڵبەت ناتوانین بڵێین ریچارد سۆن یا فیلدینگ بە تەواوی توانییان سەرکەون و دەستیان بگاتە ئەو هاو پێوەندییە دەروونییەی یبچم و کەسێتی ئەو مەزموونە ئاکارییەی ئاکامی ئەو کە لە سەرکەوتووترین و بەرزترین نموونەکانی رۆماندا دەبیندرێ، بەڵام دەبێ لە یادمان بێ کە گەیشتن بە مەبەستێکی ئاوا سانا نەبوو، بە تایبەت لە سەردەمێکدا کە تێفکرینی داهێنەرانە تاقە رێگەی ئەدەبی تایبەتی لە هەمبەر خۆیدا بوو، ناچار دەبایە بە بیچمێکی کە ئیدی تازە نەبوو، فۆڕمێکی تاکە کەسی وەرگرێ و بایەخی ئەو لە سەردەمی خۆیدا نیشان بدات.

## ب ـ وەسفی ریئالیزمی

بێج لە بیچم، زۆر گۆڕانکاری دیکەش دەبایە لە نەریتی ئەدەبی چیرۆکنووسیندا پێکبێ هەتا بە هەمان سانایی کە شێوازی دیکارت و لاک بوونە هۆی گەشەی تێفکرینی ئەوان لە راستینەکانی راستە و خۆی هزر و فام، رۆمانیش دەبایە نیشاندەری فامست «ئیدراک»ی تاکە کەسی لە راستی

بێ. لە پێش هەموو شتێکدا، کەسانی بەرێوەبەری بیچم و شوێنی رووداني کردەوەکانیان دەبایە بە روانینێکی ئەدەبی تازەوە دیاری بکرێ: بە پێچەوانەی رابردوو کە باو بوو و تیپە هەڵکەوتەکانی خەڵک لە پاش بەستێنێکدا کە بە گشتی لە سەر بناغەری نەریتەکانی ئەو ئەدەبە دابین دەکرا رووداوەکانی بیچمەکە جێبەجێ بکەن، دەبایە کەسانێکی تایبەت لە بارودۆخی تایبەتدا وایان کردبایە.

ئەم ئاڵوگۆڕە لە ئەدەبدا وەک رەفز کردنەوەی شتە گشتییەکان دەچوو و جەختی لە سەر پاژەکان دەکرد کە تایبەتمەندی بەرچاوی ریئالیزم لە فەلسەفە دان. بگرە ئەرەستوو لە گەڵ گریمانەی بناغەیی لاک هاوڕا بوو کە ئیدراکی هەستەکانی مرۆڤ «لە پێشدا رێگە بۆ هاتنی بیرۆکە تایبەتەکان خۆش دەکات و کەلوپەلی چۆڵگە خانەی زەین» دابین دەکا. بەڵام ئەو جەختی دەکرد و درێژەی ئەدایە کە وردبینین لە کاری تایبەتدا لە خۆڕا بایەخێکی زۆری نیە؛ ئینسان دەبێ بە تەواوی توانای خۆیەوە بە عەقڵەوە لە بەرابەری هەڵچوونی بێ واتای ئیدراکی هەستدا راوەستێ و بگاتە ناسینێک لە گشتییەکان کە تاقە راستەقینەی ئاکام و بێ ئاڵوگۆڕن هەتاکوو سەدەی حەڤدە، هەر ئەم جەخت کردنە گشتییە بە سەر تێفکرینەکانی رۆژاوادا وەها وێکچوونێکی ناوەرۆکی بە هێزی دەدایە، کە هەموو جیاوازییە جۆراوجۆرەکان و زۆرینەکانی ئەوانی کەم بایەخ نیشان دەدا. هەر بەم پێیە لە ساڵی ١٧١٣ دا کە «فیلۆناوس بێرکلەی» پێی لێنا کە «ئەمە یاسایەکی تەواو دونیاییە کە هەر شتێکی وا هەبوونی هەیە، تایبەتە» وتەی ئەو بە پێچەوانەی خوازیاری سەردەمی تازە بوو کە بە نۆرەی خۆی یەکێتییەکی تایبەت دەداتە روانین و شێواری تێفکرینی نوێ لە پاش دیکارتدا.

تەماشا دەکەین لێرەشدا، هەم لقە نوێیەکانی فەلسەفە و هەم تایبەتمەندییەکانی ڕواڵەتی سەبارەت بە ڕۆمان، لە گەڵ تێڕوانینی ئاسایی ئەو سەردەمەدا سەبارەت بە ڕۆمان دژایەتییان هەبوو. لە بەر ئەوەی گەرایشی لەمێژینەی بەرزدانانی شتە گشتییەکان ، هێشتاش نەریتی ڕەخنەیی سەرەتاکانی سەدەی هەژدەی دەسەڵاتدارانە لە ژێر کار تێکردنی خۆیدا ڕاگرتبوو. ئەم بەررزبوونەبە تایبەت لە گەرایشی نوێ ئەفلاتوونییەکاندا کە لە کۆنەوە لە چیرۆکەکانی حەماسی ـ ئەویندارانەڕا بەهێز بو و بە گشتی لە ڕەخنەی ئەدەب و جوانی ناسیدا بایەخێکی ڕوو لە زێدەبوونی بوو، بەرچاو دەکەوت. بۆ نموونە شافتسبێری (پیاوی سیاسی ئینگلیزی ١٦٨٣ـ١٦٢١) لە کتێبی خۆیدا لە ژێر ناوی «*نامیلکەیەک سەبارەت بە ئازاد بوونی سروشتی هونەری تەنز*» کە لە ١٧٠٩دا بڵاو بۆوە، خۆ دوور خستنەوەی ئەم قوتابخانە فیکرییە لەوەی کە ئەدەب سەرقاڵی وردە شتان و پاژەکان بێ، بە پێداگرتنی زۆرەوە ئاوا باس دەکات: «جۆراوجۆری سروشت وەهایە کە هەر شتێک پێکدێنێ، بە تایبەتمەندییەکی تازە هەوێنی و ئۆریژیناڵی تایبەتەوە جیای دەکاتەوە کە لە هەرە پێداگرتنی دۆخی خۆیدا دەبێتە هۆی ئەوەی ئەو شتە جیاواز بێ لە گەڵ ئەو شتانەدا وا لە جیهانی دەوروبەریدا هەن. ئاوا دێتە بەر نەزەر. بەڵام شاعیران و شێوەکارانی باش، سەخت تێدەکۆشن هەتا لە دیاردەیەکی ئاوا لە بەرهەمەکانیاندا دووری بکەن. ئەوان لە پاژایەتی بێزارن و لە یەکەبوون دەترسێن» لە درێژەدا دەڵێ: «ئەو شێوەکارەی وا هەر ڕوخسار دەکێشێتەوە، لە ڕاستیدا چەندان خاڵی هاوبەشی لە گەڵ شاعیردا نیە، بەڵکوو وەکی ئەو کەسەی هەر مێژوو دەنووسێ ئەو شتەی دەیدینێ عەینەن ڕەسمی دەکا و هەر تەرکیب بوون و نیشانەکانی نائاسایی بە وردی

ڕەسم دەکات». بە خاتر جەمییەوە بەو ئاکامە دەگات: «حاڵ و ڕۆژی ئەو کەسانەی سەرقاڵی داهێنانی تازە و بیچم داڕشتنن، جۆراوجۆر و جیاوازە.»
بەم حاڵەشەوە بە پێچەوانەی ڕەهابوونی لە بەردڵانی ڕای شافتسبێری، زۆری نەخایاند کە بە گشتی لە ئاکامی دەکار کردنی ڕێدۆزینەوەی دەروون ناسەکی «هابزولاک» لە کێشە ئەدەبییەکاندا، گەرایشێکی جوانی ناسەکی دژ بەمە و بە لایەنگری لە سەرقاڵبوون بە پاژەکانەوە، دەستی کردە گەشە کردن. ڕەنگبێ بتوانین بڵێین لۆرد کەیمز (فەیلەسووف و مافزانی سکاتلەندی، ١٧٨٢ــ ١٦٩٦) توند و تیژترین ناسێنەری سەرەتای ئەو خوازیارییە بوو. ئەو لە کتێبەکەی خۆیدا «*ئەستوونەکانی ڕەخنە*» لە ساڵی ١٧٦٢دا دەربڕی: ئەو زاراوە دابڕاو یا گشتییانە لە هیچ نووسراوەیەکدا کار تێکردنێکی باشی بۆ ڕاکێشانی خوێنەر نابێ، چونکە هەر لە شتە تایبەتەکان دەتوانین بیچم و ڕواڵەتێ لە خەیاڵماندا پەروەردە بکەین.» کەیمز هەروەها دەیخوازی کە بە پێچەوانەی ڕای گشتی، لە بەر دڵان بوونی بەرهەمەکانی شەکسپێر لەو شتە ڕایە کە «دێڕ بە دێڕ و کۆپلە بە کۆپلەی وەسفەکانی، ڕاست وەکی سروشت، هەبوونێکی تایبەتییان هەیە.»
لەم خاڵەشدا ڕاست چەشنی ئۆریژیناڵ بوونی ڕۆمان، دیفۆ و ریچارد سۆن بوون کە لایەنگری ئەدەبی تایبەتی ڕۆمانیان بە گوێرەی چەشنێکی ئەدەبی قورس و قایم کرد و ئەمەش کاتێکی زۆر بەر لەوەوە بوو کە ڕۆمان لە سەر تیۆری ڕەخنە سەقامگیر بێ. بیرۆکەی کەیمز سەبارەت بە تایبەتی بوونی وەسف لە *رابینسۆن کرۆزۆ* (ڕۆمانی دانییل دیفۆ) و *پەمێلا*دا هەمیشە یەکێ لە تایبەتمەندییەکانی شێوازی گێڕانەوەی ئەم دوو ڕۆمانە لە قەڵەم دراوە. لە ڕاستیدا ئەو هەوەڵ کەسەی ژیاننامەی ریچارد سۆنی نووسی یانی خاتوو ئانابار بۆڵد (نووسەری ئینگلیزی، ١٨٢٥ــ١٧٤٣) بلیمەت بوونی ئەوی بە

لێکدانەوەیەک وەسف کرد کە دایمە لە قاڵمە قاڵمی نێوان گشتخوازی نوێ ـ کلاسیک و تایبەتخوازی ریئالیستیدا وەبەر چاو کەوتووە. بۆ نموونە، جا شواڕێنۆڵدز (شێوەکاری ئینگلیزی، ١٧٩٢ـ١٧٢٣) «کۆنە ئایینی»ی نوێ ـ کلاسیکی خۆی ئاوا دەردەبڕێ: «بۆچوونە گشتی و مەزنەکانی شێوەکاری ئیتالی بە سەر [راستینەی وەکی راستەقینە و . . . «سەرنجدانی وردبینانەی» قوتابخانەی هولەند لە پاژەکانی سروشتدا] کە بە پێی هەڵکەوت نەرم دەبێتەوە، هەڵدەبژێرێ.»

لە دوخێکدا ـ هەروەکوو لە پێشتردا ئاماژەی بۆ کرا ـ ریئالیستە فەڕەنسییەکان زیاتر وابەستەی «راستەقینەی ئینسان»ی رامبراند (شێوەکاری هولەندی)بوون هەتاکوو «خەیاڵاتخوازی شیعر ئاسای» قوتابخانەی کلاسیک. خاتوو باربۆڵد بە نووسینی ئەم خاڵە کە ریچارد سۆن، وردبینین و سەرنجدانی قوتابخانەی شێوەکاری هولەندی لە دوایین دەورەی کارەکەیدا هەبوو . . . کە دەیهەویست مەراقی سەرقاڵبوون بە پاژەکانەوە بە سەر خۆیدا داسەپێنێ هەتاکوو کارتێکردنێک (لە بینەردا) بەدی بکا» ئەمە پلەوپایەی ئەو لەم گێڕە و کێشەیەدا روون دەکاتەوە. لە راستیدا ریچارد سۆن و دیفۆ هەردووکیان لەوەی کە شافتێسبێری دایشکاندوونەتەوە بێ دەربەست بوون و دەیانهەویست وەکی رامبراند «تەنها روخسارپەرداز و مێژوونووس بن.»

چەمکی داڕشتنی ریالیزمی پاژەکان لە بەرهەمە ئەدەبییەکاندا، بڕێک گشتی تر لەوەیە کە بتوانین بە چەشنێکی تایبەت بیسەلمێنین. سەلماندنی ئەم کارە لە سەرەتاوە پێویستی بە لێکدانەوەی پێوەندی داڕشتنی ریئالیستی پاژەکان دەگەڵ برێ لایەنی تایبەت بە تەکنیکی گێڕانەوەی چیرۆکەوە هەیە. وا دێتە بەر نەزەر دوو لایەن لەم لایەنانە لە رۆماندا بایەخیکی تایبەتیان هەیە: داڕشتنی کەسێتی و نواندنی پاش بەستێن. ئەو سەرنجدانەی کە بە ئاسایی لە

رۆماندا بۆ بەخشینی یەکەبوون بە کەسێتی و هەر وەها وەسفی بەربڵاوی شوێنەکان دەکرێ، دەبێتە هۆی جیاوازی رەهای رۆمان لە چەشنەکانی دیکەی ئەدەب و هەروەها چەشنەکانی دیکەی پێشووتری ئەدەبی چیرۆکی.

## ج - کەسێتی

لە روانگەی فەلسەفەییەوە، خۆ لە قەرە دانی تایبەتخوازانە بۆ کەسێتی، تایبەت کردنی یەکەبوونی کەسێتی‌یە. لە پاش ئەوەی دیکارت ئەوپەڕی بایەخی دانا بۆ پرۆسەکانی تێفکرین لە خودئاگای تاکدا، بە لەونێکی سروشتی کێشە فەلسەفییەکانی شوناسی تاکیش زۆر کەوتە بەر سەرنجدانەوە. بۆ نموونە: **لاک، ئۆسقۆف باتلێر** (خواناسی ئینگلیزی، ١٧٥٢-١٦٩٢ )، بێرکلەی، هیوم و رید لە ئینگلیزدا سەرقاڵی گوتاری سەبارەت بەم جۆرە کێشانەوە بوون، هەتاکوو ئەم قاڵمە قاڵمە گەیشتە لاپەڕەکانی رۆژنامەی «*سپیکتاتۆر*»یش.

لێکچوونی نەریتی تێفکرینی ریئالیستی و تازە داهێنانی رواڵەتی لە رۆماننووسانی پێشقەڕاوڵدا روونە. هەم فەیلەسووفان و هەم رۆماننووسان زۆر زیاتر لەوەی هەتا ئەو زەمانە باو بوو سەرنجیان دایە یەکەبوونی کەسایەتی تاک. هەڵبەت سەرنجی زۆری رۆمان نوسان بۆ تایبەت کردنەوەی کەسێتیی‌یەکان، لە خودی خۆیدا وەها بابەتێکی بەربڵاوە کە ئێمە لێرەدا هەر یەکێ لە لایەنەکانی ئەو کە زیاتر دەتوانین لێکدەینەوە، لێکیدەدەینەوە. بە گوێرەی ئەوەی کەسێ لە ژیانی راستەقینەدا ناوێکی تایبەتی هەیە، رۆماننووسەکانیش وێڕای نێودانان بۆ کەسێتی‌یەکان تێکۆشانی تایبەت بۆ نیشان دانی ئەوانیان هەیە.

کێشەی شوناسی تـاک، بـە لۆژیـک پێوەندییـەکی پڕاوپـڕی دە گـەڵ پلـە و پایەی مەعریفە ناسەکی ناوە تایبەتییەکاندا هەیە، چونکـە هـابز وتـەنی: «نـاوە تایبەتەکان تاقە شتێک بە زەیندا دێنن، بەڵام گـشتییەکان شـتگەلێکی زۆر بـە زەینـدا دێننـەوە.» لـە ژیـانی کۆمەڵـایەتیدا، نـاوە تایبەتـەکان بـە وردی ئـەو دەورەیان هەیە، یانی دیمەنە کەلامییەکانی شوناسی تایبەتی تاکەکانن. بەڵـام ئـەم دەورەی نـاوە تایبەتـەکان لـە ئەدەبـدا، بـۆ یەکـەمجار لـە رۆمانـدا جـێ کەوت. هەڵبەت کەسایەتییەکان لـە چەشـنەکانی ئـەدەبی بـەر لـە رۆمانیـشدا ناوی تایبەتیان هەبوو، بەڵام لە راستیدا ئەو ناوانە گێـڕەوەری ئـەوە بـوون کـە نووسەر بە پێ و شوێنی ئەمەوە نیە تا کەسێتی‌یـەکان وەکـی بوونـەوەرانێکی تەواوەن خاوەن یەکەتی نیشان بـدات. نووسـەران پێیـان خـۆش بـوو بـە پێـی شـێوازی بـاوی ئـەدەبی کلاسـیک و سـەردەمی رێنیـسانس، بـۆ کەسـێتی بەرهەمەکانیان نێوی مێژوویی یـان تیپیکـاڵ «ئـەو نێـوەی بـە تیپیـان بخـوات» هەڵبژێرن و ئەم کارە لە گەڵ یاسای رەخنەی ئەو سەردەمە هاودەنگی بوو.

کەڵک وەرگرتن لە ناوە مێژوویی یـا تیپیکاڵـییەکـان دەبـووە هـۆی ئـەوەی کەسێتی‌یەکان ببنە شیاوی چاوەنواڕییەکی زۆر کە ئەمە بە گشتی لە ئـەدەبی رابـردووڕا هەڵدەسـتا نـەک لـە نێـوەرۆکی ژیـانی سـەردەمەوە. ئەرەسـتوو دەیـوت: «تەنانـەت لـە بەزمەساتیـشدا کەسـێتییەکـان لـە مێـژووی رابـردوو هەڵنابژێردرێن، بەڵکوو خولقاوی زەیـنی کومێـدی نووسـانن» وا دادەنـدرێ نـاوی کەسـێتییەکـان «تایبەتمەنـدی نـوێن» بـن، هـەر ئـەم بۆچوونـە لـەپاش سەرهەڵدانی رۆمانیش تا بەینێکی زۆر هەر باس دەکرا.

لە چیرۆکە پەخشانییەکانی رابردووشدا زیاتر لە نـاوە تایبـەت نوێنـەکان یـان ئەو ناوانەی کە بە چەشنێکی دیکە غەیری ریئالیـستی بـوون و دەلالـەتیان بـۆ تاکێکی تایبەت نەدەکرد، کەڵک وەردەگیرا. ئەم ناوانە یـا ئاوەڵـناوگەلێکی

تایبـەتیان زەق دەکـردەوە «وەکـوو ئـەو ناوانـەی ریبلـی (١٥٥٤ــ ١٤٩٤، رۆماننووسی فەڕەنسی)، سیدنی (١٥٨٦ــ ١٥٥٤ پەخشاننووسی ئینگلیزی)، بانـاین (نەزیلـە نووسـی ئینگلیـزی، ١٦٨٨ــ ١٦٢٨) کـە لـە بەرهەمەکانیانـدا دەکاریــان دەکــرد» یــان هەڵــگری چەمکگــەلی نێــوەرۆکی لاوەکــی و هەڵوەشاوە و چەشنێ ئەدەب بوون کە هەر جۆرە دەلالەتێکی بۆ «راستی»ی ژیانی ئەو سەردەمە دەسڕیەوە «وەکوو ئەو ناوانەی لە بەرهەمـەکانی لی لی، ئافرابن، یا خاتوو مـانلی دا هـەن» ئـەم شـتە وا کەسـایەتی ئـەم چیرۆکانـە بـە پێچەوانەی ئەو مرۆیانەی لە ژیانی رۆژانەدا دەیانبینن، خاوەنی نـاوی چکۆلـە و ناوی بنەماڵـەیی نـەبوون، بەڵـکوو هـەر یـەکێ لـەم دوانـەیان بـوو «وەک ئاغەی بەدمەن، یان یۆفیـۆئیز» هۆیـەکی دیکەیـە بـۆ لایـەنگرێتی ئەدەبیانـە و باوی ئەم ناوە تایبەتانە.

بەڵام رۆماننووسانی پێشقەدەم بە چەشنێکی زۆر بەرچاو لـەم نەریتـە دابـڕان و لە بۆ کەسایەتییەکانی رۆمانەکانیان ناوگـەلێکیان هەڵـبژارد کـە نیـشانی ئـەدا دەبێ ئەوانە کەسانێکی تایبەت لە هەمان شـوێنی کۆمەڵـایەتی ئـەو سـەردەمە بن. دیفـۆ جاروبـار لـە نـاوی تایبـەت کەڵـکی وەردەگـرت و بـڕێ کـاتیش ناوگەلی دژوازی دادەنا، بەڵام زۆر کەم وا بوو لەو ناوە باوانە یا خەیاڵـی‌یانـە بۆ کەسایەتییەکانی دابنێ.

رەنگبــێ تــەنیا هەڵــواردە رێکــسانایە کــە نێــوێکی خــوازراوە و تــەواوەن وەسفکراوە. هەروەها زۆربەی کەسـایەتییە سـەرەکییەکانی رۆمانـەکانی ئـەو وەکوو رابینسۆن کۆرۆزۆئێ یا ماڵ فلاندر نێوهایەکی تەواو راسـتەقینەن یـان نێوگەلێکی بێج لە لە نێوی راستی خۆیان هەیە.

ریچارد سۆنیش هەر درێژەی بەم رەوتە دا، بەم جیاوازییەوە کە سـەرنجێکی زۆری ئەدایە و بـۆ هـەموو کەسـێتییە سـەرەکییەکان و تەنانـەت بـۆ زۆربـەی

کەسێتییە لاوەکییەکانی رۆمانەکانی، هەم ناوی چکۆلەی هەڵدەبژارد و هەم ناوی بنەماڵەیی. ئەو هەر وەها بە دژوارییەکی ییچکۆلە و بەڵام نەک کەمبایەخەوە، لە رۆمان نووسیندا گیری کرد، ئەویش بریتی بوو لە دەکار کردنی نێوهایەک کە بە چەشنێکی پسپۆڕانە شیاو و دەلالەتگر بن، بەڵام لە عەینی حاڵدا وەکوو ناوە راستەقینە ئاساییەکانن. بەم هۆکارەوە مانای ناوێکی وەکوو پامێلای کە زیاتر لە چیرۆکە جەنگی ـ ئەویندارانەکان دەکاڵێتەوە بە نێوی بنەماڵەیی ئاندرۆزەوە دەبەستێتەوە. هەم نێوی «**کولاریسا هارلوو**» و هەم نێوی «**رابێرت لاوێلاس**» لە زۆر لایەنەوە لەوان دەکاڵێتەوە و لە راستیدا دەتوانرێ بوترێ تەقریبەن تەواوی ئەو ناوە تایبەتانەی کە ریچارد سۆن دەکاری کردوون، هەر لە «**خاتوو سینکلێر**»ەوە هەتا «**جەنابی چارڵز گرێندیسن**» مەعنادار و لە عەینی حاڵدا دەگەڵ خوو و خدەی خاوەن ئەو ناوانەدا هاودەنگییان هەیە.

فیلدینگ هەروەکوو یەکێ لە رەخنەگرە نەناسراوەکانی هاوسەردەمی خۆی هێما دەکات، بۆ کەسێتی رۆمانەکانی لە «ناوگەلی سەیر و سەمەرەی پڕ هەراوزەنا کەڵکی وەرنەدەگرت، بەڵکوو نێوهایەکی هەڵدەبژارد کە باوەکوو جاروبارە ئاماژەیەک بۆ کەسایەتی بەرمەبەست بوون، بەڵام هێماکەیان تازەتر بووە» باوەکوو دەتوانین بیسەلمێنین کە نێوی کەسێک هارت فێری یا یۆل وێردی یا سکۆئێر بێت، بەڵام ئەم چەشنە ناوانە حەتمەن روخسارە تازە بووەکانی نێوە تیپیکاڵییەکانن. تەنانەت ناوەکانی وستێڕن و تام جۆنزیش زۆر دەلالەت بۆ ئەوە دەکەن کە فیلدینگ ئەوەندەی سەرنجی ئەدایە تیپی گشتی ئەوەندەشی سەرنج ئەدایە تیپی تایبەت.

هەڵبەت ئەم خاڵە دژاتییەکی دەگەڵ باسەکەی ئێمەدا نیە، چونکە حەتمەن سەبارەت بەم بابەتە یەکێتییەکی گشتی هەیە کە نەریتی فیلدینگ لە ناو

لێنـانی کەسـێتییەکانی و لـە راسـتیدا تـەواوی رێبـازی ئـەو لـە رەسمکـردنی کەسایەتییەکاندا، جیاواز بوو لە گەڵ شێوازی باو لە رۆمانـدا. مەبەسـتی ئێمـە ئەمەیە ـ هەروەکوو سەبارەت بە ریچارد سۆن دیتمـان ـ لەرۆمانـدا شـوێنێک بۆ ئەوەی نێوهایەک شیاوی کەسێتییەکان بێ لە ئارادا نیە، بەڵکوو سـەبارەت بەوەی کەسێتی مەبەستی ئێمە دەبێ کەسێکی تایبەت بێ، نەک تیپیکاڵ، ئەم شیاو بوونی ناوە نابێ وەها بێ کـە زەبرێـک لـە کەسـێتی دەوری سـەرەکی بدات.

لە راستیدا لەوە دەچێ کاتێک فیلدینگ دوایین رۆمانی خـۆی ـ *ئێمیلیا* ـ ی دەنووسـی، ئاگـەداری ئـەم بابەتـە ببـوو. لـەم رۆمانـەدا تامـەزرۆیی نـوێ ـ کلاسـیکی ئـەو بـۆ کەڵـک وەرگـرتن لـە نێـوە تیپیکاڵـەکان هـەر لـەناوی کەسێتییە لاوەکییەکانەوە وەکوو قازی «تێرشڕو» نـایبی کەڵـانتەری بانـدۆمدا دەرکـەوتووە و هـەموو کەسـایەتییە سـەرەکییەکان وەکـوو بنەماڵـەی بـۆت، کیژۆڵــە مــاتیووز، دوکتــۆر هەریــسۆن، ســەرهەنگ جــەیمز، گوروبــان ئاتکینسۆن، سەروان ترێنت و خـاتوو بنیـت، نـاوی ئاسـایی و هاوسـەردەمیان هەیـە. لـە راسـتیدا بـە پێـی بـڕێ بەڵـگە فیلـدینگ یـش وەکـوو تاقمـێ لـە رۆماننووسەکان، ئـەم ناونانـەی تەقریبـەن هـەر بـە هەڵـکەوت لـە پێرسـتێکی دەچاپـدراو لــە کەسـانی هاوسـەردەمی خۆیـەوە گرتۆتـەوە: کـۆی نـاوە بنەماڵەیەکانی نـاوبراو لـە پێرسـتی ئابوونمانـەکانی چـاپی قـەوارە گـەورەی کتـێبی «*گیلبێـرت بێرنیـت*»دا لـە ژێـر سـەردێڕی «*مێـژووی زەمانـەی خـۆی*» بڵاوکراوەی ١٧٢٤ بـەرچاو دەکـەوێ و ئەمـە هـەمان چاپێکـە وا لـە قـەراری مەعلووم فیلدینگ یش بوویەتی.

بێج لەوەی وا بووە یان نـا، گومـان لـەوەدا نیـە کـە فیلـدینگ لـە بەرانبـەری نەریتی کەڵک وەرگرتن لە ناوە ئاساییەکانی سـەردەم کـە دیفـۆ و ریچـارد

سۆن بناغە دانەری بوون، نەرمبوونێکی زۆر و زیادی لە خۆی پیشان دا. باوەکوو لە داهاتوودا تاقمێ لە رۆماننووسانی سەدەی هەژدە وەکوو سمالیت و ستێرن، گوێ لە مستی ئەم نەریتەیان نەکرد، بەڵام وێڕای تێپەڕبوونی زەمان ئەم نەریتە بووە بەشێک لە نەریتەکانی رۆمان و هەروەکوو هێنری جەیمز لە باسێکدا سەبارەت بە قەشە ترالێپ، یانی ئاغەی کۆئیۆر فووڵدا ئاماژە دەکا، ئەو نرخەی کە رۆماننووس بۆ دابڕان لە نەریت دەبێ خەرجی کا، ئەمەیە کە ئیدی خوێنەر بڕوا ناکا کەسایەتی بەرمەبەستی ئەو لە راستیدا هەبووە.

د ـ زەمان:

جان لاک وتبووی: «شوناسی تاک بریتییە لە شوناسی جێگر ناوێکی هوشیار کە لە رێگەی بەردەوامبوون لە زەماندا گەڕیانی هەیە، بە زبانێکی دیکە، ئینسان بە سۆنگەی ئەو بیرەوەرییانەوە کە لە بیرۆکە و کردەوەکانی رابردووی خۆی هەیەتی، دەگەڵ شوناسی بەردەوامی خۆیدا پێوەندی دەبێ.»

دەیوید هیۆمیش پلەوپایەی سەرهەڵدانی شوناسی تاکی لە کۆی بیرەوەرییەکانی ئەودا دەدیت و دەڵێ: «چما بیرەوەرییەکمان نەبایە، هیچ کاتێ هیچ چەشنە خەیاڵێکمان لە هۆکار «علیت» نەدەبوو لە ئاکامدا خەیاڵێکیشمان لە زنجیرەی «علت و معلول» کە سروشت یا زاتی ئێمە پێکدێنن نەدەبوو.» روانگەیەکی ئاوا لە تایبەتمەندی رۆمانە.

لێکۆڵینەوە لە کەسێتی ئینسان، بەو جۆرەی کە لە رەخنە کردنی هەمبەر بوونی خودئاگای (هوشیاری) رابردوو و ئێستایدا پێ نیشان دەدرێ،بابەتێکە کە زۆربەی رۆماننووسەکان، لە ستێرنەوە هەتا پرۆست سەرقاڵی ئەم کارە بوون.

له «ڕێ دۆزینەوە»یەکی دیکەدا بۆ باسکردنی وەسفی تاکبوونی شتەکان کە پێوەندی هەیە و بەڵام دەرەکی ترە، زەمان بە وتەزایەکی سروشتی (زاتی) دادەندرێ: «ئەسڵی تاکبوون»ێ کە **لاک** بیروبڕوای پێی هەبوو، بریتی بوو له هەبوون لە پێ و شوێنێکی تایبەت لە شوێن و کاتدا. هەروەکوو ئەو ئەنووسێ: «بە گوێرەی ئەوەی چەمکەکان بە جیابوونەوە لە زەرفی زەمان و مەکان،دەبنە گشتی» هەروەها چەمکەکان تاقە کاتێ دەبنە تایبەت کە هەردووکی ئەم ئاوەڵکردارانە «زەمان و مەکان» جەختیان لە سەر بکردرێ، بەم چەشنە کەسێتییەکانی رۆمانیش هەر ئەو کاتە تاکبوون دەگرنە خۆ کە له «پاش بەستێنێک» له زەمان و مەکانی تایبەتدا جێگر بن.

هەم فەلسەفە و هەم ئەدەبی یۆنان و رۆمی کۆن ئەم رایەی ئە**فلاتۆون** زۆر قووڵ کارتێکردنی بە سەریاندا هەبووە کە رواڵەتەکان و قاڵبەکان (**صُوَر و مُثُل**) ئەوپەڕی راستەقینەکانن و لە پشت شتەکانی هەست پێ کراوی جیهانی فانیدان. ئەم رواڵەتانە (**صُور**) بێ سەرەتا و هەتاهەتایی و بێ ئاڵوگۆڕ لەبەرچاو دەگیران و وەلحاسڵ نیشاندەری پێش گریمانەی سەرەکی شارستانیەتی یۆنان و رۆمی کۆن بوون کە بە گوێرەی ئەو، هەر ئەو شتەی کە واتای سەرەتاییەکەی لە پرۆسەی زەماندا سەربەخۆ بێ، پێکدێت یان دەتوانێ پێکبێ، ئەم پێش گریمانەیە بە نواڕینێکەوە کە لە پاش سەردەمی رێنیسانس پێکهات و بە گوێرەی ئەو شتە، زەمان نەک هەر رەهەندێ لە جیهانی ماددی، بەڵکوو هێزی لە قاڵبدانی مێژووی تاکە کەسی و کۆمەڵایەتی ئینسانە، بە گشتی دژایەتی هەیە. رۆمان زیاتر له هەموو شتێ بە هۆکاری چلۆنایەتی نیشاندانەوەی ئەم **لا**یەنگرییە تایبەت نوێنەی تێفکرینی هاوسەردەمەوە، تایبەتمەندییەکانی فەرهەنگی رۆژئاوا لە باشترین دۆخدا نیشان ئەدا.

بە بڕوای م ـ فۆرستەر زۆر لە مێژەوە ئەدەب ئاوڕێکی وردی ئەدایە سەر رەسم کردنی «ژیان لە سەر بناغەی بایەخەکان» و ئەمە رۆمان بوو کە بە رەسم کردنی «ژیان لە سەر بناغەی زەمان» ئەرکێکی جیاوازی لە ئەرکەکانی ئەدەب زیاد کرد. لە روانگەی شپینگلێرەوە (فەیلەسووفی ئاڵمانی، ١٩٣٦ـ ١٨٨٠) سەرهەڵدانی رۆمان بەم هۆکارەوە بوو کە «ئینسانی پەڕ مێژوویی» سەردەمی نوێ هەوجێی بە چەشنێ لە ئەدەبە کە بتوانێ سەرقاڵی «تەواوەتی ژیان» بێ. بەڵام لە نێو رەخنەگرانی ئەم سەردەمەدا، نۆر ترۆپ فرای (رەخنەگری ئەدەب، ١٩١٢، کەنەدا) کە لە سەر ئەم بڕوایە بوو کە تایبەتمەندیی تایبەتی رۆمان لە هەمبەرکردن دەگەڵ چەشنەکانی دیکەی ئەدەبدا پێکەوە لکاندنی «زەمان و ئینسانی رۆژئاوایی‌یە.»

لەمەوبەر، لایەنێک لەو بایەخەی رۆمان ئەیداتە رەهەندی زەمان، لێکمان داوە و دیتمان کە رۆمان نەریتی لە مێژینەی کەڵک وەرگرتن لە چیرۆکە بێ زەمانەکانی بۆ مەبەستی نیشاندانی راستییەکانی هەتاهەتایی ئاکاری نایە ژێر پێ. تایبەتمەندییەکی دیکە کە بیچمی رۆمان لە زۆربەی چیرۆکەکانی پێشوو جیا دەکاتەوە، کەڵک وەرگرتن لە ئەزموونەکانی رابردوو لەجیاتی هۆکاری کردەکانی ئێستاکەیە. بە زبانێکی دیکە بیچمی هاوکاتبوونی بێ قەومان و نەقەومانی رووداوەکان، یان گۆڕانکاری روخساری کەسێتییەکان بوو. لە دۆخێکدا لە بیچمی رۆماندا بە سۆنگەی هۆکاری زەمانەوە، پێوەندییەکی هۆکاری «عِلّت» لە نێوان رووداوەکاندا پێکدێ و ئەم کارە، پێکهاتەی رۆمان زۆر قورس و قایمتر دەکات. بەڵکەم لەمەش گرینگتر ئەو کارتێکردنە بێ کە جەخت کردنی رۆمان لە سەر رەوتی زەمان، لە کەسێتی سازاندندا دایدەنێ. بەرچاوترین و توندڕۆترین نموونە لەم بەستێنەدا،رۆمانی «شەپۆلانی زەین»ە کە داواکاری گێڕانەوەی

ڕاستەوخۆی ئەو شتەیە کە بە هۆی ڕەوتی زەمانەوە بە زەینی ئینساندا دێ و دەڕوا،بەڵام ڕۆمان بە گشتی زیاتر لە هەر چەشنێکی دیکەی ئەدەب سەرنجی داوەتە گۆڕانکاری کەسێتی لە مەودای زەماندا کە ڕۆمان لە کێشەکانی ژیانی ڕەسم دەکات، ئەمەش نیشاندەری زاڵبوون بە سەر ڕەهەندی زەماندایە.

ت ـ هەرگرین گوتەنی: بەشێکی زۆری ژیانی ئینسان هەر بە هۆکاری درەنگ تێپەڕبوونی ئەو شتەوە تەقریبەن هەر لە بەرهەمی ئەدەبدا ڕەسم نەکراوە مابۆوە. ڕۆمان ئەندازەیەکی زەمانی دەکار دەکا کە لە بەراورد کردندا دە گەڵ ئەندازەی زەمانی ئەدەبی ریوایی بەر لە خۆی بە چەشنێکی زۆر ورد لە بەرچاوترە و ئەو لێکچوونەی لە نێوان ڕۆمان و داڕشتنی ئەزموونەکانی ڕۆژانەدا هەیە،ڕاست پێوەندی بەم ئەندازەی زەمانییەوە هەیە.

دەوری زەمان لە ئەدەبی کۆن و سەدەکانی نێوەڕاست و سەردەمای ڕێنیسانسدا، حەتمەن زۆر جیاوازە دەگەڵ ئەو دەورەی لە ڕۆماندا هەیەتی. بۆ نموونە، بەرتەسک کردنەوەی ڕووداوەکانی تیراژێدی «کارەسات» بۆ ماوەی یست و چوار سەعات ـ یانی هەمان خاڵی یەکیەتی زەمان کە هەموان دەگەڵیدا دیوناسییان هەیە ـ لە ڕاستیدا ڕەفز کردنەوەی بایەخی ڕەهەندی زەمان لە ژیانی ئینساندایە، لە بەر ئەوەی ئەم کارە بە گوێرەی ڕوانگەی باوی جیهانی کۆن کە بە پێی ئەو ڕاستەقینە لە گشتییە سەرەتایی و هەرمانییەکاندا بوونیان هەیە، بە لەونێک نیشانەی ئەمەیە کە ئاشکرا کردنی ڕاستینەی هەبوون، حەوجێی بە تەمەنێ نیە، بەڵکوو کارێکی ئاوا لە مدەی شەووڕۆژێکدا بە تەواوەتی جێبەجێ دەبێ.

لە ڕاستیدا دانانی مەرگ لە قەڵافەتی فایتوونێکی باڵدار یان دروێنەوانێکی مڕومۆچدا ـ کە هەروەها هەموان ئەمە دەزانن ـ ئەمیش بێژەری هەمان

روانگەیە. ئەمانە سەرنجی ئێمە نەک بەرەو پرۆسەی زەمان، بەڵکوو بۆ تایبەتمەندییەکی ئەوپەڕی سەرەتا و هەرمانی کردن رادەکێشن و ئاگەداری ئێمە بە سەر ژیانی رۆژانەماندا دەهاونە ژێر کارتێکردنی خۆیانەوە هەتا بۆ بەرەو ڕووبوونەوە دەگەڵ ژیانی پاش مردن حازرمان کەن. لە راستیدا بە گیانلەبەر چوواندنی مردن، چ لە قەڵافەتی فایتوونی باڵدار و چ لە رواڵەتی دروێنەوانی مرومۆندا، لەم بارەوە لە خاڵی یەکیەتی زەمان دەچێ کە بنەمایەکی نامێژوویی هەیە و بەم هۆیەوە،هەروەها نموونەیەکی ئاشکرایە لە بایەخێکی زۆر کەم کە لە زۆربەی ئەدەبی بەر لە رۆماندا دەیاندایە رەهەندی زەمان. بۆ وێنە بۆچوونی شەکسپیر لە رابردووی مێژوویی زۆر جیاوازە دەگەڵ بۆ چوونی سەردەمی نوێدا: تێرِوا، رۆم، بنەماڵەی پلێن تەجێنیت یا بنەماڵەی تیۆدۆر هیچ کامیان، ئەوەندەیان پێوەندی بە رابردووە نیە کە دەگەڵ زەمانی ئێستادا یان دەگەڵ یەکدیدا جیاوازییان هەبێ. لێرەدا شەکسپیر روانگەی زەمانی خۆی نیشان ئەداتەوە، چونکە سی ساڵ لە پاش مردنی ئەو بوو کە وشەی «نەگونجان لە زەماندا» بۆ یەکەم جار هاتە ناو زبانی ئینگلیزییەوە و ئەو هێشتا لە حاڵیبوونی چەشنی سەدەکانی ناوەڕاستی مێژووەوە زۆر نزیک بوو کە بە گوێرەی ئەو عەرابەی زەمان، لە هەموو دەورەکانی مێژوودا نموونەهایەکی دووپات و چەند پات زێدەتر دەکات کە هەتا هەتایە بۆ دەکار کردن دەبن.

ئەم روانینە نامێژوویی‌یە پێوەندی دەگەڵ نەبوونی هەست بە تامەزرۆیی لە بەستێنی زەمانی چرکە بە چرکە و رۆژ بە رۆژەوە هەیە و هەر ئەم نەبوونی تامەزرۆیی‌یە بۆتە هۆکاری ئەمەی کە بیچمی زەمانی زۆرێک لە شانۆنامەکان (چ ئەوانەی شەکسپیر نووسیبوونی و چ ئەوانەی بەر لەو،

پێـشینانی ئـەو لـە دوای ئاشـیلەوە نووسـیبوویان) ئـەو کەسـانەی کـە دواتـر دەستیان دایە رەخنە نووسین لە سەر ئەمانە، گێڕیان بکات.

لە ئەدەبی چیرۆکی رابردووشدا دەگەڵ نواڕینێکی وەکی ئەمە سەبارەت بـە رۆمان بەرەو روو دەبینەوە،رووداوەکان بەردەوام لە زنجیرەیەکی دابـڕاو لـە زەمان و مەکان «شوێن»دا دەقەومێن و بایەخێکی زۆر کەم بۆ زەمـان وەکـی هۆکارێک لە پێوەندییەکانی ئینسان لە بەرچاو دەگیرێ. کـۆلێریج سـەرنجی دابووە «سەربەخۆیی سـەیر و سـەمەرە و نـەبوونی راسـتەقینەی خەیاڵـات لـە تەواوی زەمان و مەکانە تایبەتەکانی «*خاتوو شاژنی پەرییەکان*»دا. هـەروەها رەهەندی زەمـانی نەزیلـەکانی بـانین و ئـەو چیرۆکـە جـەنگی ـ ئەویندارانـە پاڵەوانانەیەی کە هەر ئاوا و بـەم پێیـە تـەم و مژاوی و تایبـەت نەبوونەتـەوە. بەڵام زۆر زوو چەمکی تازەی زەمان لە زۆرێک دە بەسـتێنەکانی تێفکـرینی ئینـساندا بـڵاو بـووە. ساڵـەکانی دوای سـەدەی حەڤـدە بـووە شـاهیدی سەرهەڵدانی توێژینەوەی عـەینیتر سـەبارەت بـە مێـژوو و هـەر بـەم هۆیـەوە جیاوازی لە نێوان رابردوو دەگـەڵ ئێـستادا زیـاتر هەسـت کـرا. لـەم دۆخـەدا ئیـسحاق نیۆتـۆن (فەیلەسـوف و ماتماتیـک زانی ئینگلیـزی، ١٧٢٧ــ ١٦٤٢) دەگەڵ جان لاکـدا لێکدانەوەیـەکی تازەیـان لـە پرۆسـەی زەمـان پێـشکەش کرد. زەمان واتای درێژە دانێکی هێدیتر و میکـانیکیتـری پەیـدا کـرد کـە وەها ورد دابین کرابوو کە دەکرا بەربوونەوە خوارێی شـتەکان و زنجـیرەی تێفکرین لە زەیندا دەگەڵ زەماندا بەراورد بکەین.

ئەم جەخت کردنە تازانە لە رۆمانەکانی دیفۆ دا نیـشان دراوە. بـۆ یەکـەمجار لە رۆمانەکانی ئەودا بوو کە وێنەی ژیانی تاکە کەسی هەم لە دوورە وێنـەی بەرینی ئەودا لەجیاتی پرۆسەیەکی مێژوویی پێشکەش کرا هەم لـە روانگـەی نێزیکی ئەوڕا بوو کە پێ نیشانی ئەدا ئەو پرۆسەیە لە پـاش بەسـتێنی دەتێپـەڕ

بـوونی تێفکرینـەکان و کردەوەکانـدا بـە دیـار دەکـەوێ. هەڵـبەت ئەمـە درووستە کـە جاروبـار بـەراوردی زەمـانی رۆمانـەکانی دیفـۆ هـەم لـە زاتی خۆیاندا دژوازن و هەم دەگەڵ دیمەنی مێژوویی رواڵەتی ئەودا دژایـەتی‌یـان هەیە. بەڵام حەتمەن هاتنە گـۆڕێی رەخنـەی ئـاوا هـەر لـە خۆیـدا ئافەرمێکـە لەوەی کە چۆن خوێنـەر هەسـت دەکـا کـە کەسایەتییەکانی بەرهەمـەکانی *دیفۆ* رەگ‌و ریشەیان لـە رەهەنـدی زەماندایـە. ئەمـەش روونـە کـە نـاتوانین وایدانێین رەخنەی ئاوا سەبارەت بە رۆمانی *ئەرکیدیا* نووسراوەی سیدنی یان *سەفەری زائـیر* نووسـراوەی بـانین دا بێتـە ئـاراوە، چونکـە لـەم بەرهەمانـەدا بەڵگەی شیاو بۆ راستەقینە بوونی زەمان بە دەستەوە نیە تاکوو بتوانین جـۆرە دژوازییەک لەواندا بدۆزینەوە. بەڵام دیفۆ حەتمەن بەڵگەی ئاوا بە دەسـتەوە ئـەدا. ئـەو لـە باشـترین بەرهەمەکانیـدا تـەواوەن ئێمـە رازی دەکـا کـە چیرۆکەکانی لە زەمان و شـوێنێکی تایبەتـدا دەقـەومێن و بیرەوەرییـەک لـە رۆمانەکانی ئەو لەزەیندا دەمێنێتەوە، بە گشتی لەو بەشانە پێکدێن کـە ژیـانی کەسێتییەکان بە چەشنێکی زیندوو روونـاک وێنـە کـراون، ئـەو بەشـانەی وا لاواز پێکـــەوە لکـــاون تـــاکو روانگەیـــەکی رازیکـــەرەوە لـــە ژیاننامـــەی کەسێتییەکان پێشان بدەن. لـە بەرهەمـەکانی دیفـۆ دا واتایـەک لـە شوناسـی تاک لە درێژەی زەماندا هەیە و لە عەینی حاڵدا ئەم شوناسی تاکە کەسییە لە بواری ئەزمووندا گۆڕانکاری بەسەردا دێ.

ئەم بۆچوونە زۆر بەرچاوتر و کاملتر لە بەرهەمەکانی ریچارد سۆن دا لە چاو ئەدا. ئەو بە وردی سەرنجی ئەدایە هەتا تەواوی رووداوەکانی چیرۆکەکـەی لە بیچمێکی زەمـانی راڤـەکراودا کـە لـە پـێش ئـەودا پێـشینەی نـەبوو، جـێ بکاتەوە: سەرپەڕی هەر نامەیەک لە رۆمانەکانی ئەودا بە خوێنـەر دەڵـێ کـە ئەو نامەیە لە کام رۆژی حەوتوودا نووسـراوە و ئەغـڵەب سـەعاتی نووسـینی

نامەکەش نووسراوە و ئەمەش لە جێی خۆیدا لە حوکمی چوار چێوەیەکی عەینی بۆ وردەکارییەکانی زەمانی تەنانەت زیاتری خودی نامەکەیە. بۆ نموونە لە رۆمانی ئەودا دەخوێنینەوە کە *کۆلێریسا* لە سەعات ٦/٤٠ خولەکی پاش نیوەڕۆی ٥شەممەی ٧ی سیپتامبردا مرد. کەڵک وەرگرتنی ریچارد سۆن لە نامە دە رۆمانەکانیدا، هەروەها ئەم هەستە لە خوێنەردا بەدی دێنێ کە بە راستی لە هەموو رووداوەکانی رۆمانەکەدا بەشداری هەیە و ئەمە هێند بە هێز و کامڵ بوو کە تا ئەو زەمانە بێ وێنە بوو. ریچارد سۆن هەروەکوو لە «پێشەکی» رۆمانی *کۆلێریسا* دا ئاماژە دەکات،دەیزانی «دۆخی قەیراناوی . .. دەگەڵ ئەو شتەی دەتوانرێ وەسفەکان و رەنگدانەوەکانی کاتی پێ بوترێ» باشتر لە هەر شێوازێکی دیکە سەرنجی خوێنەر رادەکێشێ و زۆربەی دیمەنەکانی رۆمانەکانی، کەش و هەوای چیرۆک بە وەسفێکی ورد و دوور و درێژ هێدی دەکرێتەوە و وێکچوونی دەچێتەوە سەر ئەزمونێکی راستەقینە. دەسکەوتی ریچارد سۆن لەم دیمەنانەدا، لە بۆ رۆمان حوکمی کارتێکردنێکی بوو کە تەکنیکی «نومای نێزیک»ی دەیوید وارک گریفیت (سینەماکاری ئەمریکی، ١٩٤٨ـ ١٨٧٥) لە فیلمدا هەبووی: یانی رەهەندێکی تازەی لە دووبارە نواندنی راستەقینە زیاد کرد.

فیلدینگ لە گەڵ کێشەی زەمان لە رۆمانەکانیدا، روانگەیەکی دەرەکیتر و سەلەفیتری گرتە بەر. ئەو لە رۆمانی *شەمێلا* دا کەڵک وەرگرتنی ریچارد سۆنی لە فرمانەکانی زەمانی ئێستا دایە بەر گاڵتە: «خاتوو جێرویس و من تازە چووینەتە نێو پێخەفەوە و دەرگا قفڵ نەکراوە، چما ئاغاکەم بێت ـ ئەی هاوار! دەنگی پێیم گوێ لێیە کە هەر ئێستا لە دەرگاکەوە هاتە ژوورێ. دەزانی چیە؟ هەروەکوو قەشە ویلیام دەڵێ من فرمانەکانی زەمانی ئێستا لە

بـۆ نووســین دەکــار دەکــەم، باشــە، ئــەویش دە نێــوان ئێمــەدا لــە نێــو پێخەفەکەدایە.»

فیلـدینگ لـە رۆمـانی *تـام جـۆنز* دا ئاماژەی کـرد بـە تەمایـە سـەبارەت بـە رەهەندی زەمان، زۆر هەڵبژاردەتر لە ریچارد سۆن کار بکات: «ئێمە پێـوەین لە جێی لاسایی کردنەوەی مێژوونووسان کە مەراقێکی زۆر بە سـەر خۆیانـدا دادەسەپێنن و خاوەنی نووسراوەی زۆرن و بـۆ پاراسـتنی یەکدەسـتی کـۆی نووسراوەکانیان پێیان وایە دەبێ سەبارەت بە پاژەکانی ئەو مانگ و ساڵـانەی وا لەواندا هیچ رووداوەیەکی ئەوتۆ نەقـەوماوە هێنـدە کاغـەز رەش کەنـەوە کە سەبارەت بە ئەو سەردەمە گرینگانەی کە گـەورەترین رووداوەی ژیـانی ئینـسان لەوانـدا قـەوماوە دەنووسـن. زیـاتر بـە شـوێن شـێوازی ئـەو تاقمـە نووسەرانەدا دەچین کە داواکاری ئەوەن شۆڕشی وڵاتانیان نیشان داوە» بەڵام رۆمانی *تام جـۆنز* لـە عـەینی حاڵـدا تـازە خوازییـەکی سـەیری لـە بەسـتێنی سەرقاڵبوون بە زەمانەوە لە چیرۆکدا هێناوەتـە گـۆڕێ. دەڵـێی فیلـدینگ لـە نووسینی ئەم رۆمانەدا لە رۆژمێر کەڵکی وەرگرتووە، یـانی هـەمان نیـشانەی بـڵاوکردنەوەی بۆچــوونێکی عــەینیتــر لــە زەمــان لــە لایــەن ســەنعەتی لەچاپدانەوە. بێج لە بـڕێک وردە هەڵـوارده تەقریبـەن هـەموو رووداوەکـانی ئەم رۆمانە، نەک هەر لە پێوەندی دەگەڵ یەکدیـدا و ئـەو زەمانـەی لـە هـەر کـام لـە دەورەی سـەفەری کەسـێتییە جیاوازەکـان لـە وڵـاتی رۆژئـاواوە بـۆ *لەنـدەن* بـە کـردەوە دەقـەومێ،بەڵـکوو هـەروەها لـە پێوەندییانـدا دەگـەڵ هۆکـاری دەرەکـی وەکـوو رۆژمێـری وردی مانـگ و جـەدوەلی زەمـانی شۆڕشی لایەنگرانی جەیمز (جەیمزی دووهەم شای ئینگلیز لە ساڵی ١٧٤٥دا یـانی ئـەو ساڵـە بـڕیار وابـوو ساڵـی راپـەڕینی لایـەنگرانی شـۆڕش بێـت) سەبارەت بە نەریتی زەمان هیچ چەشنە هاودەنگییەکمان پێکەوە نیە.

## هـ : شوێن «مه‌كان»

له‌م به‌ستێنه‌شدا، هه‌روه‌كوو زۆر به‌ستێنی دیكه شوێن پێویسته و پێویـستیی بـه زه‌مانه‌وه هه‌یه به لۆژیک هه‌ر كارێكی تاک و تایبه‌ت، وێڕای ئاماژه بۆ دوو تایبه‌تمه‌ندی هاوته‌راز ـ یانی زه‌مـان و مـه‌كان «شـوێن» ــ وه‌سـف ده‌كـرێ. هه‌روه‌كی كۆلێریج ئاماژه ده‌كا: «له باری ده‌روون ناسه‌كییه‌وه ئه‌و گومانـه‌ی له زه‌مانمان هه‌یه،دایم و ده‌رهه‌م له گه‌ڵ شوێندا پێكه‌وه گـرێ ئـه‌درێن.» لـه راستیدا ئه‌م دوو ره‌هه‌نده به هۆكاری زۆر مه‌به‌سـتی كرده‌ییـه‌وه لـه یه‌كـدی جوێ نابنـه‌وه،هـه‌روه‌كوو نێـووه‌رگرتنی دوو وشـه‌ی «حـازر» و «چركـه» بـۆ هه‌ردووی ئه‌م ره‌هه‌ندانه‌ش ده‌لاله‌تێک بۆ لێک جیا نه‌بوونه‌وه‌ی ئه‌م دوانه‌یه. له عه‌ینی حاڵدا چما بـاش ورد بینـه‌وه ته‌ماشـا ده‌كـه‌ین نـاتوانین بـه سـانایی بڕگه‌یه‌كی تایبه‌ت له هه‌بوون بێنینه به‌رچاو، چما ئه‌و شته له به‌ستێنی شـوێنی خۆیدا دانه‌مه‌زرێنین.

شۆێن هه‌ر له مێژه‌وه ته‌قریبه‌ن به قه‌رایی زه‌مـان لـه كاره‌سـات (تراژێـدی) و به‌زمه‌سات (كومێدی) ۆ چیرۆكه جه‌نگی ـ ئه‌ویندارانه‌كاندا گـشتی و تـه‌م و مژاوی بوو. هـه‌روه‌كوو جانـسۆن (شـاعیر و ره‌خنـه‌گری ئینگلیـزی، ١٧٨٤ــ ١٧٠٩) ده‌ڵێ: «شه‌كسپیر سه‌رنجێكی نه‌ئه‌دایه جیاوازی نێوان زه‌مان و مه‌كان (كـات و شــوێن).» *ئاركیـدیای* سـیدنی‌ش راســت وه‌كــوو *به‌رزه‌خــه گه‌ڕۆكه‌كانی* سه‌رده‌می ئه‌لیزابێت تایبه‌تی شوێنێكی تایبه‌ت نیه.

هه‌ڵبه‌ت ئه‌مه وایه كـه لـه رۆمانـه قه‌لاشـییه‌كان و لـه به‌رهه‌مـه‌كانی بـانین دا یـه‌كجار زۆر وه‌سـفی زینـدوو تایبـه‌ت بـه لـه‌ش لـه گۆڕێدایـه، به‌ڵـام ئـه‌و وه‌سفانه، به ده‌گمه‌ن و ناته‌واون.

دەڵیی دیفۆ یەکەم نووسەری ئینگلیزە کە تەواوی چیرۆکەکەی بە چەشنێک نیشان ئەدا کە دەڵیی بە راستی لە شوێنێکی ماددیدا دەقەومێ. سەرنجدانی ئەو بۆ وەسفی شوێنی کۆمەڵایەتی ئێستاش هەرکاتییە و نەک دایمی، بەڵام جاروبارە پاژە ئاشکراکان دەکاتە کامڵ کەرەوەی دەلالەتی بەردەوامی چیرۆکەکەی و دەبێتە هۆی ئەوەی *رابینسۆن کۆرۆزۆ* و *ماڵ فلاندرز* زیاتر لە هەر کەسایەتییەکی چیرۆکی بەر لە خۆیان تەواوەن بە شوێنەکەیانەوە پێوەندی بدەین. یەکێ لە تایبەتمندی بەرهەمەکانی دیفۆ هەر ئەم بەرچاو بوونەی قورس و قایمی زەمان و مەکانە، بە تایبەت ئەو دەورەی کە شتە بزۆزەکانی جیهانی ماددی لەرۆمانەکانی ئەودا هەیانە: لە رۆمانی *ماڵ فلاندرز* داکراسی کەتانی و ئاڵتوونێکی زۆر بۆ بژاردن هەن و دوورگەی *رابینسۆن کۆرۆزۆ* پڕپڕە لە کەلوپەلی ئاسنین و لیباسی لە یادمانەوەدا.

ریچارد سۆن کە لەم دۆخەشدا دەوری سەرەکی لە کامڵبوونی ریئالیزم لە گێڕانەوەدا هەبوو ئەم پرۆسەیەی تا رادەیەکی زۆر وەپێش خست. لە هەموو رۆمانەکانی ئەودا، وەسفی دیمەنەکانی سروشت زۆر کەمە، بەڵام بایەخێکی زۆری داوەتە بارودۆخی ناوەکی شوێنی نیشتەجێ بوونی کەسێتییەکانی: شوێنی ژیانی *پامێلا* لە لینکن شێڕ و بەدفێرشێڕ، بەراستی لە بەندیخانە دەچێ، ماڵی *گرەندیسۆن* بە چەشنێکی زۆر دوور و درێژ بۆ خوێنەر وەسف کراوە، برێ لە وەسفەکان لە رۆمانی *کلێریسا* دا پێشەکییە بۆ پسپۆڕی بەلـزاک لە گوێزتنەوەی شوێنی رۆمان بەرەو هێزێکی تێکۆشەر و هەمیشە حازر؛ بۆ وێنە بینای *هارلۆو* دەگۆڕدرێتە سەر شوێنێکی ماددی و ئاکاری کە بە چەشنێکی سەرسامهێنەر هەبوونی راستەقینەی هەیە. لەم بەستێنەشدا، فیلدینگ زۆر لە تایبەتخوازی ریچارد سۆن لە دواترە. ئەو لە رۆمانەکانیاندا دۆخی ناوەوەی جێوشوێنی نیشتەجێ بوونی کەسێتییەکان بە وردەکاری تەواوەوە وەسف

ناکات و وەسفە زووبەزووەکانی لە دیمەنە سروشتییەکان، بە شـێوازێکی زۆر سەلەفی نووسراوە. دیسانەکەش لە دیمەنە سروشتییەکان، بە درێژایی مێژووی رۆمان، *تام جۆنز* یەکەم رۆمانێکە کە بینایەکی گوتیگ دەورێکـی گرینگـی لـەودا هەیـە. هـەروەها فیلـدینگ شـوێنی رووداوی رۆمانـەکانی بـە هـەمان وردییـەوە بـاس دەکـات کـە تـەرتیبی زەمـانی ئـەم رووداوانـە دەگێڕێتـەوە: زۆرێک لەو شوێنانەی کە *تام جۆنز* لە رێگەی خۆیدا بۆ لەندەن بەواندا تێپەڕ دەبێ، بە ناو دەسـت نیـشان کـراون و شـوێنی دەقیقـی دامـەزرانی سـەرباقی ئـەوانی دیکـەش بـە کەڵـک وەرگـرتن لـە بەڵـگەی جۆراوجـۆر دەتـوانین بدۆزینەوە. دەیجا بە گشتی دەتوانین بڵێین باوەکوو هیچ کام لە رۆمانـەکانی سـەدەی هـەژدە هاوشـانی بەشـەکانی دەسـتپێکی رۆمـانی *سـووو و رەشی* ئەستاندال یا *بابەگۆریۆی* بەلزاک نین، کە ئەمانە هەر لە دەست پێکـەوە ئـەو بایەخەی ئەستاندال و بەلزاک لـە وێنـاکردنی گـشتیی خۆیانـدا لـە ژیـان بـۆ شوێنیان داناوە نیشانی ئەدەن. بەڵام بـە بـێ گومـان پـێ ملبـوون بـە خاڵـێکی راستی ئاساوە،، دیفۆ و ریچارد سۆن و فیلدینگ‌ی بۆ ئەو جێیە پـاڵ پێـوە نـا کە بوونە داهێنەری هێزی «نیشتەجێ کردنی کاملی ئینسان لە شوێنی ماددی» خۆیاندا.

بـە بـڕوای ئـالێن تیـت ( شـاعیر ورەخنـەگرێکی ئـەمریکی، ١٩٧٩ــ ١٨٩٩) شیاوبوونی جیاکەرەوەی رۆمان وەکوو چەشنێکی ئەدەب هەر ئەمەیە. دەبـێ بـڵێین سـەرکەوتنی بـەرچاوی ئـەوان لـەم بەسـتێنەدا لـە ریـزەی ئـەو شـتە گرینگانەدایـە کـە ئـەوان لـە نووسـەرانی پێـشووی ئـەدەبی چیرۆکـی جیـا دەکاتەوە و پلەوپایەی پڕ بایەخی ئەوان لە نەریتی ئەم چەشـنە ئەدەبـە تـازەدا نیشان ئەدا.

و- زبان:

تایبەتمەندییەکانی تەکنیکی جۆراوجۆری ڕۆمان کە تا ئێرە بژاردوومانە، بە ڕواڵەت هەموویان بەستێنی گەیشتن بە ئامانجێک پێکدێنن کە لە نێوان ڕۆماننووسان و فەیلەسووفاندا هاوبەشە، یانی پێکهێنانی شتێک کە دەخوازێ ڕاڤەیەکی هەمبەری ڕاستەقینە لەو ئەزموونانە بە دەستەوە بدا کە خەڵک بە کردەوە لە ژیانی خۆیاندا لە گەڵیدا بەرەو ڕوو دەبن. گەیشتن بەم ئامانجە پێویستی بەوە بوو کە بێج لەو نەریتەی پێشتر باسمان کرد،زۆربەی نەریتەکانی دیکەی ئەدەبی چیرۆکی تێکبشکێ. هەڵبژاردنی پەخشان بۆ مەبەستی زۆرتر وەکی ڕاستەقینە نیشاندانی ڕۆمان پێوەندییەکی پڕاوپڕی دەگەڵ یەکێ لە جەختەکانی شێوازناسەکی تایبەتی ڕیئالیزم لە فەلسەفەدا هەیە. ڕاست هەروەکوو شیکایەتی تەسمیە خوزان سەبارەت بە زبان وردە وردە بە هۆی لاواز بوونی ڕوانینی فەیلەسووفانی ئیسکۆلاستیکەوە سەبارەت بە شتە گشتییەکانی پێک هێنا، بەم پێیە زۆری پێ نەچوو کە ڕیئالیزمی سەردەمی تازەش خۆی دەگەڵ دژواری واتا ناسەکییەکی وەکی ئەودا هەمبەر دێت.

هەموو وشەکان نیشاندەری شتە ڕاستینەکان نەبوون، یان بە چەشنێکی وەکی یەک نیشاندەری ئەوان نەبوون، دەسا فەلسەفە دەبایە بنەمای ئەقڵانی وشەکانی بدۆزیبایەتەوە. ئەو شتەی لاک لە دوایین بەشەکانی کتێبی سێهەمی«*پەڕتووکێ لە سەر هێزی حاڵیبوونی ئینسان*»دا دەڵێ، بەڵکەم شاهیدی هەرە ئەوتۆی ئەم داواکارییە لە سەدەی حەڤدەدایە. زۆربەی ئەو شتەی ئەو سەبارەت بە کەڵک وەرگرتنی دروست لە وشەکان وتوویەتی،بەشی هەرە زۆری ئەدەب ناگرێتەوە،چونکە هەروەکوو لاک بە نارەحەتییەوە بۆی دەرکەوتووە: [ ڕەوان بوونی کەلام «بەلاغە» هەروەکوو

جینسی لەتیف ] زامنی هەڵخەڵـەتاندنێکی بـە تـاموچێـژە. بەڵـام لـە لایـەکی دیکەوە، ئەمە خاڵـێکی شیاوی سـەرنجدانە کـە بـاوەکوو بـڕێک لـە فـێڵ و فەرەجەکانی زبان، کە لاک دەست نیشانیان دەکا ـ وەکوو زبانی مەجازی ـ لە تایبەتمەندییەکانی هەمیشەیی چیرۆکە جەنگی ـ ئەویندارانەکان بوو، بەڵـام لە پەخشانی هەر چیرۆکنووسێکی دیکەی هـەتا پـێش ئـەو سـەردەمەدا، ئـەم جۆرە فێڵ و فەرەجانەی زبان» زۆر دەگمەنترە.

هـەتا پێـشتر لـە سەرهەڵـدانی رۆمـان ئـەدەبی چیرۆکـی بـە پێـی نـەریت بـە شێوازێک دەنووسـرا کـە هـاودەنگی نێـوان وشـەکان و شـتەکان بایـەخێکی دەرەجەیـەکی نـەبوو، بەڵـکوو گرینـگ ئـەو جوانییـە دەسـتکردە بـوو کـە سەناعاتی تازە داهاتوو ئەیاندا بە وەسـفەکان و رووداوەکـان. نـەریتی زبـانی دەستکردی لە چیرۆکە جەنگی ـ ئەویندارانەکانی یۆناییندا هەوەڵ کەڕەت بە ئیتی ئۆپیکای هیلیۆدورووس ژێربیناکەی داندرا و بە فەساحەتی دەسـتکردی جان لی لی و سیدنی و هەروەها بـە خـوازە (اسـتعارە) دوور و ئاڵـۆزەکانی لاکالپرێند (رۆماننووسی فەڕەنـسی، ١٦٦٣ــ ١٦١٤) ماگداڵـین ـ دسـکۆدێری (رۆماننووسی فەڕەنسی، ١٧٠١ـ١٦٠٧) درێژەی پێدراوە. هەر بـەم هۆکـارەوە چمـا چیرۆکنووسـانی تـازە، نـەریتی لـە مێژینـەی تێکـەڵ کـردنی شـێعر و پەخـشانیان پـێ شـێل کردبایـە (یـانی ئـەو نەریتـەی کـە تەنانـەت لـە گێڕانەوەهایەکی وەکوو *ستیریکان* بەرهەمی پیتـڕونیس (تەنزنووسـی یەکـەم سەدەی پێش زایینی رۆمـی)دا کـە لـە سـەرەتاوە هـەتا کۆتـایی هـەر ژیـانی چینەکانی خوارەوە رەسم دەکا. ئەمـەش دیـسانەکە لـە بـاری ئەدەبەوە زۆر چاوەنواڕ دەکرا کە ئـەوان زبـان لـەجیاتی سـەرچاوەیەک دەکـار کـەن کـە دەبێتە هۆکاری گاڵتەجاڕ،نەک لەجیاتی ئامێرێکی دەربڕین کە هـەر لایـەنی ئیرجاعی هەیە.

هەڵبەت کەڵک وەرگرتن لە زبان بەم چەشنە، لە هەر دۆخێکدا دەربڕی وەسفی ریئالیزمێکی ناڕازاوەیە کە نەریتی رەخنەی کلاسیکی بە گشتی هیچ کاربوردێکی لەودا نیە.

ناساندنی *وەسفی بەرەبەیان* نووسراوەی سوئیفت لە ژمارە نۆهەمی بڵاڤۆکی *تەتلێر*دا (١٧٠٩) بە نێوی بەرهەمێک کە نووسەر لەودا بە پەلە هەنگاوی ناوەتە ریگایەکی تەواوەن تازە و هەر شتێک هەر وەکوو دەقەومێ، هەر واش وەسفی دەکات» لە راستیدا ئەمە زەم کردنی ستایش ئاسا بوو. گریمانەی نووسەران و رەخنەگرانی خوێندەوار ئەمە بوو کە پسپۆڕیی نووسەر، خۆی لە دەکارکردنی وردی وشەکاندا بۆ هاودەنگی دەگەڵ شتەکاندا نیشان نادات، بەڵکوو دەبێ بزانین ئەو بە چ رادەیەک لە هەست و کەف و کوڵی ئەدەبی و رەوانیی زبانی (بلاغت)ی هاودەنگ دەگەڵ بابەت لە شێوازی نووسینی خۆیدا نەخشاندوویەتی. دەیجا جێی سەرسووڕمان نیە کە یەکەم نموونەکانی گێڕانەوەی چیرۆکێکی پەخشانی کە تەقریبەن بە تەواوی هەر دێتە سەر دەکارهێنانی وەسفی و زەقی زبان، ئەمە نووسراوەی کەسانێکە وا لە ریزەی نووسەرانی خاوەن هەستی تەڕوبڕدا ناگونجێن. ئەمەش سەرسووڕمانی نیە کە زۆربەی نووسەرانی ئەو سەردەمە کە خوێندەوارییەکی باشتریان هەبوو، دیفۆ و هەروەها ریچاردسۆنیان بە هۆکاری چۆنیەتی نووسینی ناحەز و ئەغڵەب بەبێ سەرنجدانیان، دایە بەر رەخنە. ئەمە ئاشکرایە کە مەبەستەکانی لە بنەڕەت ریئالیستی دیفۆ و ریچاردسۆن شتێکی زۆر جیاواز دەگەڵ فۆڕمە ناسراوەکانی پەخشانی لە ئەدەبدا دەخوازێ. ئەمە راستە کە لە کۆتاییەکانی سەدەی حەڤدەهەمدا بزووتنەوەیەک کە ئامانجەکەی پەخشانێکی روون و سانا بوو، بەشێکی زۆری لە پێکهاتنی فۆڕمێکی دەربڕین بوو کە زۆر زیاتر لە فۆڕمەکانی

رابردوو دەگەڵ رۆمـانی ریئالیـستیدا لێکدەهاتنـەوە، بەڵـام لـە عـەینی حاڵـدا روانگـەی **لاک** سـەبارەت بـە زبـان بـەرە بـەرە لـە تیـۆری ئەدەبـدا رەنگـی ئەدایـەوە. بـۆ وێنـە جـان دێنـیس (رەخنـەگر و شانۆنامەنووسـی ئینگلیـزی، ١٦٥٧ـ١٧٣٤) روخسارەکانی خەیاڵاتی، بە هۆکاری ریئالیسیتی نەبوونـەوە لـە برێ دۆخی تایبەتدا رەفز ئەکردەوە: «هیچ چەشنە روخـسارەیەکی خەیاڵـات هـەرگیز ناتوانـێ ئـامێری دەربـڕینی خـەم و خورپـە بـێ. بێتـوو کەسـێک بـە گەڵک وەرگرتن لە شوبهاندن شیکایەت بکات، دژ کردەی من ئەمە دەبـێ: یا پێکەنینم دێ و یـا خـەوم لێدەکـەوێ». بـەم هـەمۆوە پێوانـەی پەخـشان لـە دەورەی *ئاگۆست*دا زۆر ئەدەبی‌تر لەوە ماوە کە بتوانێ زبانی سروشتی *ماڵ فلاندرز* و *پـەمێلا ئانـدرۆز* بـێ؛ بـاوەکوو پەخـشانی ئەدیـسۆن (وتارنووسـی ئینگلیزی، ١٦٧٢ـ١٧١٩) بۆ وێنـە، یـان سـوئیفت بـە قـەرایی پێویـست سـانا و زەقە، بەڵام ئیجازی خاوەن سـامانی ئـەو زیـاتر چەشـنێ کـورت کردنـەوەی زۆر داچۆڕاو بە زەینـدا دێنـێ هـەتاکوو وەسـفێکی تـەواو لـەو شـتەی بـاس دەکرێ.

دەیجا دابڕانی دیفـۆ و ریچاردسـۆن لـە نـەریتی بـاوی پەخـشان نووسـین،بـە رواڵەت نابێ دابڕانێکی بە هەڵـکەوت دابنـێین، بەڵـکەم دەبـێ ئـەو کـارە بـە نرخێک دابنێین کە بـۆ وەچنـگ خـستنی پێوەنـدی راسـتەوخۆ و چڕوپـڕ لـە نێوان دەقی نووسراوەکەیان و ئەو شتەدا کە وەسـفی دەکـەن دابـڕابوون کـە خەرجی کەن.

لە بەرهەمەکانی دیفۆ دا ئەم پێوەندییە چڕوپڕە بـە گـشتی لایـەنی جەسـتەیی هەیـە، لـە دۆخێکـدا لـە بەرهـەمی ریچاردسـۆن‌دا بـە گـشتی سـۆزخواز و عاتیفییـە،بەڵـام لـە هـەر دوو حاڵـدا،خوێنـەر هەسـت دەکـا تاقـە مەبەسـت و ئامـانجی نووسـەر ئـەوە بـوو،بـە هـەر نرخێـک بـووە ـ چ بـە دووپـاتکردنی

وشەکان و کۆپلەکان، چ بە هێنانەوەی رستەی بەرپەرچدانـەوە «مُعتَرِضـە» و چ بە درێژەدادڕی ـ کارێک بکات تاکوو وشەکان ئەو شتەی کە مەبەستی ئـەو بووە بە هەموو تایبەتمەندییەکی تایبـەتی، بـە بـێدابـڕان، بـۆ خوێنـەری روون کەنەوە. ئەڵبەت فیلدینگ لە روانگە یان نەریتی پەخشان نووسینی سەردەمی *ئاگۆسـت* دانەبـڕا، بەڵـام دەتـوانین دەلالـەت بکـەین هـەر ئـەم کـارە بۆتـە هۆکـاری ئـەوەی چیرۆکـەکانی ئـەو بـڕێک لـە راستەقینەئاسا بـوون دوور کەونەوە. کاتێ رۆمانی *تام جۆنز* دەخوێنینەوە وایدانێین لـە گـەڕانێکی تـازە بـۆ دۆزینـەوەی راسـتەقینە خەبـەردار دەبـین؛ بـە پەخـشانی فیلـدینگدا بـێ درەنگ بۆمان دەردەکەوێ کاری ئەم گەڕانـە زۆر لەمەوبـەر تـەواو بـووە و ئیـدی پێویـست ناکـا زەحمـەتی ئاوهـا بدەینـە خۆمـان،بەڵـکوو لەجیاتیـدا راپۆرتێکی گوڵبژێرکراو دەگەڵ راڤە کردنێکی کامڵ سەبارەت بەو شـتانەی دۆزراوەتەوە پێشانمان ئەدەن.

لەم خاڵەدا دژایەتییەکی سەیروسەمەرە بەرچاو دەکەوێ. لە لایەکەوە دیفۆ و ریچاردسۆن ژیان و دارِشتنێکی پەخشانی بۆ رۆمانەکانیان دەکار دەکەن کـە هەمیشە و بێ جیاوازی ریئالیستییە و بەم هۆیەوە، بایەخەکانی دیکەی ئەدەب ئـەدۆڕێنن. لـە لایـەکی دیکـەوە، تایبەتمەندیگـەلێکی بـاش کـە لـە شـێوازی نووسینەوەی فیلدینگدا بەرچاو دەکەوێ،زۆر جار دەگەڵ تەکنیکی رۆمـان نووسینی ئەودا دژایەتی هەیە،چونکە کاتێک روانگەی دەربـڕدراوی ئـەو لـە رۆماندا بە چەشنێکی ئاشکرا لە لایەن رۆمـان نووسـەوە هەڵـبژێردرێ، ئیـدی ئێمـە بـڕوا ناکـەین بـەو شـتەی راپـۆرتی لـە سـەر دەدرێ، یـان لانی کـەم سەرنجمان لە ناوەرۆکی راپۆرتەوە بەرەو راپۆرتچی رادەکێشرێ. دەڵـێی لـە نێوان بایەخە لەمێژینەکان و هەرمان بوونی ئەدەب لـە لایەکـەوە و تـەکنیکی تایبەتی گێڕانەوە لە رۆماندا لە لایەکی دیکەوە، دژایەتییەکی زاتی هەیە. ئـەم

دژایەتییە زاتییە دەتوانین لە ڕێگەی بـەراورد کردنەوەیـەک دەگـەڵ ئـەدەبی چیرۆکـی فەڕەنـسیدا پـێ نیـشان بـدەین. لـە فەڕەنـسادا، نـوارینی رەخنـەیی کلاسیک بۆ رەوانبوونی گوتار و ئیجاز جـەختی دەکـرد و هـەتا سـەردەمی سەرهەڵدانی قوتابخانەی رۆمانتیـک،هـەرگیز بـە چەشـنێکی تـەواو کێـشەی دەگەڵدا نـەکرا. رەنگـە تـاکوو رادەیـەک بـەم هۆکـارەوە بـێ کـە ئـەدەبی چیرۆکی فەڕەنسی لە *خاتوو شازادە کلووە* هەتا *پێوەندی سەرسامهێنـەر*، لـە دەرەوەی نـەریتی گـشتی رۆماندایـە. خوێنـەری چیرۆکـی فەڕەنـسی، بـە پێچەوانـەی پـسپۆڕی ئـەدەبی و قووڵـبوونی بـاری دەروون ناسـەکی ئـەم چیرۆکانە، هەست دەکا ئەوانە دەستکردتر لەوەن کـە وەکـی راسـتی وا بـن. لەم دۆخەوە، *خـاتوو* لافیـت و شـۆدرِ لـوو لاکولـوو (نووسـەری فەڕەنـسی، ۱۸۰۳ـ۱۷٤۱) راست لە سەر خاڵی پێچەوانـەی دیفۆ *و* ریچاردسۆنن، چونکـە کەڵک وەرگرتنەکەیان لە وشەی زۆر، لـە خۆیـدا زامنێکـە بـۆراستەقینەئاسا بـوونی ئـەو شـتەی راپـۆرتی لـە سـەر ئـەدەن، چونکـە تاقـە مەبەسـتی پەخشانەکەیان هەمان ئەو شتەیە کە لاک ئەوپەڕی وەشاوەیی زبان، یـانی بـە «پێنیشاندانی زانیاری نووسەر بە سەر شتەکاندا» نێوبردی کرد؛ کە داوا کـارن رۆمانەکانیان بە گشتی هەر لـە روونووسـینێک لـە ژیـانی راسـتەقینە بـێ ـ یـا فلۆبێر وتەنی: «نووسراوەی راستەقینە»ن ـ

بەم چەشنە، دەڵێی کارکردی زبان لە رۆماندا لـە چـاو چەشـنەکانی دیکـەی ئەدەب، زۆر ئیرجاعیترە و کردەوەی خـودی رۆمـانیش زیـاتر لـە ڕێگـەی وەسفی هەمە لایەنەوەیە هەتاکوو نەک وردبوونەوەیەکی فەسـیحانە بـە سـەر لایەنێکی تایبەتدا. بێ گومان ئـەم خاڵـە چەنـد کێـشەیەک روون دەکاتـەوە، وەکی ئەوەی: بۆچی دەتوانین رۆمان لە هەر چەشنێکی ئەدەبی دیکـە باشـتر وەرگێڕینەوە؟ بۆچی زۆربەی نووسـەران کـە بـە بـێ گومـان لەبـەرچاوترین

رۆماننووسانن، هەر لە ریچاردسۆن و بەلزاکەوە هەتا هاردی و دەستایۆڤسکی نووسراوەکانیان زۆر جاران دەربڕی سەلیقەیەکی تەڕوبڕ نیە و تەنانەت جاروبار نیشاندەری گەندەڵبوونی تەواوە؟ هەروەها بۆچی رۆمان کەمتر لە هەموو چەشنە ئەدەبێکی دیکە هەوجێی بە وەسفکردنی خاڵە مێژوویی و ئەدەبییەکانە؟ ـ نەریتی رواڵەتی خۆی مەجبووری دەکا ژێرنووسەکانی خۆی چێ کات.

بەشی دووهەم: ریئالیزمی «رواڵەتی»

سەبارەت بە لێکچوونە گشتییەکانی نێوان ریئالیزم لە فەلسەفە و ئەدەبدا،ئەوەندەی وتمان تەواوە. ئەڵبەت مەبەستی ئێمە ئەمە نیە کە ئەم لێکچووونە ناوبردراوانە، دەلالەت بە سەر وەکی یەکبوونی دەقاودەقی ریئالیزمی فەلسەفی و ئەدەبیدا دەکەن؛ فەلسەفە و ئەدەب دوو وتەزای جیاوازن.

هەروەها ئەم لێکچوونانەمان تەرکەن لە سەر ئەم گریمانەیە نەهێنا گۆڕێ کە نەریتی ریالیزمی لە فەلسەفەدا، هۆکاری سەرهەڵدانی رۆمان بووە، بە گومانێکی بەهێز، ریئالیزمی فەلسەفی لەم بەستێنەدا کارتێکردنی هەبووە، بە تایبەت لە رێگەی لاکەوە کە تێفکرینەکانی لە هەر بارێکەوە لە مەیدانی بیرۆکەکانی سەدەی هەژدەدا کاردانەوەی هەبووبوو. بەڵام چما پێوەندییەکی هۆکاری «عِلّی» گرینگ لە نێوان ریئالیزم لە فەلسەفە و ئەدەبدا هەبووبێ. بە بێ گومان ئەوەندە راستەوخۆ نەبووە: داهێنانی نوێگەری فەلسەفی و ئەدەبی دەبێ بە دیمەنەکانی یەکدی ئاسای گۆڕانکارییەکی گەورەتر دابنێین، یانی ئەو گۆڕانکارییە گەورەیەی شارستانیەتی رۆژئاوا لە پاش سەردەمی رێنیسانس، کە وێنەی هاوڕەنگی سەدەکانی نێوەڕاستی جیهانی دەگەڵ وێنەیەکی زۆر جیاوازدا گۆڕیوەتەوە، وێنەیەکی وا کە بە

پێویست کۆمەڵ بە کۆمەڵی بەرەو پێشکەوتن، بەڵام بە بێ بەرنامەی کەسانێکی تایبەت بە ئێمە نیشان ئەدا کە ئەزموونی تایبەتیان لە زەمانە تایبەتییەکان و شوێنە تایبەتییەکان هەیە.
بەڵام لێرەدا ئێمە دەگەڵ چەمکێکی زۆر سنووردارتردا بەرەو رووین، یانی دەمانهەوێ بزانین بەراورد کردنی ریئالیزمی ئەدەبی دەگەڵ ریئالیزمی فەلسەفی تاکوو چ رادەیەک لە دابینکردن و بژاردنی تایبەتییەکانی نەریتی تایبەتی گێڕانەوە لە رۆماندا یارمەتی ئێمە ئەدا. تاقمێ رایان وایە کە ئەم شێوازی گێڕانەوەیە، دەستکەوتی تەکنیک گەلێکی ئەدەبە کە بە گوێرەی ئەو لاسایی کردنەوەی ژیانی ئینسان لە رۆماندا بە گوێ لە مشتێ هەمان رێبازهایەک جێبەجێ دەبێ کە ریئالیزمی فەلسەفی لە تێکۆشانی خۆیدا بۆ دابینکردن و راپۆرت کردنی راستی بە کاری دەبا. ئەم رێبازانە بە هیچ کلۆجێ تایبەت بە فەلسەفە نین، بەڵکوو لە راستیدا هەرکاتێ بمانهەوێ لێکیدەینەوە کە راپۆرتێک لە رووداوەیەک هەتا چ رادەیەک وەکی راستەقینەیە، ئەم رێبازە دەگرینە بەر. بەم هۆیەوە دەتوانین شێوازی لاسایی کردنەوەی راستەقینە لە رۆماندا لە رێگەی بەراورد کردنەوە دەگەڵ رێبازەکانی تاقمێکی دیکە لە پسپۆڕانی مەعریفەناسیندا، یانی دەستەی دادوەرانی دادگا بە باشی کورت بکەینەوە. لە زۆر لایەنەوە، چاونواڕیەکانی دەستەی دادوەرانی دادگا و چاوەنواڕی خوێنەری رۆمان لە گەڵ یەکدیدا هاودەنگن: هەردووک دەیانهەوێ «هەموو خاڵە تایبەتییەکان»ی رووداوەیەکی گریمانەیی ـ یانی زەمان و شوێنی رووداوەکە ـ بزانن، هەردووک خوازیاری ئاگەداربوونی تەواو سەبارەت بەو بەشدارانەی رووداوەکەن، لە بەر ئەوەی ئەوان هیچ بەڵگەیەک سەبارەت بە کەسێک بە نێوی جەنابی *تووبی بێڵچ* یا ئاغای *بەدمەن* ناسەلمێنن، تا چ بگا بە

*کوولوویی* نێویک کە ناوی بنەماڵەییشی نیە» و وەکی ئەو هەوایەی کە هەڵیدەلووشین ئاسایی‌یە»

ئەوان هەروەها دەیانهەوێ تاکوو شاهیدان، رووداوەکە «لە زبانی خۆیانەوە» بگێڕنەوە، نەک لە زبانی کەسێکی دیکەوە. لە راستیدا،دەستەی دادوەران «روانگەیەکی گشتی سەبارەت بە ژیان» هەڵدەبژێرن و بە بڕوای ت. هـ.گرین روانگەی تایبەت نوێنی رۆمانیش هەر ئەمەیە.

ئەو شێوە گێڕانەوەیەی کە رۆمان بە سۆنگەی ئەوەوە ئەم روانگە گشتییەی ژیان نەخش دەکات،دەتوانین «ریئالیزمی رواڵەت»ی ناو بنێین. ئەم ریئالیزمە، رواڵەتی‌یە، چونکە زاراوەی ریئالیزم لێرەدا ئاماژە بۆ هیچ تیۆر یا ئەوپەڕی ئەدەبێکی تایبەت ناکات، بەڵکوو مەبەست لەو هەر کۆمەڵەیەک لە شێوازەکانی گێڕانەوەیە کە زۆر جار لە رۆماندا دەکار دەکرێن و ئەوەندە کەم لە چەشنەکانی دیکەی ئەدەبدا بەرچاو دێن کە دەتوانین ئەو رێبازانە بە نموونەی رۆمان بناسین و هیچی دیکە. لە راستیدا ریئالیزمی رواڵەتی پێش گریمانەیەکە کە دیفۆ و ریچاردسۆن بە واتای زۆر وردی وشە سەلماندوویانە، بەڵام بە گشتی لە رۆماندا لە جیاتی چەشنێکی ئەدەب هەبوونی هەیە، یانی ئەم پێش گریمانەیە یا نەریتی پێشووتر کە: رۆمان راپۆرتێکی تەواو و بەرامبەری راستەقینە لە ئەزموونەکانی ئینسانە. دەیجا دەبێ بە پاژگەلێکی وەکوو تاکە کەسی کەسایەتییەکانی بەشدار لە رووداوەکانی چیرۆکەکەدا و بە هۆی تایبەتمەندی زەمان و مەکانەکانی کردەکانیانەوە، خوێنەر رازی بکەن. ئەو پاژانەی کە لە رێی زبانەوە زۆر ئیرجاعی‌تر لەو شتە کە لە چەشنەکانی دیکەی ئەدەبدایە، نیشان ئەدرێن.

هەڵبەت ریئالیزمی رواڵەتی وەکی نەریتی شاهێدبوون لە دادگادا، هەر نەریتێکە و هۆیەکی نیە کە ئەو راپۆرتەی لە رێی ریئالیزمی رواڵەتییەوە

سەبارەت بە ژیانی ئینسان ئەدرێ، راستەقینەتر لەو راپۆرتـە بـێ کـە لـە رێـی نەریتە زۆر جیاوازەکـانی چەشـنەکانی دیکـەی ئەدەبـەوە نیـشان ئـەدرێ. لـە راستیدا ئەو شتەی کە رۆمان تەواوەن وەکـی راسـتەقینە دەچـێ، بۆتـە هـۆی برێ سەر لێشێواوی لەم دۆخەدا. هەروەها برێک لە نووسـەرانی ریئالیـست و ناچرالیست (سروشتخواز) ئەغڵەب لە یادی دەکەن کە دووبارە نووسـینەوەی وردی راستەقینە،بە پێویست بەرهەمێک پێکناهێنـێ کـە لـە راسـتیدا خـاوەنی راستی بێت یان بایەخێکی ئەدەبی نەمری هەبێ. بە بێ گومان هەر ئـەم هۆیـە برێک بۆتە هۆکاری ئەوەی لەمڕۆدا بێ مەیلییەکی هەندێ بەربڵاو سـەبارەت بە قوتابخانەی ریئالیزم و بەرهەمە ریئالیستییەکان برەوی هەبێ، بەڵام ئـەم بـێ مەیلییە شایەد ئێمە بەرەو هەڵەیەکی پێچەوانـەی هەڵـەی نووسـەرانی نـاوبراو پاڵ پێوەنێ و لەم رێگەوە ببێتە هۆکاری سەرلێشێواوی لە رەخنەدا.

نابێ بهێڵین ئاگـەداری لـەو کـەم و کوورییـە تایبەتانـە کـە لـە مەبەسـتەکانی قوتابخانـەی ریئالیزمـدا بـەرچاو دەکـەوێ، ببێتـە هۆکـاری ئـەوەی کەڵـک وەرگرتنی لە رادەبەدەری رۆمـان بـە گـشتی ـ چ رۆمانـەکانی جـۆیس و چ رۆمانەکانی ئێمیل زوولا (نووسەری سروشتخوازی فەڕەنسی) ـ لـەو شـێوازە ئەدەبەی لێردا هەر ریئالیزمی رواڵەتی پـێ دەڵـێین، کـەم بایـەخ بنوێنـدرێ. هەروەها نابێ لە یادی کەین کە باوەکوو ریئالیزمی رواڵەتی نەریتێکـە،بەڵـام وەکی هەموو نەریتەکانی ئەدەب، بایەخی تایبەتی خۆی هەیـە. راسـتەقینە لـە چەشنە جیاوازەکانی ئەدەبدا بـە رادەیـەکی جیـا جیـا لاسـایی دەکرێتـەوە و ریئالیزمی رواڵەتی رۆمان لە چاو چەشنەکانی دیکەی ئـەدەب، دەبێتـە هـۆی لاسـایی کردنەوەیـەکـی راسـتەوخۆتر لـە ئەزموونـەکانی تاکـە کـەس کـە لەشوێنی زەمانی و مەکانی خۆیاندا دایانناون، لە ئاکامدا نەریتـەکانی رۆمـان لە هەمبەر کردن دەگەڵ زۆربەی نەریتـەکانی دیکـەی ئەدەبـدا بـارێکی زۆر

کەمتر داوێتە سەر شانی خوێنەر و دەسا هەر بەم هۆکارەوەیە کە لەم دوو سەد ساڵەی ئەم دواییانەدا زۆربەی خوێنەران، ڕۆمانیان پێ چەشنێک لە ئەدەبە کە ویستەکانی ئەوان بۆ هاودەنگی چڕوپڕ لە نێوان ژیان و هونەردا بە باشترین چەشنێک جێبەجێ دەکات. ئەڵبەت بایەخەکانی ڕیئالیزمی ڕواڵەتی لە بەستێنی هاودەنگی چڕوپڕ و دوور و درێژ دەگەڵ ڕاستەقینەی ژیاندا، تەنها ئەمەندە نەبووە کە هەر خۆشەویستی ڕۆمان زیاتر بکات، بەڵکوو ئەم بایەخە جیاوازترین تایبەتمەندیەکانی ڕۆمانیش دەگرێتەوە. ئەڵبەت ڕیئالیزمی ڕواڵەتی لە تایبەتیترین چەمکی خۆیدا، شێوازێک نەبوو کە دیفۆ و ڕیچاردسۆن دۆزیبێتیانەوە، ئەو کارەی کە ئەوان کردیان هەر ئەمە بوو کە ڕیئالیزمی ڕواڵەتی بە چەشنێکی زۆر تەواو عەیارتر لە ڕابردوو دەکار کەن. بۆ نموونە،هەروەکوو تۆماس کارلایل (نووسەری سکاتلەندی، ١٧٩٥ـ١٨٨١) ئاماژە دەکات، هومێریش ـ حیماسەنووسی یۆنانی هەشت سەدە لە پێش زایینی مەسیحدا ـ هەمان «ڕووناکی ڕوانگە»ی گرینگی هەبوو کە لە وەسفە زۆر دوور و درێژەکاندا، بە چەشنێکی خۆشەویستانەی ورد، لە هەموو بەرهەمەکانی دیفۆ و ڕیچاردسۆندا دەبیندرێ.» هەروەها لەو چیرۆکانەدا کە دواتر نووسراون، لە «*کەری زێڕین*»ەوە هەتا *ئووکاسین و نیکۆلیت*، هەروەها لە بەرهەمی چۆسێرەوە هەتا بەرهەمی بانین بەشی وای تێدایە کە کەسێتییەکان و کردەوەکانیان و شوێنەکەیان هێندە تایبەت پێشان دراون کە دەتوانین بڵێین ئەم بەشانە بە قەرایی ڕۆمانەکانی سەدەی هەژدە بەرانبەری ڕاستەقینەن. بەڵام جیاوازییەکی گرینگ لە گۆڕێدایە: ئەم بەشانە لە بەرهەمەکانی هۆمێر و لە چیرۆکە پەخشانییەکانی ڕابردوودا زۆر کەمن و زۆر جار لە ئەو گێڕانەوەیەی کە لە ناو دەقەکەیدان جیا دەکرێنەوە. بنیاتی ئەدەبی زاڵ بە سەر تەواوەتی ئەم بەرهەمە نێوبراوانەدا، بە چەشنێکی

یەکدەست بەرەو ریئالیزمی رواڵەتی لایەنی نەگرتووە و بـە تایبـەت بیچمـی ئەوان ـکە لە خۆیدا بـە جارێـک جیـاوازی بـوو. نووسـەرانی سـەردەمەکانی رابردوو، تەنانەت کاتـێ بـە ئاشـکرا دەیانـسەلماند کـە مەبەسـتێکی تـەواوەن ریئالیستییان هەیە ـ وەکوو زۆربەی نووسەرانی سەدەی حەڤدە ـ لـە وەشـوێن کەوتنی مەبەستەکەیاندا بەردەوام نەبوون.

لاکالپرێند، ریچارد هێد، گێریملشوزن، بانین، ئەفرابن و ڤـۆرتەر (نووسـەرانی سەدەی حەڤدەی ئورووپی) تەنیا تاقمێکی کەم لەو کەسـانەن کـە هـەموانیان رایانگەیاندبوو چیرۆکەکانیان بە تەواوی مانـاوە راسـتەقینەیە،بەڵـام وتـەکانی جەختداری ئەمانە لە زۆربەی سـەربووردی پیـاوە ئـایینییـەکانی سـەدەکانی ناوەڕاستیشدا دەبیندرێ و رازی کەرەوەتر لە پێداگرتنـەکانی ئەمانـە نیـە. لـە هەر دووکی ئەم نموونانەدا، مەبەستی راستەقینە نوێن بـە ئەنـدازەی پێویـست دەگـەڵ تـان و پـۆی بەرهەمـدا تێکـەڵ نـەبووە تـا ببێتـە سـۆنگە و هۆکـاری حەوادانی تەواوەن تەواوی نەریتە ناریئالیستییەکان.

دیفۆ و ریچاردسۆن سەربەخۆیی خۆیان لەو نەریتە ئەدەبەی کە شیمانەی بوو دەگەڵ ئامانجە دەرەجە یەکەکانیاندا دژایەتی هەبێ، وەها پاراست کـە هـەتا ئەو زەمانە بێ پێشینە بوو و پێویستیەکانی راستیی بابەتییان بە چەشنێکی زۆر بەربڵاوتر سەلماند. لەم (چـارلز لـەم، وتـار نووسـی ئینگلیـزی، ١٨٣٤ــ١٧٧٥) سەبارەت بە رۆمانەکانی دیفـۆ وتبـووی: «وەکـی ئەمـە وایـە شـایەتمانەکانی دادگایەک دەخوێنینەوە.»

ئەو قەت نەیدەتوانی ئەم رایە ـ کە زۆر لە ڕای *هێزلیت* سەبارەت بە ریچـارد سۆن دەچێ ـ سـەبارەت بـە ئـەدەبی چیرۆکـی بـەر لـە دیفـۆ دەربـڕێ ئـەم کێشەیەی کە بلێی ئەم تایبەتمەندییەی وا لەم ئاماژەی پێدەکات، لـە خۆیـدا خاڵێکی باشە یان نا، هێشتاش جێگەی قسە و باسە. بەڵام چما دیفۆ و ریچارد

سۆن سەرنجی ئێمەیان بە چەشنێکی جیاواز و باشتر لە دیتران رانەکێشابایە، هەرگیز شیاوی ناوداریيەکی ئاوا نەدەبوون. هەمدیسان، گومانی تێدا نیە کە کامڵبوونی شێوازی گێڕانەوەیەک کە بتوانێ کاردانەوە و کارتێکردنێکی ئاوای هەبێ،بەرچاوترین دیمەنی ئەو گۆڕانگارییە سەیر و سەمەرەیە لە چیرۆکە پەخشانییەکان دایە کە رۆمانی پێ دەڵێین. بەم هۆکارەوە بایەخی مێژوویی دیفۆ و ریچارد سۆن‌یش لەو شتەوەیە کە ئەوان بە چەشنێکی چاوەڕوان نەکراو و تەواو عەیار، ئەو شتەی کە دەتوانین بە تایبەتمەندی گشتی رۆمانی بزانین، یانی ریئالیزمی رواڵەتی رۆمانیان بەدی هێنا.

## تێبینی و پەراوێزەکان:

١_ لەم وتارانەدا ئاماژە بۆ نێوی سەدان نێوداری ئەدەب دەکرێ، تاقمێکیان زۆر ناسراون، تاقمێکی دیکەشیان تەنها ئاماژە بە نێویان کراوە و ئەگینا بیرۆکەیەک یان کۆپلەیەکیان لە سەر نەنووسراوە. ئەم دوو تاقمەمان لە پەراوێزەکاندا نەناساندووە و لە بەر ئەوەی ناوەکان یەکجار زۆر بوون بڕێکی دیکەیانمان هەر لە وتارەکەدا و لە نێو کەوانەدا ناساند.

**٢_ سەری دوو نێوچاوان و گریپووچکەی مێژوو:** ژانووس خوایەکی ئوستوورەی رۆمی بوو کە هاوکات پشتە سەر و بەرەو رووی خۆی دەبینی و لە گەڵ دەرگاکان و سەرەتای کارەکاندا یاد دەکرا، ناوی مانگی ژانویە یان ژانواری لە ناوی ئەوڕا وەرگیراوە.

**٣_ ڕێنیسانس یا رۆنیسانس:** بووژانەوەو ژیانی سەر لە نوێی وڵات و گەلانی ئەورووپی لە سەدەی پانزە بەم لاوە.

**٤_ وتەزای فەلسەفی دال و مەدلوول و «علّت و معلول»:** لە سەر هۆکار و کردەکان و رەنگدانەوە و کاریگەری و چۆن چۆنی و چلۆنایەتی و چەندایەتی پێوەندی نێوان توخمەکان و شتەکاندا دەدوێ.

**٥_ تێڕوا:** شاری کەونارای یۆنان لە باکووری رۆژئاوای ئەنەدۆڵ «ئاناتول» شوێنی شەڕە ئەفسانەییەکانی نێوان ئوستوورەکانی یۆنان و تێڕوا.

# تیۆری رۆمان

نووسەر: جان هاڵپڕین (John Halperin)

ئەو کاتەی کە عیسا مەسیح لە تەمـەنی دوانـزە ساڵـاندا ژیـانی سـەربـەخـۆی دەست پێکرد، هەزارەها ساڵ لە تەمەنی شیعر تێدەپەڕی و شانۆ مێژینـەیێکـی چەند سەد ساڵانی بوو. سەردەمی سەرهەڵدانی رۆمان، هەزار و پانـسەد سـاڵ لەمەو دوا دەست پێدەکا. ئەوەتانی لـە کۆتـایی سـەدە ی بیـستەمـدا جێگـەی سەرسوڕمان نیە کە کۆمەڵەیێکی روو لە زۆربوون، بەڵام هێشتا بڕێک کەم لە تیـۆری رەخنـەی رۆمانمـان لـە بـەر دەسـتایە، ئـەمـەش لـە دۆخێکدایـە کـە سەدەهـای سـەدەیـە چـەنـدان چـەشـنێ جۆراوجـۆری تیـۆری شـیعر و شـانۆ هەبوونیان هەیە.

بە قەرایی پەنجا ساڵێکە نووسەران و رەخنەگرانی رۆمان تامـەزرۆیـیـیـەکـی زۆر بۆ بڕی بنەمای تیۆری ئەم چەشنەی ئەدەب لـە خۆیانـەوە نیـشان ئـەدەن. ئەو شتەی لە سەدەکانی هەژدە و نۆزدەدا لە سەرەتادا چەشـنێ جووڵـانەوەی کوێرانە لە بەستێنی تیۆر سـازاندنا دەژمـاردرا، لـەم سـەدەی ئێستایەدا وەکـی

کۆمەڵەیێکی کەم و زۆر بەرچاو لە تیۆری رۆمان گەیشتۆتە بەهرە و بار و بەرهەم.
رەخنەی رۆمان نەک هەر لە بەستێنی گەیشتن بە پلەیێ لە پێچەڵاوپلووچی و کامڵبوونی هونەری شیاوی بەراورد لە گەڵ چەشنەکانی دیکەی ئەدەبدایە، بەڵکوو هەروەها بەرەو وەها پلەیێ لە توێژینەوەی لێکۆڵەرانە دەچێتە پێشێ کە لە کۆی تیۆرە مێژینەدارترەکان تێدەپەڕێ.
لەم نووسراوەیەدا بە تەمام بیچمێکی گشتی لە تیۆری رۆمان تاکوو پێشتر لە سەدەی بیستەم پێشکەشی خوێنەران بکەم، باوەکوو ئەم تیۆرە دائیما لە گۆڕاندا بووە. لێکدانەوەی هەمە لایەنەی رۆمان لەم نووسراوەیەدا ناگونجێ و مەبەستی من هەر ئەوەندەیە کە بە کورتی پێ نیشانی بدەم بناغەی خوازیارییە تازەکان لە رەخنەی تیۆریکی رۆماندا چیە و ئەو خوازیارییانە لە کام بیرۆکە گەلێکەوە سەرچاوە دەگرن و لە گەڵ کامە روانگەدا جیاوازییان هەیە.
یەکەم رەخنەی تیۆریکی رۆمان لە سەدەی هەژدەدا، هەر لە سەر ئاکامگەلی ئاکاریی تەکنیکەکانی چیرۆکنووسی دەدوا. بۆ وێنە دوکتۆر جانسۆن لە سەر ئەدەبی داستانی رای خۆی ئاوا دەردەبڕێ:
دەسا هەر ئەمە بەس نیە کە بۆ بە سەر کردنەوەی کەسێتییەک بڵێین ئاوها وێنە کراوە کە لە راستیدا وا دێتە بەر نیگا، لە بەر ئەوەی زۆر کەسێتی دەبێ هەرگیز رەسم نەکرێن. هەروەها سەبارەت بە گێڕانەوەیێکش بەس ئەوەندەی بڵێین دەوری رووداوەکان لە تەک ئەوەی دیتوومانە و لە تەک ئەزموونەکانماندا دەیخوێنێتەوە، لە بەر ئەوەی ئەو دیتراو و ئەزموونانەی کە «دونیا دیدەیی» پێدەڵێین، زۆر کات نیشاندەری ئەوەن کە ئینسانەکان زیاتر فێڵەبازن نەک پاک تینەت . . . نازانم بۆچی لەو گێڕانەوەدا کە لە گەڵ

راستییە مێژووییەکاندا سەروکاریان نیە، نابێ چەمکی فەزیلەت بە باشترین چەشنێک نیشان بدرێ، نەک فەزیلەتێکی فریشتە ئاسا و نەک فەزیلەتێکی نەگونجاوی چاوەنوارِ نەکراو (لە بەر ئەوەی ئەو شتەی نەتوانین بڕوای پی بکەین، هەرگیز لاسایی ناکەینەوە) بەڵکوو بەرزترین و پاکترین فەزیلەتێک کە بەشەر دەتوانێ پێی بگا، ئەو فەزیلەتەی کە لە جەنگەی ئەزموون کردنی رووداوەکان لە گەڵ سەرکەوتن بە سەر بڕێ لە گرفتەکان و تابشت هێنانی بڕێکی دیکەیاندا ئێمە فێر دەکەن کە دەتوانین هیوا بە چی ببەستین و دەتوانین چی بکەین.)

ئاوەها رەخنەیەک زیاتر دەوری ئاکاری هونەر لە بەر چاو دەگرێ، نەک لایەنی تیۆری رۆمان. لێرەدا جانسۆن لە گەڵ نەفسی ریئالیزمی ئەدەبیدا دژایەتی ناکا، بەڵکوو زیاتر لە تەک داستانگەلی وەکوو داستانەکانی فیلدینگ دا دژایەتی دەکا کە بە گومانی ئەو لە باری ئاکارییەوە لاڕێن، چوونکە ئەمانە بەو جۆرەی کە دەبێ بیکەن، لە نێوان پاکی و پیسیدا جیاوازی دانانێن. ئەمە بە واتای سەلماندنی ئامانج خوازی بی سنووری ئاکاری نیە، چونکە ئەو شتەی لە رادەبەر ئارمانجی بێت وەها لە خوێنەر جیا دەبێتەوە کە ناتوانی هیچ شتێک فێری ئەو بکات.

بە وتەی جانسۆن «ئەو شتەی نەتوانین بڕوای پی بکەین قەت لاسایی ناکەینەوە.» بەڵکوو زیاتر لە ئێمەی دەوی هەتا فەزیلەتی ئینسانە زاتەن باشەکان کە شیاوی لاسایی کردنەوەن جەختیان لە سەر بکەین. ئەم جەخت کردنە سەرنجی ئێمە بەرەو نموونەیەک رادەکێشێ کە دەبێ لەوڕا فێر ببین و بەم چەشنە بە لەوئێکی بەکارتر دەبێتە هۆی گوێ رادێربوونی سروشتی فەزیلەتداری ئێمە لەو نموونەیە. لێرەدا جانسۆن وەکوو ئەرەستوو لە بڕێ بەشی نامیلکەی شیعر ناسیدا، هونەر بە رێنوێنی ئاکاریی ئینسان و

هونەرمەندیش بە هۆکاری فێربوونی ئاکار دادەنێ. ئەو بە ریچارد سۆن ئافەرم دەڵێ کە هەمیشە نموونەیەکی ئاکاری تەواوەن بەرچاو لە رۆمانەکانیدا دیارە. شێوازی ریچارد سۆن ئەمە بوو کە لە نامە بۆ تۆمار کردنی گەڕیانی ئاوەڵناوی هۆشیار، یان زەین لە کاتی هەڵسووڕاندا کەڵکی وەردەگرت. ئەو بیروڕای وا بوو کاتێ گەڕیانەکانی «رەوتی» زەینی کەسێکی ئاسایی پی نیشان بدرێ، دەتوانین ئەزموونە تایبەتییەکانی ئەو، وەک ئەزموونی خۆمان دابنێین و ئەمەش بەم واتایەیە کە دەتوانین زۆر هێمنتر خۆمان لە گەڵ ئەو کەسەدا بە هاوپێناسە و هاوهەست دابنێین، هەروەها کاتێ کە مەیلمان بەرەو ئەو کەسە رادەکێشرێ و ئەو باشتر دەناسین، دەتوانین خۆشمان باشتر بناسین. هەروەکوو دەبینین سەدەیێک دواتر جۆرج ئەلیۆت یش هەر لەم شێوازەی کەڵک وەرگرت. لە راستیدا وەکی یەکبوونی هەوێن و پێناسە و هەستی خوێنەر و کەسێتییەکانی رۆمان بە مەبەستی روونا کخوازی ئاکارییەوە، یەکێ لە خاڵە بنەڕەتییەکانی ئەندێشە باوەکانی نێوەڕاستی سەدەی نۆزدە و هەروەها سەردەمای *ئوگۆست* سەبارەت بە رۆمانە. نموونەیەکی دیکە لەم بەستێنەدا دیفۆیە کە ژیان لە رۆمانەکانیدا بە وێنەی بەربەرەکانێیەکی دائیمی ئاکاری پێ نیشان ئەدات. هەروەکوو یان وات ئاماژە دەکا رۆماننوس هەر ئەزموونێکی تاکەکەس وەکوو خاوەنی چەشنی گرینگایەتی ئاکاری دادەنێ و بەم چەشنە ریئالیزمی رواڵەتی ـ یان تۆمار کردنی ژیانی راستەقینە لە یاد ناکرێن.

لە کردەوەدا بۆ مەبەستی هۆشیار کردنەوەی ئێمە لە بایەخی ئاکاری یێک بە یێکی کارەکانمانە. هەڵبەت جۆرج ئەلیۆت یش هەر بە شوێن ئەم مەبەستەوە بوو:» ئەو ئاکامە بەدشوومەی کە هەموو جارێ بۆی دەچێ رەزابوونی نەفسی خۆپەرەستی ئێمە بە شوێنەوەی بێ، هەندە سەرسام هێنەرە کە لە

راستیدا لە هەڵچوونمان کەم دەکاتەوە و خوازیاری ئێمە بۆ سزادانەوەی ئەو کەسانەی کە بە تاوانباریان دەناسین، لغاو دەکات. بە پێچەوانەی جانسۆن کە بە داپۆشراوی قسان دەکات، فیلدینگ سەبارەت بە مەبەستی ئاکاری خۆی لە پلە و پایەی رۆماننووسێکدا زۆر روون و ئاشکرا دەدوێ، باوەکوو ئەو لە هەڵسەنگاندن لە گەڵ برێ لە هاوخولەکانی خۆیدا سەرنجێکی کەمتری داوەتە دەوری ئاکاری ئەدەب. ئەو زیاتر مەیلی بەرەو تیپەکان بوو، نەک بەرەو تاک و زۆرتر لە روانگەیەکی «دەرەکی بینین»ـەوە لە کەسێتی دەروانی. ویستی ئەو لە پلە و پایەی رۆماننووسێکدا ـ هەروەکوو لە یەکەمین بەشەکانی *جۆزێف ئاندرووز*دا (١٧٤٢زایینی) بە روونی باسکراوە ـ باشتر کردنی ئاکاری خوێنەرەکەی یان بە وتەیەکی دیکە بڵاو کردنەوەی هاودڵی لە رێگەی راهێنانی ئاکارییەوە بوو:

«ئەمە وتەیەکی لە مێژینە بەڵام خاوەن راستییەکە کاریگەری نموونە ئاکارییەکان زیاترە تاکوو حوکمە ئاکارییەکان. چما ئەم وتەیە سەبارەت بەو شتەش کە ناحەز و نەفرەتکراو و لۆمە کراویشە راست دەربێ، سەبارەت بەو شتەی پەسند و جێگەی پیاهەڵکوتنە بە چەندان کەڕەت زیاتر لە راست دەکات. نموونە ئاکارییەکان دەبنە هۆی تامەزرۆیی بۆ چاو لێکەری، لە باشترین دۆخی خۆیدا بە سەر ئێمەدا کاریگەری دەبێ و خوازیارییەگی بێ خۆڕاگری بۆ لاسایی کردنەوە لە ئێمەدا پێکدێت. دەسا بەشەری باش لە لای دیوناسەکانی هەمیشە وەکی دەرسی ئاکار وایە و لە کۆیەکی بیچکۆلەدا کار تێکردنەکەی زیاتر لە کتێبێکی باشە. بەڵام سەبارەت بەوەی باشترین ئینسانەکان کەمتر دەناسرێن و لە ئاکامدا ناتوانن بە کەڵکبوونی خۆیان لە جیاتی نموونە گەلێکی ئاکاری بە رادەیێکی زۆر بڵاو بکەنەوە، دەتوانرێ لە نووسەر یارمەتی بخوازرێ تاکوو ئەزموونی ئەوانە زیاتر بڵاو کاتەوە

وێنەگەلی لەبەر دڵان بداتە ئەو کەسانەی وا لە ئەسڵی ئەمانە بێ بەشن. بەم تەرزە نووسەر بە راگەیاندنی ئاوها نموونەگەلێکی بایەخدار بە جیهان بگرە خزمەتێکی گەورەتر بۆ بەشەرییەت جێبەجێ دەکا. لە چاو ئەو کەسەی، ژیانی ئەو لە هەوەڵڕا بووە هۆی ئەو نموونەیە.»

رەخنەگران لە سەر ئەوەی کە ئەم وتانەی فیلدینگ دەتوانین چەندە بە جیددی (هەژڵ) بگرین تاکوو هەنووکە پێک نەهاتوون، بەڵام سەرنجی ئەو بۆ کار تێکردنی رێژەیی نمونە باش و خەراپەکانی ئاکاری لە ئەدەبی چیرۆکیدا لە زۆر جێی بەرهەمەکانیدا لەبەر چاوە. فیلدینگ لە وتارێکدا دوو ساڵ لە پێش نووسینی رۆمانی *جۆزێف ئاندرۆزدا* دەڵێ:

«ئێمە لەو نموونە ئاکاریانەی کە پێمان دەڵێن لە چ شتێک دوور کەوینەوە، زۆر باشتر و ئاسانتر شت فێر دەبین تاکوو لەو نموونانەی پێمان دەڵێن پێ ملی چی بین. هۆی ئەم کارە بەڵکەم ئەوە بێ کە زیاتر دەخوازین لە خووخدەی نەفرەتی و ناحەزی دیتران بێزار بین هەتاکوو بە سەر خووخدە باشەکانیدا هەڵبلێین.»

باوەکوو وا دێتە بەرنیگا کە سەرەتای رۆمانی *جۆزێف ئاندرۆز* ئەم وتە بشکێنێتەوە، بەڵام فیلدینگ لە هەر دوو شوێنەکەدا سەرنجی داوەتە سەر کار تێکردنی ئاکاری ئەدەب بە سەر خوێنەردا. جانسۆنیش بە پێچەوانەی قسە داپۆشراوەکانی، لەو وتارانەدا کە بۆ بڵاڤۆکی *رامبلێری* دەنووسی، لە زۆر لایەنەوە هەر هەمان ئەو بابەتە بنەما ئاکاریانەی کە فیلدینگ لە *جۆزێف ئاندرۆزدا* دەری بڕیبوو، دووپات دەکاتەوە. ئەمەش جێگای سەرنجە کە رای باسکراو کە لە بەشێ لە رۆمانی *جۆزێف ئاندرۆز*دا گێڕامانەوە ئەم شتە کە رۆماننووس نموونەگەلێکی ئاکاری لە ژیانی باش و بەکەڵکی ئینسانە ئاسایی و نێو ونەکان بە دەستەوە ئەدات . . .

سـۆنگەیەکی بزوێنـەر لـە چیرۆکـی جـۆرج ئـەلیۆتدا سـەبارەت بـە (داری تیەبڕوک) هەیە، لە کۆتایی رۆمانی *میدڵ مارچ*دا جۆرج ئـەلیۆت سـەبارەت بە داری تیە دەڵـێ: «هـەبوونی ئـەو کـارتێکردنێکی یـەکجار زۆری بـە سـەر کەسانی دەور و بەریدا بووە، چونکە زیاد بـوونی چاکـە لـە جیهانـدا تـاکوو سنووریک لە کارە بیچکەکانەوەیە و چما رۆژگار ئەوەنـدە بـە سـەر ئێمـەدا تاڵ و دژوار تێپەڕ نابێ، کەم و زۆر بە هۆی کەسانێکەوەیە کـە ئیماندارانـە و بە بێ نێو و ئاوازە ژیاون و غەریبانە چوونە گۆڕەوە»

رۆماننووسانی سەردەمی ڤـیکتۆریاش بـە پێچەوانـەی ساڵـانێکی زۆر نێـوان و مەودا لە گەڵ پێشینانیان لە سەردەمی ئاگۆستدا، هەر وەکی ئەوان لـە بناغـەدا بایەخی فێرکردن و راهێنانی هونەریان لەبەرچاو بوو. تیۆرزانانی رۆمان چ لـە سەردەمی ئاگۆستدا و چ لە سەدەی نۆزدەدا لانی کەم تاکوو بەر لە فلۆبێر و هێنری جـەیمز، لەیەکـەم پلـەدا خوازیـاری پێوەنـدی نێـوانی خوێنـەر و دەق بوون. پێناسەی ئەم پێوەندییە کە ئەندازەی لاسایی کردنەوەی رۆمـان روونی دەکاتەوە نیشاندەری چەشنی بایـەخی ئاکارییـە، بـە وتەیـەکی دیکـە، پلـەی مەعنەوی رۆمان بە هەمان ئەندازە لە سەر بناغەی پیوەندی خوێنـەر لـە گـەڵ دەقدا دابین دەبێ کە لە سەر بناغەی رەوشتی ئاکـاری خـودی نووسـەریش. چیرۆکەکانی نوسەری ئاکارخواز ئەوەندە ریئالیـستییـە (راسـتەقینە خـوازە) کە خوێنەر لەوڕا فێر دەبـێ ئینـسانێکی بـاش بێـت. جـەخت کـردن لـە سـەر مەحاکاتی بوون و لاسایی کردنەوە چیرۆک، لە راستیدا جـەخت کـردن لـە سەر کار تێکردنی ئـەو بـە سـەر خوێنـەر دایـە. رەخنـەگرانی ئـەو سـەردەمە بیروړایان وا بوو کە ریئالیزمی ئەدەبی، لە سەر بنەمای لاسایی کردنـەوەیێکی قنیات ساز لە سروشـت، بـە تـەنهایی کاریگـەرییێکی رۆحـی تایبـەتی هەیـە،

چونکه هەر چەندە رۆمان «ریئالیستی تر» بێ دەتوانێ زیاتر بە سەر خوێنەردا کاریگەری هەبی. «جا ئەم کاریگەریەش باش بی یا خراپ.»
ئەوەندەی نووسەرێک زیاتر ئاکارخواز بی، شیمانەی ئەوەی چیرۆکەکانی کارتێکردنێکی باشتری هەبی زیاترە. هەر وەکوو یان وات لە وتاری *سەرهەڵدانی رۆمان* دا ئەماژە دەکا، لە ئاخرێکانی سەدەی هەژدە و سەرەتای سەدەی نۆزدەدا نووسەرانێکی جۆراوجۆری وەکوو لارنس ستێرن و فانی بۆرنی و جین ئاستین لە رۆمانەکانیاندا لایەنەکانی دەروونی ژیانی کەسێتی چیرۆکەکانیان هێنا بەر لێکۆڵینەوە. جاروبار بۆ وێنە لە رۆمانەکانی ستێرندا مەبەست لەم کارە لاسایی کردنەوەی گاڵتەجارانەی فۆرمی رۆمان لە جیاتی چەشنێکی ئەدەبی بوو، بەڵام لە زۆربەی زۆردا، بۆ وێنە لە رۆمانەکانی جین ئاستیندا،مەبەست ئەمە بوو کە لە رێگەی وێنا کردنی زاتێکەوە کە لە زاتی خۆمان زۆر دوور نەبێ، شتێک سەبارەت بە خۆمان فێری خۆمان بکەین. بەم حاڵەشەوە چیرۆکنووسانی سەدەی هەژدە بە گشتی سەرنجێکی زۆریان نەئەدایە تیۆری رۆمان «باوەکوو ریچاردسۆن و فیلدینگ هەردووک خۆیان پێ بناغە دانەری چەشنێکی تازە لە چیرۆک نووسیندا بوو و بیروڕایان وا بوو کە بەرهەمەکانیان نیشاندەری دابڕانێک لە چیرۆکی جەنگی و ئاشقانە لەبرەو کەوتووەکانە، بەڵام خودی ئەوان یان هاوسەردەمەکانی ئەوان هیچ کامیان تایبەتمەندییەکانی چەشنێکی ئەدەبی تازە وا ئێمە هەوجێمان پێیانە، بە دەستەوە نادەن. لە راستیدا ئەوان هەر ئەیانویست لە سەر جیاواز بوونی پێناسەی چیرۆکەکانیان بە گۆڕینی نێوی چەشنی ئەدەبییەکەی مۆرکی شایەتمان دابنێن. تەنیا هەر لە دوایین ساڵەکانی سەدەی هەژدەدا بوو کە زاراوەی رۆمان برەوی پەیدا کرد و بڵاو بۆوە. هەڵبەت هەتا ئەو سەردەمە رۆمانی «گۆتیک» و رۆمانی «هەستی ناسینەوە»

تەواوەن هاتبوونـە بەرهـەم و تیـۆر سـازاندنی جیـددی سـەبارەت بـە فـۆڕمی ئەدەبی چیرۆکی، کەم و زۆر لە قۆناغەکانی نێوەڕاستی خۆیدا بوو.
چارڵز دیکنز ڕۆماننووسی ئینگلیـزی ( ١٨١٢ – ١٨٧٠ ) لـە پێـشەکییەکدا بـۆ چاپی ١٨٣٩ی ڕۆمانی *ئۆلیوێر توویست* وێڕای گلەیی و بناشت و شـکایەت، یاسایەک دەردەبڕێ کە زۆر لە وتەکەی جانـسۆن دەچـێ وا لـە پێـشتردا لـە وتارە چاپ کراوەکەی ئەو لە بڵاڤۆکی *ڕەمبلێر* دا هێنامانـەوە. دیکـنز دەڵـێ: «فەزیلەت و ڕەزیلەت لە چیرۆکەکانی سـەردەمدا وەهـا تێکەڵـاو بـوون کـە زۆر جار ناتوانین لێکدی جیایان کەینەوە.»ئەو لە ڕەخنەیێکی توندا بـە دژی ڕۆمانە زۆر گـشت خوازەکـانی«نیوگێیـت»دا(کـە پاڵـەوانی زۆرێـک لـەوان وەکوو یەکەم چیرۆکەکانی بولوێر لیتن هەریسۆن و ئینزوورت (ڕۆماننووسـی ئینگلزی، ١٨٠٥– ١٨٨٢) کابرایەکی خراپکار بوو.) دیکنز دەیـوت: ڕۆمـانی ئۆلیـوێر توویـستم بـەو مەبەسـتەوە نووسـیوە کـە هـەم خاڵـی ژیـانی شەڕافەتمەندانە لە هەر دۆخێکی نابەدڵدا، هەم سـەرکەوتنی ئاکـامیش نیـشان بدەم و هەم ئەو بەستێنە فکرییە مەکربازانەیە ئاشکرا بکەم کە زەینی خەڵـکی خەرابکار لەوێدا ژیان تێپەڕ دەکەن.»
ئانتۆنی ترالێپ (ڕۆماننووسی ئینگلیزی، ١٨١٥ – ١٨٨٢) کە ببڕابـڕ دیکـنزی بـە دڵ نـەبوو بـیروڕای وا بـوو کـە ڕۆمـان ئامرازێکـە بـۆ وتـنی دەرسـێک سەبارەت بە کردەوەی دروست. تەنانەت تامس هاردی چەند ساڵێک دواتـر ڕایێک بەم نێوەرۆکەوە دەردەبڕێ کـە: مەبەسـتی ڕاسـتەقینەی خوێندنـەوەی چیرۆک، یانی فێر بوونی درسـێک سـەبارەت بـە ژیـان، بـەرین کردنـەوەی ڕوانگەی فیکر لە توخمە پێویستییەکانی گێڕانەوە و هەر وەها لەو فیکرانـەدا کە ئەم توخمانە پێکدێنن.

دەسا بەم چەشنە بۆمان دەردەکەوێ کە روانگەکانی کلاسیک سەبارەت بە رۆمان لە سەردەمی ویکتۆریاشدا هەروەها مابوونەوە.
جۆرج هێنری لووئیس (رەخنەگری ئینگلیزی، ١٨١٧- ١٨٧٨) کە بە بێگومان هەڵکەوتەترین تیۆرسازی ئینگلیزی زەمانی پێش هێنری جەیمزە، کاتێک کە دەڵێ نابێ لایەنە ناحەز و پیسەکانی ژیان لە رۆماندا وێنا کەین، چونکە لەو دۆخەدا ناتوانین هاودەردی خوێنەر ختووکە بدەین و لەم رێگەوە هەڵچوون و داچوونی هەستەکانی زیاد بکەین، لەراستیدا هەمان قسەیێک دووپات دەکاتەوە کە جاروبار لە رەخنەی دەورەی ئۆگۆستدا ئاماژەی پێکراوە. لووئیس بیرورای وایە کە هونەر نابێ سەرقاڵی کاری ناڕاستەقینە بێ، بەڵکوو لە جیاتی ئەوە دەبێ راستەقینە بکاتە «ئاواتەخوازی» ئینسان تاکوو لەم رێگەوە ئیلهامدەر و پەرەپێدەری هەرە بەرزی هێزە زەینییەکانی ئینسان بێ. بە گومانی ئەو تەنیا هەر لاسایی کردنەوەی سروشت، بە تەنهایی هەستی جوانی بە رۆحی ئینسان ئاوێتە ناکات. ئەو لە کتێبی *بناغەی سەرکەوتن لە ئەدەبدا* (١٨٦٥) سەبارەت بەم مەبەستە باس دەکات کە ریئالیزمی ئاوەکی هەر بە پێ و شوێنی نیشاندانی راستەقینەی دەرەوەی کارەکانەوەیە، لە حاڵێکدا ئایدیالیزم (ئارمانج خوازی) حەول ئەدات راستینەی ناوەکی و دەرەکی ئاشکرا بکات. بەم پێیە، ئایدیالیزم چەشنی ریئالیزم و بناغەی هەموو قاڵبە هونەرییەکانە کە دژەکەی خەیاڵ خوازی نیە، بەڵکوو درۆسازاندنە.
جەخت کردنی لووئیس لە سەر ئەوەی کە ئەدەبی چیرۆکی دەبێ هەم راستینەی ناوەکی و هەم راستینەی دەرەکی ئاشکرا بکات دەبێتە هۆی ئەوەی کە ئەو بایەخێکی زۆر بۆ کەسێتی سازاندنی دەروونی دابنێ. شێوازی دڵخوازی ئەو بۆ ئەم مەبەستە نیشاندانی شانۆ ئاسای کەسێتی ـ یان

خۆی وتەنی: خـۆ دوانـدنی نـاوەکی «مۆنۆلـۆگ»ی شانۆئاسـایە ـ کـە لـەودا نووسـەر خووخـدەی کەسـایەتی‌یـەکان بـە سـۆنگەی ئاخـافتن و کـردەوەی ئەوانەوە ئاشکرا دەکات. بە متمانەوە دەتوانین بـڵێین بەرهـەمی راسـتەوخۆی تیۆرەکانی لووئیس رۆمانەکانی جۆرج ئەلیۆت بوو کە لەواندا خاڵە پێـشنیار کراوەکانی لووئیس سەبارەت بە هەڵچواندنی هەستی هاودەردی خوێنـەر و هــەروەها ریئــالیزمی نەرمــەوە کــراوە لــە رێگــەی کەســێتی ســازاندنی دەروونی‌یەوە لە بەرچاو گیراون (باوەکوو حوزووری بێژەر یـان بگێـڕەوەی رۆمانەکانی ئەلیۆت، زیاتر لەو رادەیە دێتە کایەوە کە تیـۆری خـۆ دوانـدنی ناوەکی «مۆنۆلۆگی» شانۆئاسایانەی لووئیس ئیزنی داوە) جـۆرج ئـەلیۆت لـە ئاخرەکانی تەمەنی خۆیدا بە کراس‌ی وتبوو کە لە لووئیس‌ەوە فێر بووە کـە نیــشاندانی شانۆئاســای کەســێتی نیــشاندەری بــەرزترین چۆنیــەتی ئــەدەبی چیرۆکی‌یە.

جـۆرج ئـەلیۆت چ لـە رۆمانەکانیـدا و چ لـە وتارەکانیـدا هەمیـشە لـە سـەر پێویست بوونی نیشاندانی شانۆئاسای کەسێتی وەکـوو کاریگـەرترین شـێواز بـۆ مەعنـەوی‌تـر کـردنی خوێنـەرەکانی لـە رێگـەی نموونـەی ئاکارییـەوە، جەختی کردبـوو (ئـەم خاڵـە بـە ئاشـکراترین چەشـنێک لـە بەشـی نێـوداری حەقدەهەم لە رۆمـانی *ئادەم بیـد*دا دەردەکـەوی) ئـەو سـتانداڵی بـە هـۆی کەڵـک وەرگـرتنی شـێوازی شـانۆیی هەڵدەکێـشا و لـە ساڵـی ١٨٥٦دا لـە وتارێکدا سەبارەت بە چارلز ریـد (رۆمـاننوس و شانۆنامەنووسـی ئینگلیـزی، ١٨١٤ـ ١٨٨٤)تەقریبەن ئـەم بڕوایـە دەردەبـڕێ کـە رۆماننوسـی سـەرکەوتوو دەبـێ هـەم لـە (شـیاوی سـەلبی بـوون)ی کیـتس‌دا (شـاعیری رۆمـانتیکی ئینگلیـزی) بـۆ ئەفرانـدنی کەسـێتی بەشـدار بـێ و هـەم لـە هێـزی خـەیاڵ کردنەوەی کولێریج بۆ لە قاوغدانی ئامێر و کەرەسەی کارەکەی. بەڵام ئەو

لەدەیەی ١٨٥٠دا ریئالیزمی پێ تاقانە بناغەی هونەر بوو. دوایین رۆمانەکانی ئەلیۆت، هەروەکوو رۆمانەکانی مێرێدیت (شاعیر و رۆماننووسی ئینگلیزی، ١٨٣٧ـ ١٩٠٩) کەمتر مەحاکاتی «لاسایی کردنەوەی سروشت» و زیاتر نیشاندەری کەم رەنگبوونەوەی راستەقینەن. هەردووی ئەم نووسەرانە لە دوایین ساڵەکانی خۆیاندا تێکۆشان شێوازێک لە نێوان ئایدیالیزم و ناتۆڕالیزم «سروشت خوازی»دا بدۆزنەوە.
یەکێکی دیکە لە رەخنەگران و تیۆرسازانی رۆمان لە سەدەی نۆزدەدا کە بە داخەوە کەمتر سەرنجی راکێشاوە و کەمتر لەبەرچاو بووە، دەیوید مەسن ە. ئەو لە بەرهەمی گەورە و هەتاهەتایی خۆیدا بە نێوی *رۆماننووسانی بریتانیایی و شێوازی ئەوان* لە ساڵی ١٨٥٩دا کە لە چەشنی خۆیدا، چەشنێ «لایەنەکانی رۆمان»ی سەدەی نۆزدەیە ـ بەم باسەوە کە رۆمان حیماسەیەکی پەخشانی‌یە یا دەتوانێ بێ؟ بەربەرەکانێی دژ بە ریئالیزمی خالیس، درێژە ئەدا و بە بیروڕای ئەو رۆمان دەبێ زیاتر لە بابەتی «سەرەکی» بکۆڵێتەوە، نەک سەبارەت بە ژیانی رۆژانە و بەزمەسات و داب و نەریتە باوەکان بێ. بەڵام مەسن بیروڕاگەلی گرینگتریشی هەیە وەکی ئەوەی «رۆمان لە چاو شیعر لێکدانەوەی جۆراوجۆرتر لە تەمەنی زوو تێپەڕی ئینسان بە دەستەوە ئەدات.»

دەسا رۆمان دەتوانێ هەمان جیددی بوونی پایەبەرزی شیعری هەبێ و ئەو رەخنەیەی لە سەر شیعردا دێتە ئاراوە دەبێ لە سەر رۆمانیش بێتە ئاراوە. مەسن لە وتارێکی بە نێوبانگدا سەبارەت بە دیکنز و تەکری (رۆماننووسی ئینگلزی، خاوەنی رۆمانی *یاوە بازاڕ*، ١٨٨١ـ ١٨٦٣) کە بە گشتی لە سەر جیاوازی نێوان چیرۆکی جەنگی، ئاشقانە و چیرۆکی ریئالیستی لە ئەدەبی چیرۆکی دایە، رەخنەیێکی «شیعری» بۆ شی کردنەوەی زۆر وردبینانەی

شێوازەکانی ئـەو دوو نووسـەرە بـەکار دەگـرێ. جـەخت کـردنی ئـەو لـەو چەشنەیە کە لە سەر پێوەندی نێوان مـەحاکات خـوازی چیرۆکـی و توخمـە ئاکارییـەکـانی ئـەدەبی چیرۆکـی لـە لایەکـەوە و خووخـدەی ئاکـاری رۆماننووس لە لایەکی دیکەوەیە. مەسن‌یش وەکوو زۆربەی پێشینانی خـۆی لە سەردەمی ئاگۆستدا بیروڕای وا بوو کە خووخدەی ئاکـاری رۆمـاننووس، کەم و زۆر لە سەر سروشتی ئاکاری چیرۆکەکانی کاریگەری دەبێ.

مەسن دەنووسی:

«رۆماننووس هەم خولقێنەری جیهانێکی دەستکردە و هەم رووداوەکانی ئەو دەئافرێنـێ. ئـەو یاسانووسـی دونیایەکـە کـە خـۆی ئافراندوویـەتی و رووداوەکانیشی دەگەیەنێتە کۆتـایی خـۆی و چارەنووسـی هەرکەسـێک بـە دادوەری دادپەسانەی خۆی دابین دەکات. بەم پێیە بۆمان دەردەکـەوێ کـە چۆنیەتی حوکماتی ئاکاری ئەو چەندە وەکوو شـێوازی حوکمـاتی ئاکـاری ئەو کەسانە وایە کە تێپەڕ بوونی راستەقینەی کارەکانیان بە ئەستۆوەیە، دەسـا لە لایەکەوە تـا چ رادەیـەک و بـە چ وردبـینی‌یەکـەوە سـەبارەت بـە ژیـان، لێکدانەوە و لێکۆڵینەوەی کردووە و لە لایەکی دیکەوە دەبـێ لـە پـاش ئـەم لێکدانەوە و لێکۆڵـینەوەیە، ئـەو ئەنـدامێکی بـە ئەمـەگی کۆمەڵـگای قـازانج هاوبەشـی ئینسانییە، یـان شۆڕشـییەکی بـێ بـاوەڕ بـە سروشـتی ئینسانە و لـە بوونەوەرانی کێویە.»

سـەرنجدانی لـەڕادە بـەدەری مەسـن بـۆ پێوەنـدی نێـوان ئاکـار و ریئـالیزم، دەنگدانەوەیەکی ئاشکرا لە بیر و راگەلی زاڵ بـە سـەر سـەردەم و زەمانـەی ئەودایـە، بەڵـام کاتـێ کـە جـەخت دەکـا هـەر ئـەو رەخنەیـەی بـۆ شـیعر دەنووسرێ دەتوانێ بۆ ئەدەبی چیرۆکـیش بنووسـرێ،لە راستیدا لـە گـەڵ رایەک سەبارەت بە رۆمان دژایـەتی دەکـا. رایـەکی هەڵقوڵـیو لـە بـیروڕای

نووسـەرانێکی جۆراوجـۆر بەڵـام گرینگـی وەکـوو واڵـتر سـکات، تـەکری، ترۆلێپ، راسکین و جان ستوارت میل. بەم پێیە کە رۆمان قاوغێکی هونـەری کـەم بایەخـە، دیـسانەکەش بـە سـووکایەتی روانـینی ئـەم نووسـەرە خـاوەن کاریگەری و دەسەڵاتانە لـە ئـەدبی چیرۆکـی، لـە دەیـەی ١٨٦٠دا جێگـەی خۆی ئەداتە رای جیـددیتری کەسـانێکی وەکـوو مەسـن،لـووئیس و چاڕلز کینگزلی. ئەمانە کە رۆمانیان پێ چەشنێکی ئەدەب بوو لە سەر بایەخی «سـێ چوکڵەی یەکێتی»ی شانۆ لە ئەدەبی چیرۆکیشدا جـەختیان دەکـرد، هێرشـی دژ بە «درۆ بڵاو کردنەوە»یان دەسـت پـی کـردەوە و دۆخێکـی جیـددیتریان دایە باس کردن سەبارەت بە بابەتی رۆمان. بەشـێکی زۆر لـەم هەڵـسەنگاندنە نوێیە سەبارەت بە رۆمان لە دەیەی ١٨٦٠دا، داهاتی پەیدا بوونی ریئـالیزم لـە فەرەنسادا و دژە کردەکانی بەرهەمی ئەو بـوو. رواڵـەتەن ئـەم دوو گەرایـشە دژ بە یەکە بەرەو چیرۆکی جەنگی، ئاشقانە و ریئالیستی زیاتر لە فلۆبێردا لـە حاڵی کێـشمە کێـشمدا بـوون. بـە جـارێ ئاشـکرایە کـە ئـەو بـە پێچەوانـەی مەیلێکی زۆر بۆ خـودی راسـتەقینە، لـە راسـتەقینەی خـالیس ـ یـانی لاسـایی کردنەوەی رووت و قووت یان لاسایی کردنـەوە و روونـووس هەڵـگرتنەوە لە راستەقینەی دەرەکی ـ بێزار بوو و خۆی وتەنی: «هونەرمەند دەبـێ هـەموو شتێ بەرەو سەرێ هەڵکێشێ» لە بۆ ئەویش وەکوو جۆرج ئەلیەت، رۆمان لە ئەساسـدا بـە هـۆی سـەرقاڵ بـوون لـە تـەک راسـتەقینەی ناوەکیـدا، جـوانی دەخولقێنێ. چۆنیەتی ئەم کـارە بـۆ فلـۆبێر شـایەنی بایـەخێکی تـەواوە. ئـەو سەرنجێکی یەکجار ئەداتە کێشەی فۆرم و تەنانەت زیـاتر لـە مەسـن بـڕوای وایە کە بەجێیە هەمان سـەرنجی جـوانی ناسـانە و شـیکارییەک کـە ئەدرێتـە تەکنیکەکانی شیعر، لـە بـۆ لێکدانـەوەی تـەکنیکی ئـەدەبی چیرۆکـیش بێتـە ئاراوە. بە ڕای ئەو، بایەخ و جوانی هونەر لە شێوازدایە.

فلۆبێر دەنووسێ: پێم دەڵێن لە رادەبەدەر سەرنج ئەدەمە فۆرم. بەداخەوە! کێشەکە وەکوو پێوەندی لەش و رۆح وایە، فۆرم و چەمک لە بۆ من بەشێکی یەکگرتوون و نازانم یەکیان بە بێ ئەوەی دیکە دەتوانێ چی بێت؟ هەڵە مەکەن، چەمک ئەوەندەی جوانتر بێ، ئەو زبانەی ئەویشی پێ نووسراوە خاوەن ئاهەنگترە. فیکری حەسێب بۆ کراو و ورد کاریگەرییەکی زۆرتر دادەنێ و «لە خودی خۆیدا بێج لەمە نیە.»

فلۆبێریش وەکوو جەیمز بابەتی چیرۆک و شێوازی نووسەری پێ پێویست و پێداویستی یەکدی‌یە و تەنانەت بە عەینی یەکیان دادەنی. مووپاسان سەبارەت بە فلۆبێر دەڵێ: لە بۆ ئەو، فۆرم یانی خودی بەرهەم، هەروەکوو خوێن، خواردەمەنی بە لەش ئەدا، فۆرمیش ـ یان بە لەونێکی دیکە رواڵەتی عەینی ئەندامی ئینسان ـ بە پێی تایبەتمەندی‌یەکانی رەگەز و بنەماڵە دابین دەکات، هەرئاوا بە لای فلۆبێرەوە بەرهەم یان بە مانایەکی دیکە مانای ناوەکی ئەو، بە چەشنێکی چارەناچار، رەنگدانەوەی دروست و تاک و تەنیای ئەندازە و کەش و هەوا و بە گشتی دوایین قاوغی فۆرم دادەسەپێنێ.»

فلۆبێر بڕوای وابوو کە زبانی نووسەر دەبێ بۆ زۆربەی مرۆڤی ئاسایی شیاوی لێ حاڵیبوون بێ، یانی بە دوور بێ لە هەر پێوەندی‌یەکی تەم و مژاوی جوغرافی و چینی کۆمەڵایەتی یان زەمانێکی تایبەت. یەکێ لە رێگەگەلی گەیشتن بەم شێوازە یەکدەست و بێ لایەنگرییە ئەمەیە کە نووسەر لایەنگری بێ سێ و دوو لە هیچ تێفکرینێ، مەرامێ یان ئارمانجێکی تایبەت نەکا. هونەر دەبێ بە قەدەر زانست رەنگێکی غەیرە تایبەتی هەبێ. (رەنگە بتوانین ئەم بیر وڕایانە وەکوو سەرتای ناتۆرالیزم «سروشت خوازی» دابنێین) دیسانەکەش فلۆبێر بڕوای وابوو کە پەخشان، باوەکوو عەینی بوونێکی پێویستە، دەتوانێ هەر وەکوو شیعر، مۆسیقایی و خاوەن کێش بێ:

«رستەیەکی باش بە پەخشان، دەبێ وەکی دێڕێکی باش لە شیعردا بێ، بە چەشنێکی دیکە نەتوانین بیگۆڕین و هەر بەم پێیە خاوەن کێش و ئاهەنگدار بێت.» بە رای فلۆبێر دەبێ لە چیرۆکدا هەروەکوو شیعر لە بنەماکانی زبانی بە پێویستی بارودۆخی تایبەتی هونەری کەڵک وەربگیردرێ.
بارودۆخی هونەری دڵخواز لە روانگەی فلۆبێرەوە دەتوانێ «کتێبێک بێ کە سەبارەت بە هیچ شتێ نەبێ، کتێبێک کە هیچ پێوەندی‌یەکی بە جیهانی دەرەکییەوە نیە، کتێبێک کە پێکهاتە و دارشتنی خودی شێوازەکەی دەبێتە هۆی یاسا و رێساکەی . . . کتێبێک کە دەکرێ بوترێ هیچ بابەتێکی نیە، یان لانی کەم بابەتەکەی ـ چما بکرێ ـ بە دیارەوە نیە.»
مایکڵسۆن بە دروستی وتوویەتی ئەو کاتەی فلۆبێر شێوازی مەحاکات خوازی هونەری دایە بەرگومان، بۆ یەکەم جار ئاواتی گەیشتن بە «بەرهەمێکی پشت ئەستوور بە خودی خۆی ـ بە خودی بەرهەم ـ درێژەدانەکەی بە پشت ئەستووری خۆی بی و خۆی، خۆی بسەلمێنێ» لە ئەدەبدا بە گوێرەیێکی یاسامەند و قورس و قایم وترا: «بە سۆنگەی ئاگەدار بوونەوەی گوتارساز لەو راستەقینەیەی کە ئیدی بۆ بەرهەمی خەیاڵی،لە بەرەوە دابین کراوە یان لە پێشدا هەبوونی نیە، بابەت یان کەسێتی نموونە وەلا دەندرێ و هونەر لە جیاتی مەحاکات (لاسایی کردنەوە) هەروەها خودی رێئالیزمیش، وەلا دەندرێ. هونەر ئێستا ریشەی راستەقینە و رەگی جێناوی هۆشیار،لە رێگەی هزر و حاڵیبوونەوە بە بابەتی وڵاتی خۆی دەزانێ [دەشگۆڕدرێتە سەر] دۆزینەوەی چۆنیەتی و لایەنەکانی فامست. چەمکی هونەر لە جیاتی جێناوی هۆشیار یا «حاڵیبوون» تایبەتمەندی بەشێکی گەورە لە تیۆری زاتخوازی هونەر سەر بە سروشتی خۆبوونی ئەدەبی چیرۆکی لە سەردەمی تازەدایە. لەم بەستێنەدا دەبێ ئاماژە بکرێ کە فلۆبێر یەکێک لە

یەکەم پەرە پێدەرانی نیشاندانی شانۆئاسای زەین لـە ئـەدبی چیرۆکیـدا بـوو. ئەو هەمیشە لە گەڵ بە فێرکار و راهێنەر ناوبرد کردنی ئـەدەب، یـان داسـتانە جەنگی ـ ئەویندارانەکان کە بیچمێکی پـڕ کارەسـاتیان هەیـە و هـەروەها لـە گەڵ «رەنگی ناوچەیی»دا بە تونـدی لـە نـاکۆکی و بەربەرەکانێـدا بـوو. ئـەو دەڵێ: «بۆ ئەوەی کـە هونەرمەنـد وێنەیـەکی خـاوەن راسـتینەی دونیـاگر بـە دەسـتەوە بـدات، پێویـست ناکـات چیرۆکێکـی دوور و درێـژ بگێڕێتـەوە ـ هەروەکوو لەوە پێشیشدا دیتمان ـ هەر پێویست ناکات چیرۆکێکـی بـۆ وتـن هەبێ، هەر ئەوەندە بەس دەروونی ئینسان بە مەبەستگەلێکی جیا لە فێرکاری و تا دەتوانێ بە بێ هیچ خـۆ تێهەڵـقورتاندنێ، پـێ نیـشان بـدات. یـەکێ لـەو رێگەیانەی کە نووسەر دەتوانـێ خـۆی لـە تێهەڵـقورتاندن بـە دوور ڕاگـرێ ئەمەیە کە بە گێڕانـەوەی زانـستەکان یـان بیرۆکـەکانی خـۆی سـەبارەت بـە گێرەو کێشەکانی رۆژانە و بارودۆخی ناوچەیی یا پاژەکانی دیکـەوە خـۆی نەنوێنێ.

فلۆبێر لە یەکەم کەسانێ بوو کە بە دەربڕینی ئەم خاڵە «نووسەری نادیـار» لـە ساڵی ١٨٥٢دا دەریبڕی کە بوونی نووسەر لە داستانەکەیدا دەبێ بـە تـەواوی دوورەچاو و شاراوە بێ، یانی ئێمە هەر ئەوەندە لـە بـیروڕای ئـەو سـەبارەت بەو کەسێتییانەی خوڵقاندوویە بە ئاگا بین کە لە بیروڕای خودا سەبارەت بە مەخلووقاتەکەی بە ئاگاین: «نووسەر لە چیرۆکەکەیدا دەبێ وەکوو خودا لـە جیهانـدا، لـە هـەموو جێگەیـەک هـەبێ،بەڵـام لـە هـیچ کـوێ دیـار نـەبێ.» رۆماننووس «دەبێ کاری خـودا لـە کـاتی خوڵـقاندندا بکاتـە نموونـە، یـانی هەنگاو [ بۆ خوڵقاندن ] هەڵبێنێتەوە و بێدەنگ بێ.» بە بڕوای فلۆبێر نووسـەر نابێ بیروڕای خۆی دەربڕێ، چما خوێنەر خاڵی ئاکـاری مەبەسـتی نووسـەر

وەرناگرێ، هۆیەکەی یان نەفامیی خودی خوێنەرە و یان خودی چیرۆکەکە «پێوەندی‌یەکی بە راستییەوە نیە و دەسا پووچ و بەتاڵە».

ئێمیل زۆلا (رۆماننووسی فەڕەنسی، ١٨٤٠ـ ١٩٠٢) لە پێشەکی‌یەکدا بۆ چاپی دووی یەکەم رۆمانەکەی لە ساڵی ١٨٦٨دا تیۆری فلۆبێر سەبارەت بە بێ‌لایەن بوونی نووسەر شەقاوێکی دیکە دەباتە پێشەوە و تیۆرییەکی هێنا ئاراوە کە لە پاشان بووە هۆی یەکێتی لایەنگرانی ناتۆرالیزم لە ئەورووپادا: یانی خاڵی «بە پرسیار بوونی زانستی رەها.» زۆلا دەڵێ: «ئەو لە پلەوپایەی چیرۆکنووسیدا، تەنیا هەر ئەو کارە شیکاریانەی لە گەڵ لەشی زیندوودا کردووە کە جەڕڕاحگەل لە تەک لەشی بێ رۆحدا دەیکەن.» ئەو ساڵانی دواتر رایەکی چارەنووس سازی دیکەی لە خاڵی نقیساری سەرەوە زیاد کرد: «کەڵکی کۆمەڵایەتی ناتۆرالیزم یان سروشت خوازی».

تازە و نوێ بوونەوەی تیۆرەکانی فلۆبێر سەبارەت بە ئەدەبی چیرۆکی هەروەکوو تیۆرەکانی هێنری جەیمز، بە گشتی لەوەڕا دێتە ئاراوە کە ناوەرۆک و ماناگەلی جیاوازیان لە گەڵ تیۆری رۆمان لە سەرەتای سەدەی نۆزدەدا هەیە. فلۆبێر یەکەم نووسەر بوو کە تیۆرییەکی یاسامەند و زۆرکاربورد هەڵگری سەبارەت بە رۆمان راڤە کرد. لە تیۆری ئەودا زیاتر سەرنج ئەدرێتە ئەو پێوەندییەی کە ئەندامگەلی پێکهێنەری ئەفراندنی جوانی لە تەک یەکدیدا و لە گەڵ کۆی بەرهەمدا هەیانە، نەک سەرنجدان بۆ دەوری ئاکاری هونەر. هەر بەم هۆیەوە فلۆبێر بە یەکەم تیۆرسازی «مۆدێڕن»ی رۆمان دادەنێن.

باوەکوو هەڵکڕاندنی حاڵیبوونێکی گشتی لە تیۆری رۆمان کارێکی دژوارە، بەڵام دەکرێ بوترێ تایبەتمەندی‌یە گشتییەکانی ئەمانەن: بۆچوونێکی زاتخوازانە، جاروبار دیاردە ناسانە و زۆر کەم دەقاودەقیان لەفۆڕم هەیە و

زیاتر بایەخ ئەدەنە نەریتـەکانی دەرهەسـتکاری نووسـینەوە، نـەک چۆنیـەتی ئاکاری بنەمای ڕۆمان.

لەتیۆری مۆدێڕنی ڕۆماندا «ریئالیزم» زۆرتـر بـۆ چـەمکی دووبـارە ئافرانـدنی حاڵاتی زەینی دێتە گۆڕێ، نەک لاسایی کردنەوەی ڕووداوەکـانی جیهـانی دەرەکی. فلۆبێر هەروەکوو گوتیە بیروڕای وابوو کە زاتخواز بوونی کامـڵی هونەری هەر بۆ خۆی بۆ پاساودانەوەی ئاکـاری ئـەدەب کیفایـەت دەکـات. ڕۆلان بارت (زبان ناس، فەیلەسووف و تیۆرسازی ئەدەبی فەڕەنسی، ١٩١٥ـ ١٩٨٠) ئەم بابەتە ئاوا دەردەبڕێ: «فلۆبێر لە ڕێگەی بـەرز کردنـەوەی کـاری ئەدەب بۆ پلەوپایەی چەشنە بایەخێک، ئاخرێکەی تـوانی «بابـەت»ی بـوونی ئەدەب بـسەلمێنێ. دەسا فـۆڕم ـ هـەروەکوو کاسـە گـڵێنەیەک یـان پارچـە جەواهیرێک ـ بووە دەسـکەوتی توانـایییـەکی لێزانانـەی هونەرمەندانـە . . . گشتی ئەدەب لە سەردەمی فلۆبێرەوە تاکوو هەنووکە بووە لێکۆڵـینەوەیەک سـەبارەت بـە کێـشەی زبـان.» لێـرەدا بـارت هـەروەکوو ئێنـت مایکلـسۆن، فلۆبێری پێ سنووری نێوان شێوازی پێشووی چیرۆکنووسین لە گەڵ شێوازی تازە دایە. «شێوازی زاتخوازی بوونی هونەر».

ئەو شتەی بارت سەبارەت بە فلۆبێر دەیڵێ سەبارەت بـە هێنـری جـەیمزیـش دەیگێڕێتەوە. تیۆریەکانی جەیمز سـەبارەت بـە ئـەدەبی چیرۆکـی و بنـەمای فـۆڕم، هێنـدە بەربـڵاوە کـە لـەم نووسـراوەیەدا دەرفـەتی ئـەوەمان نیـە بـە چەشـنێکی هەمـە لایەنـە بیینـە سـەر لێـدوانی ئـەوان. بـاوەکوو دەکـرێ لـە پەڕاوێزدا هێما بکـرێ کـە خاڵـە سـەرەکیەکانی ڕای جـەیمز و فلـۆبێر تـا چ ڕادەیــەک لێکــدەچن. جــەیمز هــەروەکوو فلــۆبێر جــەخت دەکـا کــە چیرۆکنــووس دەبــێ تایبەتمەنــدی دەروونی کەســێتییەکان بــە شــێوازێکی شانۆئاسا پێ نیشانی خوێنەر بدات، پێداگری هـیچ فەلـسەفەیێکی تایبـەت لـە

هونەردا نەبێ، لـە گێڕانـەوەی چیرۆکـدا، لـە دادوەری کـردن سـەبارەت بـە کەسێتییەکان و رووداوەکان خۆ بپارێزێ. ئەویش شێوازی نووسینی خۆی بـە وردی لە گەڵ ئەو بابەتەی بە دەستییەوەیەتی رێکـدەخات. جـەیمز وەکـوو فلۆبێر شێوازی نووسەر لە گەڵ ئەو چەمکەی کە بابەتی بەرهەمی ئـەوە، وای دادەنـێ لـە یـەک جیـا نابنـەوە: «بەوەیـڕا کـە هەرچەنـدە بەرهـەمێک سەرکەوتووتر بێ چەمکی [ لەبەرچاو گیراوی نووسەر ] هـەموو لایەنـەکانی ئەو وەخۆ دەگرێتەوە و فۆڕم و دەروونی ئەداتێ، بە چەشـنێک کـە هـەرکام لە وشەکان و هەرکام لە نیشانە رێزمانییـەکان (علامـات سـجاوندی) بـە سـەر چۆنیەتی دەربڕینی بابەتەکەدا کاردانەوەی دەبێ، دەیجا هەر بەو رادەیە ئێمە لە یادمان دەچێ کە چیرۆک شیرێکە کە بۆی دەچێ کـەم و زۆر لـە «جـێ شیر» دەرکێشرێ. رووداوە و رۆمان و چەمک وفۆڕم لـە حـوکمی دەرزی و دەزوو دان و مـن هـیچ کاتـێ نەمبیـستووە کـە خـەیاتێک لـە دەزووی بـێ دەرزی یان لە دەرزی بێ دەزوو کەڵک وەربگرێ.»

رایەکانی جەیمز لێرەدا بە چەشنێکی سەرسووڕهێنەر وەکی وتـەکانی فلـۆبێر «لـە لاپـەڕەکانی پێـشوودا» وایـە، بەڵـام بـڕێ جیـاوازیش لـە گۆڕێدایـە و هەردووکی ئەم نووسەرانە زیاتر بایەخ ئەدەنە ئـەو پێوەندییـەی نێـوان دەق و چەمکی باسکراو، نەک دەق و خوێنەر. بەڵام فلۆبێر سەرقاڵی پێوەندی نێوان شێواز «هەڵبژاردنی وشەکان، فۆڕم و . . .» لە گەڵ چەمک و بابەتە، ئەمـەش بە لەونێک هەمان دەمەتەقەی مێژوویی هوڕاس سەبارەت بە بابەتی بەرهەم و زبـانی گێڕانەوەیـە. جـەیمز لـە عـەینی هێمـا کـردن بـۆ بایـەخی شـێواز، لێکدانەوەیەکی کەم و زۆر جیاوازی هەیە کە بناغەی لە سەر پێوەندی نێـوان رووداوە «تـۆوی بـیچم، رووداوەکـانی چـیرۆک» لـە گـەڵ رۆمـان «وەڕاستگەڕانی رووداوە وەکی گێڕانەوەیەک». دیسانەکەش ئاوڕدانەوەی لە

ڕادەبەدەری هەر دووکی ئـەم نووسـەرانە بـۆ لایەنـەکانی جـوانی ناسـەکی ـ نەک ئاکاری ـ چیرۆک نووسین بە ڕوونی خۆیای دەکات کە ئـەوان زیـاتر لەوەی بە شـوێن لـە یـەکچوونی تـەواو عـەیاری ڕاسـتەقینەدا بـن، دەخـوازن بەرهەمەکانیان لە لایەنی هونەرییەوە زاتخوازانە بێ. ڕوانگەیەک کە من پێـی دەڵێم «بیرۆکەی مۆدێرن»ی ڕۆمـان لـە ئێـرەوە دەسـت پـێ دەکـا. هەڵـبەت وتـەکانی جـەیمز سـەبارەت بـە ڕۆمـان جاروبـار دەنگدانـەوەی بیرۆکـەی نووسەرانی بەر لە ئەوە. بۆ وێنە ڕای ئەو لە سەر ئەوەی کە ڕۆماننووس دەبێ خۆی بە ڕاستی بە مێژوونووس دابنێ و وایدانەنێ بەرهەمەکـەی چیرۆکێکـی ڕاستەقینە نیە، ڕایەکە کە لە پێش جەیمزدا، لیتین لە ساڵی ١٨٣٧دا دەریبڕیوە. مێرێدیت زۆر جار وتبووی بـیروڕای وایـە کـە چیرۆکنـووس دەبـێ لـە دوو شـێوازی گێڕانـەوەی وەسـف ئـامێز و دیمـەنی شانۆئاسـا بـە نـۆرە کەڵـک وەرگرێ، بەڵام هەوڵ بدا تا ئەو جێگـەی دەکـرێ دیمـەنی شانۆئاسـا کـەمتر کەڵکی لێ وەربگـیردرێ. جـەیمز ئـەم نەریتـەی لـە زۆربـەی چیرۆکـەکانی دوای ١٨٨٠دا هێنایە کەڵک لێ وەرگرتن و لە دواتردا لـە پێشەکی ڕۆمـانی باڵوێزەکاندا ئەمەی بە خاڵی سەرەکی چیرۆکنووسین لـە قەڵـەم دا. جـەیمز دایەلۆگ و باس و خواسی زۆر و سەرنج ڕاکێشی سەبارەت بە «گۆشە نیگا» هەبوو و دائیمـە جـەختی لـە سـەر ئـەوە دەکـرد کـە کەڵـک وەرگـرتن لـە ڕوانگەی بەرتەسکی زەینی بە هەستی کەسێتی‌یەکی یەکە، قانزاج و بەهرەی زۆری بۆ چیرۆک هەیە. لەم بابەتەوە ڕایەکانی جەیمز زۆر تازەن.

بـەم چەشـنە بۆمـان دەردەکـەوێ مەبەسـتی ئاکـاری نووسـەر، بناغـەی بیرۆکـەکانی ئـەدەبی جـەیمز پێکناهێنـێ، بەڵـکوو ئـەو هەمیـشە سەرقاڵـی بنەماکانی جوانی ناسەکی هونەری چیرۆک نووسییە. هەڵبەت ئەمە بە واتـای بایەخ نەدانی جەیمز بۆ ئاکار یان ڕاستەقینەکان نیە، ئەو بە شوێن دۆزینەوەی

باشترین ڕێگە بۆ دووبارە ئافراندنەوەی لایەنی دەروونی ژیانی کەسێتییەکانی و لە لێکدانەوەی رۆماندا وەکوو چەشنێکی ئەدەبی زیاتر بایەخ ئەداتە جوانی ناسی و کەمتر مەیلی بۆ ئاکار هەیە. جەیمز لە روانگەکانی جوانی ناسی خۆی بۆ مەبەستی دادوەری ئاکاری کەڵک وەردەگرێ، بەڵام ئەو روانگانە ـ بە هۆی سەرنجی زۆری ئەوەوە بۆ پرۆسەی ئافراندنی هونەری ـ چارەناچار تایبەتمەندییەکی غەیرە ئاکارییان هەیە (هەر وەک روانگەکانی فلۆبێر) جۆرج ئەلیۆت بڕاوی بە ریئالیزمی دەروون ناسەکی هەبوو، چونکە بە گومانی ئەو سەرنجی ورد و هاودڵانە بۆ ژیانی ژنان و پیاوانی ئاسایی باشترین شێوازی راکێشان و توند کردنی حەساسیەتەکانی خوێنەرانە. بەڵام بڕوای جەیمز بە ریئالیزمی دەروون ناسەکی زۆریش لە بەر مەبەستی توند کردنی هەستی هاودڵی خوێنەران نیە،بەڵکوو زیاتر لە بەر ئەوەیە کە بە رای ئەو کاتی لە شێوازی ریئالیزمی دەروون ناسەکی کەڵک وەردەگیردرێ و هەستی هاودڵی خوێنەر توند دەکرێ رۆمان دەگاتە باشترین ئاستی درەوشانەوەی هونەری خۆی. باوەکوو جەیمز لە چیرۆکەکانیدا سەرنجدانی بۆ لایەنەکانی بەردەستوچاو و تایبەتی ژیانی ئینسان هەیە، بەڵام لە پلەوپایەی چیرۆکنووسیدا زیاتر سەرنج ئەداتە یاساوڕێسای دەرهەستکاری و کامڵ بوونی هونەری. لەم بارەوە بیروڕای ئەو ـ هەروەکوو بیروڕای فلۆبێر ـ پێشەکی و سەرەتایەکە بۆ نێوەرۆکی زۆربەی تیۆرەکانی رۆمان لە سەدەی بیستەمدا. وتارەکانی جەیمز و هەروەها پێشەکی گەلێکی رەخنەگرانە کە لە سەر رۆمانەکانی دەینووسی هەموویان رۆشنکەرەوەی ئاگەداری و خاوەن ڕا بوونی ئەو بە سەر کێشە جۆراوجۆرەکانی کارەکەی لە پلەوپایەی هونەرمەندێکی تێکۆشەر و داهێنەر دایە. لە دۆخێکدا ڕادەربڕینی جۆرج ئەلیۆت سەبارەت بە رۆمان

زۆر کات تامەزرۆیی زۆری ئەو بۆ باش کردنی ژیانی ئینسانەکان لە ڕێگەی هونەری حیکایەتخواز و مەحاکاتی‌یەوەیە. چما رۆمانەکانی جۆرج ئـەلیۆت و جەیمز خاڵی هاوبەشی زۆریشیان هەبێ ـ وەک ئەوەی راسـت و دروسـتی کارەکە بێج لەمە نیە ـ لە زۆربەی کارەکاندا سـۆنگەی داهێنـان و ئافرانـدنیان تەواوەن جیاوازە. هەڵبەت هەر کەسێ لە لێکچوونەکانی جۆراوجۆری نێـوان رۆمانی *میدل مارچ* یا *دانییل درۆندی* و رۆمانی *وێنەی خاتوونێک*دا دەتوانـێ حاڵی بێ کە جەیمز زۆر کاریگـەری جـۆرج ئـەلیۆتی بـە سـەرەوەیە، بەڵـام زیاتر لە هەموو شتێ جەیمز تامـەزرۆی ئـەو ئەگـەر و ئیمکاناتـە روو لـە زۆر بوونەوە بوو کە چیرۆکەکانی جۆرج ئەلیۆت پێ نیشانیان ئەدا کە هونەرمەند ئەتوانێ لـەو شـتە کەڵـک وەرگـرێ. هـەر بـەم هۆیـەوە دەبیـنین جـەیمز لـە دەربڕینی رای خۆی سەبارەت بە چیرۆکی *دار تییەبرووک* لە *میدێل مارچ*دا دەڵێ: «بە رواڵەت ئەو دۆخـە هـەرگیز هـەتا دوایـین رادەی گونجـاو درێـژ ناکرێتــەوە». جــەیمز هەمیــشە مــەیلێکی زۆری بــۆ لایەنــەکانی هونــەری چیرۆکنووسین بوو و دەسا *وێنەی خاتوونێک*ی هەر بەم سۆنگەوە نەنووسـی کە شەیدای ئاشکراسازی هەڵچوونی لایەنی دەروونی کەسـێتی (نێـوەرۆک و سووژەی لە بەرچاوگیراوی جۆرج ئەلیۆت) لە رۆمانەکانی *میدێل مـارچ* و *دانێیل درۆندی*دابوو، بەڵکوو هەروەها بەم هۆکارەوە بوو کە بە تەمابوو بزانێ تاکوو چ رادەیەک دەتوانێ ئەم سووژە و بابەتە درێژە بدا.

سەردەمی بە ئیستلاح «لاڕێیی رۆمانتیزم» کار تێکردنێکی ژیان بەخشی خـۆی لە دوا ساڵەکانی سەدەی نۆزدەهەمدا» لە راستیدا چەند ساڵ لـە پـێش وادەی چاوەنوارکرواوا» بە سەر تیۆری رەخنەی رۆماندا دانـاوە. «هونـەر بـۆ هونـەر» کەگۆتیە ئەوی هێنا قسە و باسەوە، تەنیا دروشمـی ئـەو سـەردەمە نـەبوو، بـە پێچەوانــەوە بەرهەڵــست بــوونی نووســەرانی ئینگلیــزی دژ بــە نــاتۆرالیزمی

ئەوڕووپی «کە هەڵبەت نووسەرانێکی هەڵکەوتەی وەکی گیسینگ مۆر، جەیمز، هاردی، گاس لەودا هاوبەش بوون» ئاکامەکەی سەر لە نوێ بووژانەوەی ژیانی بێ هێزی ئەو جۆرە ئایدیالیزمە ئەدەبە بوو کە بولوێر- لیتن نیوسەدە پێشتر پەرەی پێ ئەدا. ئەو بڕوای وابوو کە رۆماننوسان دەبێ وێنەیەکی کاڵ کراوەوەی راستەقینە لە رۆمانەکانیاندا پێ نیشان بدەن، بەڵکوو لەم رێگەوە بنە هۆی سەرقاڵ بوونی خوێنەران. بووژانەوەی تامەزرۆیی بۆ بیچمی چیرۆک ـ کە خوێنەران لەمەو بەر بە نووسراوەکانی بەجێت ویلکی، کالینز و هاوفیکرانی ئەوانەوە دەستی پێکردبوو ـ لە بەرهەمەکانی کیپلینگ، ستیوێنسن، سێنتێسیبۆری و دیتراندا دیسانەکەش بڕێ حەقانییەتی خۆی وەدەست هێناوە. بڵاو بوونەوەی دووبارەی چیرۆکە گاڵتەجاڕییەکان بووە هۆی ئەوەی ترالێپ، جۆرج ئەلیۆت و جەیمز لە دەیەی نەوەددا بە توندی رەخنەیان لێ بگرن و بەڵکوو توندترین هێرشی دژ بە ریئالیزم، لە وتارە ئەدەبییەکانی لێزنی ستیون‌دا کرا و رۆماننووسەکانی هاندا پێشوازی دیزرایلی و تێکەڵ کردنی لایەنە نامۆ و دیوناسەکانی ژیان لە رۆمانەکانیاندا بکەن. هەر لەم ساڵانەدا بوو کە تامس هاردی و دیتران شکایەتیان لەوە بوو کە مژکە «ئارمانجی کردنی کەسێتی‌یەکان»، لە راستیدا بەم واتایەیە کە هێندە ئەوان راستەقینە نیشان ئەدەین کە هەبوونیان نامومکین دەکەین». بە بڕوای هاردی، ئارمانج خوازەکان وەها بە درێژەدادڕی و مەیل و میهرەبانی‌یەوە کەسێتی‌یە باشەکانیان دەڕازێننەوە کە خوێنەر ئیدی هێزی خەیاڵی خۆی وەگەڕ ناخات. تایبەتمەندی ئەم جۆرە کەسێتییانە بە هەموو پاژەکانیانەوە نیشان ئەدرێ، لە ئاکامدا هیچکام لە کردەوەکانیان بۆ خوێنەر سەرسووڕهێنەر نیە و زۆری پێ ناچێ کە تامەزرۆیی خوێنەر بۆ ئەوان تەواو دەبێ، بەڵام لە عەینی حاڵدا هاردی لایەنگری ریئالیزمی خالیس نەبوو. ئەو

لە ساڵی ١٨٩٠دا ئەم ڕستەیەی لـە دەفتـەری یادداشـتەکانی خۆیـدا نووسـی: «هونەر بریتییـە لـە نـاڕێژەیی کـردنی ڕاستەقینەکان (یـانی گـۆڕینی فـۆڕم و ئەندازەکانیان یان لـە میـزان وەدەرنانیـان). بـۆ مەبەسـتی ڕوونتـر نیـشان دانی لایەنە گرینگەکانی ڕاستەقینە چما هەر ڕوونووسی کرێنەوە یان پێرست ئاسا ڕاپۆرت بدرێن، گریمانەیەکی بێ هێزە کە پەسـند و لـە بەردڵـان بـن، بەڵـام زیـاتر وێـدەچێ نەدیـدە دانـدرێن، لـەم لایەنـەوە ڕیئـالیزم هونـەر نیـە». بـەم حاڵەشـەوە لـە جەنگـەی ئـەم هەمبـەر بوونەوەیـەدا دەنگـی تێکـەڵ بـوونی ڕیئالیـستە سـەلەفییەکان و جـوانی ناسـانێکی تـازە پێگەیـشتوو کـە لـە زاتخوازبوونی هونەری ڕۆمان لایەنگرییان دەکرد، هێشتاش هەر دەبیسترا.

لە دەیـەی ١٨٩٠دا دەنگـی وێـرنن لی لـە هـەمووان بـەرزتر بـوو. وێـرنن لی یەکێکی دیکە لـە تیۆرزانـانی گومنـاو بەڵـام ئـەوتۆی ڕۆمانـە. ئـەو لـە پـاش بڵاوبوونەوەی یەکـەمین وتـارە گرینگـەکانی جـەیمز لـە دەیـەی ٨٠دا، لـە نووسراوەکانیدا باس لەسەر بابەتگەلێک دەکات کـە لـە دواتـردا جـەیمز لـە سەرەتا و پێشەکی ڕۆمانەکانی لە نیۆیۆرکدا باسیان لە سەر دەکـات ـ وێـرنن لی ئـەو نووسـەرانەی کـە لـە ڕێگـەی جـۆری دۆزینـەوە و بـە شـێوازێکی نـەهێنیئـامێز، ژیـان ئەدەنـە کەسـێتییەکانیان، بـە سـەر ئـەو نووسـەرانەدا کـە ئاگادارانەتر کەسێتییەکانیان پـەرداخت دەکـەن و ئـەوان دەکەنـە «وێنـەکانی گشتی ژیان» هەڵدەبژێرێ ـ نووسەرانی تاقمی دوایە زیاتر و زۆرتر ڕوانگەی «گێڕانەوەی ڕاستەوخۆ» لە کار دەکەن کە لە کەسێتییەکەوە بـۆ کەسـێتییەکی دیکە دەگۆڕدرێ و هاوناسنامەیی نووسـەر و هـەرکام لـە کەسـێتییە گرینگـە سەرەکییەکان بە هەستی ئەوین یان بێزارییەوە نیشان ئەدات. لەم شێوازەدا کە بە ڕای وێرنن لی بەهێزترین شـێوازی گێڕانەوەیـە، نووسـەر لـە چارەنووسـی یەکبەیەکی کەسێتییەکانی گرینگی چیرۆکدا هاوبەشە و لە گەڵ هـەر کـام

لەواندا دەبێتە هاوشوناس و بەم لەونە وا دێتە بەر نیگا کە روانگەی خودی نووسەر بە جارێ کاڵ بۆتەوە. ئەم کارە بە بیروڕای وێرنن لی تەشقی هونەری ئەدەبی چیرۆکییە و نموونەکانی ئەوە لە زۆرینەی بەرهەمەکانی تۆلستۆی‌دا وەبەرچاو دێن. وێرنن لی‌ش هەروەک فلۆبێر و جەیمز باشترین فۆرمی گێڕانەوە بە گێڕانەوەیەک دەزانێ کە نووسەر لەودا دیار نەبێ. کاتێکیش سەبارەت بە گۆشەنیگای گێڕانەوە قسان دەکا، وتەکانی سەرەتایەکە بۆ بڕێک بابەتی تایبەت کە جەیمز لە پێشەکی گەلێکی رەخنەگرانەدا بۆ چاپی رۆمانەکانی لە نیۆیۆرک و لە پاشان پێرسی لابێک (رەخنەگری ئینگلیزی، ١٨٧٩ـ١٩٦٥) کە لایەنگری بیروڕای جەیمز بوو لە کتێبەکەی خۆیدا بە ناوی *«تەکنیکەکانی چیرۆکنووسین»*دا لە سەری کۆڵیوەتەوە:«ئەم بابەتە لە کامڵ کردنی رۆماندا بە وردی ئەوەندە گرینگە کە لە شێوەکاریدا. باس کردنی من سەبارەت بە هەڵبژاردنی گۆشەنیگا لە لایەن شێوەکارەوە سەبارەت بە گرینگترین بابەتێک کە سەناعەتخوازی ئەدەب دەبێ لەودا دەست بکاتە هەڵبژاردن (یانی هەڵبژاردنی روانگەیەک کە کەسێتییەکان و رووداوەکانی رۆمان لەوێڕا دەبیندرێن) لەوەشدا هەروایە، چونکە هەر کەسێتی یان رووداوێک لە چەند رێگەی جیاوازەوە و لە پێوەندی لە گەڵ چەند کەسێتی و رووداوەی دیکەدا دەتوانین ببینین. کەسێتی لەبەرچاوگیراو لە روانگەی هیچ کەسەوە یان لە روانگەی یەکێکی دیکە لە کەسێتییەکان یان لە روانگەی نووسەرێکی لێکۆڵەری خاوەن دادوەرییەکی هزرەوە دەتوانین بدینین.»

جەیمز لە دوایین دەیەی ژیانی خۆیدا زیاتر لە سەر ئەم بابەتە دەدوا کە نووسەر دەبی کامە گۆشەنیگا هەڵبژێرێ و خوێنەر دەبێ خاوەن کامە گۆشەنیگا بێ. وێرنن لی لە باس کردنی وتەی گێڕدراوەی سەرەوەدا

هەروەکوو زۆربەی باسەکانی سەبارەت بە هونەری گێڕانەوە وەکوو جەیمز، چیرۆکنووسین لە گەڵ شێوەکاریدا بەراورد دەکات. بـاوەکوو ئـەو بـاس لـە سەر هەمان ئەو بابەتانە دەکات وا کەمێ لە پێش ئەودا، جەیمز باسی لە سـەر کردبوون، دیسانەکەش ناتوانین بە واتای ڕاست ودروستی وشە وێرنن لی بـە موریدی جەیمز دابنێین. ڕاست بە پێچەوانەوە، ئـەو «شـێوازی شانۆئاسـا» یـان شـانۆیی بـە تونـدی وەبـەر ڕەخنـە دەدا و دەڵـێ: «لـە ڕۆمانـدا دەتـوانین لـە ناتۆرالیزم نزیک بینەوە بەڵام نابێ لاسـایی شـێوازەکانی شـانۆیی بکەینـەوە.» وێرنن لی دژ بە نیشاندانی شانۆیی کەسێتییەکانە. یەکیان بـەم هۆکـارەوە کـە کار تێکردنی ئـەم شـێوازە لـە تـەک هەڵـکڕاندنێک کـە خوێنـەر لـە بەشـی گێڕانەوەییدا لە کەسێتییەکانی وەدەست دەخا، دژایەتی هەیە. ئـەو لـە تـەک جەیمز و مێرێدیتدا هاوڕایە کە دەبێ کـەمتر لـە دیمـەنی شانۆئاسـا کەڵـک وەربگیردرێ و ئەو شـتە بـە بەشـێ لـە «هێـزی وەکۆوەبـووی ڕووداوەکـانی ڕۆمان» بزانین.

بیروڕاکانی وێرنن لی سـەبارەت بـە ئەگـەری بەکـەماڵ گەیانـدنی فـۆڕم لـە ڕۆماندا برێ جار وەکوو بیروڕای فلۆبێر دەچێ. ئەو بڕوای وایە ڕۆمان دەبـێ وەکـی سـەمفۆنی یـا ئـۆپێرا بنووسـرێ بـە لـەونێک کـە سـووژەگەلی دووپاتەوەبووی سەرنج ڕاکێش بە درێژایی ڕۆمانەکە، کاریگەری هاودەنـگ و هەوا بە سەر خوێنەردا دابنێن. ئەو نیـشاندەرەی (نمـودار) کـە خولانـەوەی کامـڵبوونی فیکرەکـان، نوکتـە وردەکـان و وشـە جۆراوجۆرەکـانی ڕۆمـان نیشان ئەدا دەبێ بازنەیەکی کامڵ و نیشاندەری ڕەهای ئەندام ئاسـای فـۆڕمی ڕۆمان بێ. هەر بەم هۆیەوە وێرنن لی جەخت دەکا کە نووسەر دەبـێ یـەک بە یەکی وشـەکان بـە وردی هەڵـسەنگێنێ و لـەو وشـانەی کـە لـە دەرەوەی بازنەی ناوبراودان کەڵـکیان لـێ وەرنـەگرێ: «بنـەمای کتـێبی کـامڵ هـەمان

پێوەندییەکی لە گەڵ دارشتنی رستەییەکەدا هەیە کە چەتوونترین تێکەڵبوونی دەنگەکان لە مۆسیقادا و نەزمپێدانی پارچە مۆسیقایەک بۆ ئۆرکێسترا لە گەڵ ئەو لەرینەوەیەی کە نۆتێکی موسیقا بە تەنێ پێکی دێنێ.»
وێرنن لی هەروەک فلۆبێر بڕوای وایە کە جوانی بەرهەمی هونەری سەرچاوەکەی لە شێوازی ئەودایە. هەروەها سەرنج دانی لە رادەبەدەری ئەو بۆ پێوەندی لایەنە ناوەکییەکانی چیرۆکیش سەرەتایەکە بۆ تیۆری زاتخوازبوونی هونەری ئەدەبی چیرۆکی لە سەدەی بیستەمدا.
هەر وەکوو دیتمان رەخنەی تیۆریانەی رۆمان هەتا بەر لە فلۆبێر و جەیمزدا بە گشتی لاساییکەرەوە (محاکاتی) و ناوەرۆکێکی ئاکاری هەبوو. لاسایی کردنەوە کەرەسە بوو. ئاکارخوازی مەبەستی ئەو بوو. بە پێی ئەم بیرۆکەیە، ئەدەب ئەتوانێ ئاکاری ئینسان باشتر بکات، بەڵام بۆ ئەم مەبەستە پێویستە لە پێشدا خوێنەر رازی بکەین ئەو دونیایەی کە لەم رۆمانەدا دەیخوێنێتەوە بێپێوەندی لە گەڵ جیهانی راستەقینەدا نیە. لە راستیدا ئەم بیرۆکەیە کە هونەر تایبەتمەندییەکی محاکاتی هەیە و لاسایی کردنەوەیەکە لە رووداوەکانی جیهانی راستەقینە، گرینگترین بیرۆکەی هونەری لە زەمانی ئەرەستووەوە تاکوو نێوەڕاستی سەدەی هەژدەهەمە.
پێوەندی پێویستی نێوان ریئالیزمی رواڵەتی و ریئالیزمی مەحاکاتی تەنیا ئەو کاتە سڕدراوە کە چیرۆکنووسان ئێجگار زیادە و زۆرتر بوونە تامەزرۆی پرۆسەی زەینی کەسێتییەکان. وەها تامەزرۆیی‌یەک زیاتر لەو فۆڕمە هونەرییانەدا خۆی نیشان ئەدات کە کەمتر حیکایەتی و زیاتر ئەندامئاسایە. بە وتەیەکی دیکە فۆڕمێکی زاتخوازانە یان خودکەفایە. ئەم داڕووخانی روانگەکانی تیۆریکییە لە رۆماندا بڕێ درەنگتر لە شیعر رووی دا. تیۆریەکانی ئەندامئاسا بوون یان زاتخوازانە بوون لە شیعردا، پێشتر لە دەیەی

١٧٦٠دا بۆ وێنه له برێ له نووسراوەکانی ئۆسقۆف هێردا و له پاشانه له لایەن شاعیرانی رۆمانتیکی ئینگلیزی و بە تایبەت لە لایەن کۆلیریجەوە باسی لێکرا. بەڵام هەر له نیوەڕاستی سەدەی نۆزدەوە بوو کە بە نووسراوە رەخنەیی یەکانی فلۆبێر و له پاشان جەیمزدا، جێگرەکانی جوانی ناسەکی مەحاکاتی بە لەونێکی جیددی و یاسامەند لە تیۆری رۆماندا کەوتنە بەرچاو. لەوە بە دوا زاتخوازانه بوون و نەک مەحاکاتی، توخمی سەرەکی ریئالیزمی رواڵەتی دەژمێردران.

تیۆری رۆمان لە سەدەی بیستەمدا کە ناوەرۆکی خۆی کەم و زۆر لە رەخنەگرانی ئەوڕووپی یەوە وەرگرتووە، کەمتر بۆ پێوەندی نێوان خوێنەر و دەق و زیاتر بۆ هاوپێوەندی نێوان توخمە جیاوازەکانی پێکهێنەری بنەمای رۆمان دەگەڕێتەوە. بە لەونێکی دیکە رەخنەی تیۆریکی رۆمان لە سەردەمی نوێدا، سەرنجێکی زۆر ناداتە لایەنە حیکایەتخواز و ئاکارییەکانی رۆمان، بەڵکوو ئەو شتە زیاتر بە خوڵقاوەیەکی زاتخواز دەزانێ کە وا لە جیهانی رۆمانی راستەقینەدا سەربەخۆیە یان لانی کەم تەواوەن سەر بەو نیە. جیهانی رۆمانی زاتخوازانە بۆی دەچێ چارەناچار وێکچوونێکیشی بە دونیای ئێمەوە هەبێ، بەڵام بۆ خوڵقاندنەوەی لە ئانقەستی شتێکی بەدەر لە خۆی نەئافراندراوە، لە تیۆری رۆمانی مۆدێرندا زیاتر لە سەر بنەما و داڕشتنی بەرهەم و پێوەندی پێویستی بوونی ئەندامەکانی پێکهێنەری ئەو شتە جەخت کراوە، نەک لە سەر خودی چیرۆک لە جیاتی وانمووده یان نەبوونی وانموودەی ئاکاری یان لاساکردنەوەی واقیع(محاکاتی)بێ ئەوەی بڵێین دیارە بیرۆکە و تیۆرگەلێکی دیکەش دەتوانین بۆ مەبەستی باسکردن و بەراورد کردن بێنینە گۆڕێ، بەڵام بە گومانی من ئەو بیرۆکە و تیۆرانە زیاتر دەبنە هۆی پێچەڵاوپووچی و ئاڵۆزی - نەک روون بوونەوەی -

جیاوازییەکانی گرینگی رەخنەی رۆمان لە عەیامی ئاگۆست لە گەڵ دەورەی ویکتۆریادا لە لایەکەوە و رەخنەی «مۆدێرن»ی رۆمان هەتا بەر لە سەدەی بیستەم لە لایەکی دیکەوە.

**تێبینی و پەراوێزەکان:**

١ـ **سەردەمی ڤیکتۆریا:** ساڵانی ١٨٣٧ تا ١٩٠١ کە سەردەمی گەشە کردنی شێعر و رۆمان و ئەدەبی بەریتانیا بوو.

٢ـ **ئەدەبی «نوێ کلاسیک»:** لە مێژووی ئەدەبی ئینگلیزدا بە ساڵانی ١٦٦٠ هەتا ١٧٨٩ دەوترێ کە ئەدەب، وێڕای پێشوازی لە ئەدەبی دەورەی کلاسیکی یۆنان، داهێنان و گەشەیەکی زۆر بەگوڕ و تینی بەخۆوە بینی.

٣ـ **مەحاکات:** مانای ئەم وشەیە دەبێتە ئاخافتن و لە یەکچوون، بەڵام هونەری مەحاکاتی بە شێوزای لاسایی کردنەوەی سروشت و واقیع «راستی» دەوترێ.

٤ـ **سەردەمی ئۆگۆست:** نیوەی یەکەمی سەدەی هەژدە لە مێژووی ئەدەبی بەریتانیادا، چونکە نووسەرانی ئەو خولە بە چاوی رێزەوە سەیری هونەرمەندانی دەورەی ئۆگۆست ئەمپڕاتووری رۆمیان دەکرد، یانی لـــــە خولقاندنی بەرهەمی ئەدەبیدا لاسای هۆڕاس و ویرژیل و ئاشیلووس و . . . یان دەکردەوە.

٥ـ **شیاوی دابڕان (قابلیّت سلبی):** ئەو کارەی کە هونەرمەند خۆی لە یاد دەکات و دەچێتە ناخی کەسێتی بەرهەمەکانیەوە.

٦ـ **دوکتور ساموئێل جانسۆن:** (١٧٨٤ – ١٧٠٩) شاعیر و رەخنەگر و فەرهەنگ نووسی ئینگلیزی.

٧ـ **هێنری فیلدینگ** (١٧٥٤ – ١٧٠٧)، ساموئێل ریچاردسۆن (١٧٦١ – ١٦٨٩)، دانییل دیفۆ (١٧٣١– ١٦٦٠) هەر سێکیان لە تاقمی یەکەم رۆماننووسان و دەسپێکەری رۆمانی بەریتانیایی بوون.

٨ـ **جان دابلیو کراس:** رەخنەگری بەریتانیایی و هاوسەری جۆرج ئەلیەت بوو.

# ڕیالیزم و ڕۆمانی سەردەم

**[illegible] ( Raymond – Williams )**

ساڵی ٢٠٠٣ دەبێتە یەکسەدوچل‌وحەوتەمین ساڵوەگەڕی کەڵـک وەرگـرتن لە زاراوەی ڕیئالیزم، لـە ڕەخنـەی ئەدەبـدا، بەڵـام کەسـێک بـەم «بۆنـە»یـەوە ڕێزگرتنێکی بۆ ڕیئـالیزم دانـەنا. لـەم ١٤٧ ساڵـەدا، ڕووداوگـەلێکی ئەوەنـدە دژوار و جۆرانجۆر و تـاڵ و سـوێر بـە سـەر ڕیئالیزمـدا تێپـەڕ بـووە، کـە لـە ڕاسـتیدا هـەر چەشـنە ڕێزگرتنێـک دژایـەتی بـیر و ڕا و قـسەوباسی پـڕ هەڵاوزەنای لێ ساز دەبـوو. لـە عـەینی حاڵـدا، ڕیئـالیزمیش شـتێک نیـە کـە بتوانین تایبـەتی کەینـەوە یـا وەسـفێکی وردی لـە سـەر بکـەین و لـە کـاری تایبەتـدا دەکـاری کـەین، بەڵـکوو زیـاتر ئەگـەری وەسـفی شـێوازەکان و گۆشەنیگایەکی تایبەت چێ دەکـات و زۆر سروشـتییە کـە ئـەم وەسـفانە لـە نێوان ئاڵوێر و پەرەپێدانی ئەزموونەکانماندا گۆڕانکارییان بە سەردا بـێ. لـەم دواییانـەدا دیـسانەکەش ئـەم وەسـفانەم شـیکاری کـرد و هەڵمـسەنگاندنەوە بەڵکوو بتوانم بەم چەشنە بڕێک لە بیروڕا تایبەتەکانی خۆم سەبارەت بە یاسا و تەکنیکـەکانی ڕۆمـان ڕوون کەمـەوە و بگەمـە ئاکـامێکی گـشتی. لـەم وتارەدا، بەتەمام سێ بابەت لێکدەمەوە:

١ـ واتا جۆرانجۆراەکانی ڕیئالیزم لە پلە و پایەی زاراوەیەکی وەسفکراودا

٢ـ بیروڕای خۆم سەبارەت بەو گۆڕانکارییەی بە سەر ڕۆمانی مۆدێڕندا هاتووە

٣ـ پێشنیار کردنی واتایەکی تازە بۆ ریئالیزم.

لە سەرەتای ئەو کاتەوە کە «ریئالیزم» لە ئەدەبدا بووە باو، ئەم زاراوەیە لە واتای پسپۆڕانەی خۆیدا بۆ ئاماژە کردن بە وردی و ئاشکرایی لە ئافراندنەوەی پاژەکانی ژیان لە هونەردا دەکار کراوە. هەروەکوو لە پاشان بۆمان دەردەکەوێ ئەم کاربوردە بە ڕواڵەت سانایەی زاراوەی ریئالیزم لە ڕاستیدا بەرپرسی هەموو دژوازییەکانی دواتری ئەوە؛ سەرەڕای ئەمانە، لە سەرەتا و دەسپێکدا دەڵێی ئەم وەسفەی سەرەوە هێندە وردە کە بێت و بە بەڵگەی دابنێین (بۆ وێنە لە ڕێگەی هەمبەر کردنەوەی ریئالیزم دەگەڵ ئاڕمانج خوازی و کاریکاتێر چێ‌کردندا) دەتوانین شێوازە جۆرانجۆرەکانی ڕۆماننووسین لێک جیا کەینەوە. بەڵام هەروەها لە سەرەتای باوبوونی زاراوەی ریئالیزم لە ئەدەبدا، ئەم واتا پسپۆڕانەیە دەگەڵ بابەتەکانی دیکەدا، بە ریئالیزم نێوبرد کراون. زۆر کات لە بۆ ئەژماردنی تایبەتمەندییەکانی ریئالیزم، بابەتە ئاساییەکانی سەردەم و هەروەها ڕاستیی ژیانی ڕۆژانە دەگەڵ ئەو بابەتانەی بە چەشنی سوننەتی قارەمانانە یا ڕۆمانسی یا ئەفسانەیین هەمبەر دەکران. لە پاش ڕێنیسانس، پەرە پێدان و پشتگیری لەم (ڕاستیی ئاسایی و ڕۆژانە و سەردەم)ە بە چەشنێکی ئاسایی دەگەڵ چینی تازە پێگەیشتووی ناونجی، یانی بۆرژواییدا تێکەڵ بووە. ئەم چەشنە بابەتانە،زیاتر بە «خودی» و «بۆرجوایی[١]» نێوبرد دەکران، نەک بە «ریئالیستی» و هۆکاری ئەم کارەش ڕوونە.

[illegible]

لە ئەدەبدا، شانۆنامەیەک لاوەکی نەبایە و بە تایبەت ڕۆمان کە لە سـەرەتای سـەدەی هـەژدەدا هاوکـات دەگـەڵ سەرهەڵـدانی چـینی سـەربەخۆی مـام ناوەنـدی لـە ئینگلیـزدا بـڵاو بوونـەوە، گـشتی‌تـرین ئـامێری دەربـڕینی ئـەم زەینییەتە تازەیە بوون. بەڵام لە کاتی سەقامگیر بـوونی وەسـفی «ریئـالیزم»دا، گۆڕانکارییەکی دیکەش، چ لە نێـوەرۆکی ریئالیزمـدا و چ لـەو بیروڕایانـەی سەبارەت بەودا، خەریک بوو پێکدەهات. ئاوەڵناوی «راچڵەکێنەر» ئەغـڵەب ویڕای ریئالیزم دەکـار کـرا و لـە ڕەوتی بـاودا «راسـتیی ئاسـایی و ڕۆژانـە و سەردەم»، سەرنجدانێکی تایبەت دەدرایە لایەنە ناخۆش و ئاشـکرا و پـیس و چەپەڵـەکانی ژیـان. لـەم ڕوانگەیـەوە،ریئـالیزم بـڕێجار بـە شۆڕشـێکی دژی ئایدیۆلۆژی بۆرجوایی دادەنـدرا، لەبـەر ئـەوەی هونەرمەنـدە ریئالیـستییەکان بـەردەوام بابەتگـەلێکی ئاســایی‌یــان بـۆبەرهەمـەکانیان هەڵــدەبژارد کـە هونەرمەندانی بۆرجوا سەبارەت بەوان بێدەنگ دەمان. بەم چەشنە، «ریئالیزم» بووە نیشانەی بزووتنەوە پێشکەوتنخواز و شۆڕشخوازەکان.

نیچرالیزم (سروشتخوازی)ش سەربوردێکی ئاوای هەیە. زاراوەی «نیچرالیـزم» لـە سـەرەتادا بـۆ وەسـفی شـێوازێکی هونـەری تایبـەت دەکـار کـرا. بەڵـام هەروەکوو ریئالیزم سنووری واتاکـانی بـەرە بـەرە پـەرەی گـرت و بەربـڵاو بۆوە و «راستی ڕۆژانە و ئاسایی»شی لە ئامێز گرت، هەتاکوو بە تایبـەت (لـە بەرهەمـــــەکانی ئێمیـــــل زوولادا) بـــــووە قوتابخانەیـــــەکی شۆڕشگێڕانە،قوتابخانەیەکی وا کە ڕۆژنامەی *دەیلی نیوز* لـە ساڵـی ١٨٨٤دا بەم چەشنەی وەسف دەکات: «باسی ڕووداوگەلی ناحـەز و ناشـیرین کـە بـە چەشنێکی ناپێویست دەقیقن».

بــەم چەشــنە واتاکــانی زاراوەگــەلێکی وەکــوو ریئــالیزم و نیچرالیــزم «سروشــتخوازی» بــێج لــە واتــا تایبەتییــەکانیان، پێوەندییــە مــەرامی و ئاڕمانجییەکانیشیان دەگرتەوە. واتای هەرە سەلمێندراو لەم نێوانـەدا، وەسـفی

ســـتریند بێـــرگ (August_Strindbery) (شانۆنامەنووســـی ســـویدی، ١٩١٢ـــ١٨٤٩) لـە نیچرالیـزم بـوو کـە «سروشـت»ی ڕەفـز دەکـردەوە و سروشـتخوازی لــە وەســفی ئــەودا بــە پێــی مێژینــەی فەلــسەفی دەگــەڵ «پـەڕنیچرالیزم»دا هەمبـەر دەکرانـەوە. ئەڵـبەت لـە پـێش کۆتـایی سـەدەی نۆزدەهەمدا زۆر بە ئاشکراتر لـە سـەدەی بیستەمدا، ڕیئـالیزم و نیچرالیـزم لـە یەکدی جیاواز کران؛ دەیجا زاراوەی ڕیئالیزم لە هونەردا تـاک و تـەرا هـەر بۆ واتا پسپۆڕانە و تایبەتییەکەی خۆی دەکـار کـرا، لـە حاڵـێکدا نیچرالیـزم ـ باوەکوو چەند توخمێکی ئەم لایەنە پسپۆڕانە و تایبەتییـەی پاراسـت ـ لـە بـۆ وەسفی بابەتگەلی بەرهەمە هونەرییەکان و گۆشەنیگای هونەرمەنـد سـەبارت بەو بابەتە دەکار کرا.

گۆڕانکاری ریالیزم لە سەدەی بیستەمدا بە گشتی بە چەشنێک بووە کە بۆتـە مایەی سەرسووڕمان. ڕیئـالیزم لـە ڕۆژئـاوادا بـێج لـە کـاربوردە ئاسـاییەکانی خۆی، لە مەیانێکی بەربڵاودا بە واتای «ئەمەگدار بوون بـە ڕاسـتیی دەروونی» دەکــار کــراوە، بــەم واتایــەی کــە بــە چەنــدان چەشــنی جیــاوازی فۆڕمــە هونەرییــەکان دەتــوانین خوێنــەر ڕازی بکــەین کــە ئــەو ئەزموونــەی لــە بەرهەمێکی ئەدەبیدا هاتۆتە گۆڕێ خاوەن ڕاستییە یـان سروشـتی ڕیئـالیزمی هەیە و بۆ ئەم کارە هیچ پێویست ناکات کە بابـەتی ئـەو بەرهەمـە سـنووردار بکەین و بە ڕووداوی ئاسایی یا سەردەم یان ڕۆژانەوە ببەستینەوە. لە لایەکی دیکـەوە، لـە ڕووسـیادا وەسـفەکانی سـەرەتای ڕیئـالیزم هـەروا پـارێزراوە و پەرەی پێدراوە.

دەتوانین نەریتی ڕیئالیزم لە ڕووسـیادا وێـڕای ئامـاژە کـردن بـۆ بنچینـەکانی «ڕیئـالیزمی سۆشیالیـستی» بـەو چەشـنەی ڕووسـیاییەکان وەسـفیان کـردووە، باشتر بناسین.

«ریئالیزمی سۆشیالیستی» خاوەنی چوار بنچینەیە:
- مرۆڤخوازی (Narodnost)
- تیپخوازی ( tipichnost )
- ئارمانج خوازی (Ideinost)
- پارت خوازی (Partnost)

مرۆڤخوازی لە کردەدا لە سەر لایەنی تەکنیکە، باوەکوو بە واتای هەوێنی بنەڕەتی، ریئالیزمیشە، لە بەر ئەوەی داوا دەکات کە بەرهەمی ئەدەبی بە چەشنێکی گشتخواز سانا بێت و بە شێوازێکی سەلەفی روون و ئاشکرا بێ (بە پێچەوانەی «فۆڕمالیزم» کە فامستی (ئیدراکی) بەرهەمی ئەدەب چەتوون و دژوار دەکات) ئارمانج خوازی و پارتخوازی لە سەر نێوەرۆکی ئایدیۆلۆژیکی «ریئالیزمی سۆشیالیستی»ن و پڕوپاگاندە و پەرەپێدانی دەربەستی سیاسەتەکانی پارتی کۆمۆنیستن. راست هەروەکوو مرۆڤخوازی، گێڕانەوەیەکی جیاواز لە واتای پسپۆڕانە و تایبەتی ریئالیزمی لە نەریتی گشتیدا هەیە، هەروەها ئارمانج خوازی و پارتخوازیش کامڵبوونی هەر هەمان ئەو بیروڕا شۆڕشگێڕانە و ئایدیۆلۆژیایانەیە کە لە پێشتردا باسمان کرد. وێڕای ئاماژە کردن بەم گۆڕانکارییانە لە ئایدیۆلۆژی و سەر بە ئایدیۆلۆژی بووندا، دەتوانین واتایەکی زۆر سانا لە «ریئالیزمی سۆشیالیستی» بە دەستەوە بدەین و ئەو شتە لە «ریئالیزمی بۆرژوایی» جیا کەینەوە. لە راستیدا بەشێکی زۆری ئەدەبی گشتخواز لە رۆژئاوادا، هەمان «ریئالیزمی بۆرژوایی » و خاوەن چەشنێک ئارمانج خوازی و پارتخوازی بووە کە وەشوێن مرۆڤخوازی کەوتووە. ئەم کێشەیە کاتێک رەهەندی بەربڵاوتر دەگرێتەوە کە دەگەینە بنچینەی چوارەمی «ریئالیزمی سۆشیالیستی»، یانی کە دەگەینە تیپخوازی ( tipichnost ). فێردریک ئینگێلس بە «ریئالیزم»ی دەوت

«کەسێتییە تیپیکاڵییەکان لە بارودۆخی تیپیکاڵیدا». چما کەسێکی بێج لەو ڕیئالیزمی ئاوا وەسف کردایە، دەمانتوانی زۆر بە ئاسایی دابنێین؛ بەڵام لە پاش بەستێنی وەسفی ئینگێڵس‌دا کۆی بیروبڕوا مارکسییەکان ڕاوەستاون. تیپخوازی پەرە پێدانی ئەم وەسفەیە و هەموو بابەتێکی ڕیئالیزمی لە بناغە و بنچینەوە دێنێتە ژێر کاریگەری خۆیەوە، چونکە بە وتەی تیۆر سازان و بیرمەندانی ئەدەبی شۆڕەوی (سۆڤیەت): «نابێ کەسایەتی و بارودۆخی تیپیکاڵ دەگەڵ ئەو کەسایەتی و بارودۆخانەدا کە زۆر جاران دەیاندینین بە هەڵە بگرین»؛ کەسێتی و بارودۆخی تیپیکاڵی ڕاستی لە سەر بناغەی «یاساکان و ڕوانگەکانی پێشکەوتنی کۆمەڵایەتی لە داهاتوودا»یە. بە بێ‌ئەوەی بمانەوێ ئەم گۆشە نیگایە بە چەشنێکی تایبەت بۆ لێکدانەوەی ئەدەبی شۆڕەوی (سۆڤیەت) دەکار کەین، (لە دۆخێکی وادا، بەڵگەی ئێمە بۆ ڕەخنە دەبێتە هەڵبژاردنی شۆلۆخۆف لە ڕۆمانگەلی *دۆنی ئارام* و *زەوی تازەئاوەدانکراو*دا، (بە سەر نموونەی هەندەرانی ئەودا یانی ئالکسی تۆلستۆی لە ڕۆمانی *ڕێگای جۆلجۆتا*دا[1]) بۆمان دەردەکەوێ چەمکی تیپخوازی «ڕیئالیزم» هەتا ڕادەی دووبارە ئافراندنەوەی ڕاستەوخۆی ڕاستیی‌یەکی بەرچاو دەکاتە هەوێنی گۆڕانکاری، بە چەشنێک کە ڕیئالیزم دەبێتە هەڵبژاردنی خاوەن یاسا و نەریت. بێت و «تیپیکاڵ» لە جیاتی چەمکی هەرە تایبەت‌نومای ئەزموونی مرۆڤ لە تاک و یەکەدا،یان لە کۆمەڵگادا لە بەر چاو بگرین (کە مارکسییەکانیش سەبارەت بە بیروڕاکانی هەرە بنچینەیی و بنەڕەتی خۆیان وا فیکر دەکەنەوە)، لە وەها دۆخێکدا دەردەکەوێ کە ئەم چەمکە لە گەڵ چەمکی بەربڵاو و پەرەپێدانی بەڵگە «بە چەشنێکی زۆر ڕازی‌کەرەوە لە سەر ڕاستی» کە لەمڕۆدا لە ڕۆژئاوادا بە گشتی لە بۆ

---

[1] [illegible] گذر از رنجها [illegible].

لێکدانــەوەی چەنــدان چەشــنە بەرهــەمی ڕیئــالیزمی و ناریئــالیزمی دەکــار دەکـرێ، زۆر جیاوازییـان نیـە. ئـەرکی ئێمـە ئـەوە نیـە کـە لـە نـاو کـڵافی پێچەڵاوپووچی وەسفەکانی «ڕیئالیزم»دا ئـەو وەسـفە جیـا کەینـەوە کـە بـۆ خۆمان دەیسەلمێنین و ئەو وەسـفە،بـە تـەنها وەسـفێکی دروسـتی «ڕیئـالیزم» دابنێین، بەڵـکوو دەبـێ هـەموو ئـەو وەسـفانەی کـە هـەن، لێکیـان دەینـەوە، ڕوونیان کەینەوە و لە یەکدی جیایان کەینەوە و بزانین کامێک لەو وەسـفانە دەتوانێ بۆ وەسفی دژکردەی ئێمە سەبارەت بە ئەدەب بە کەڵـک بێـت. بـە گشتی لە وەسفی نەریتی سەرەکی ئـەدەبی چیرۆکـی ئـەوڕووپا لـە سـەدەی نـۆزدەدا بـە نـەریتێکی «ڕیئـالیزمی» نێـوبرد دەکـەن و هـەروەها بـە گـشتی وایدادەنێن کە ئەم نەریتە تایبەتـە ـ لانی کـەم لـە ڕۆژئـاوادا ـ تەمـەنی تـەواو بووە. لەم دواییانەدا ڕەخنەگرێک وتبووی ڕۆمانی «ڕیئـالیزمی» هاوکـات لـە گـەڵ (داشـقە)دا تەمـەنی تـەواو بـووە. بەڵـام لـە یەکـەم نیگـادا، فامـستی دەرئەنجامی ئەم حوکمە زۆریش سانا نیـە، لەبـەر ئـەوەی نەریتـەکانی بـاوی ڕیئالیزم هێـشتاش لـە زۆرینـەی نیزیـک لـە هـەموو ڕۆمانـە مۆدێڕنەکانـدا بـە ئاشـکرایی بـرەوی هەیـە (بـۆ وێنـە لـەو ڕۆمانانـەدا کـە ئێمـە هێـشتاش بـە نموونـەکانی ڕاسـت و درووسـتی ئـەدەبی دادەنـێین). هۆکـاری ڕیئـالیزمی بوونی ڕۆمانە مۆدێڕنەکان هەر لەوەدا نیە کە هێشتاش زیاتر سەرقاڵی لێـدوان سەبارەت بە بابەتەکانی سەردەمن، توخمی ئەزموونگەلی ئاسایی و ڕۆژانە لە زۆر لایەنەوە لە ڕۆمانی مۆدێڕندا زیـاتر لـە ڕۆمـانی سـەدەی نـۆزدە بـەرچاو دەکەوێ، لە بەر ئەوەی زۆرێک لە نەریتـە یاسـاغەکانی ئـەوکات ئێـدی لـە گۆڕێـدا نـەماون. حەتمـەن کەسـێک گلـەیی و بناشـت ناکـات کـە ڕۆمـانی مۆدێڕن ئەو لایەنە ڕاچڵەکێنەر و ناشیرینانەی نیـە کـە ڕۆمـانی ڕیئـالیزمی لـە ڕابردوودا هەیبوو. زۆربەی وەسفەکان لە ڕۆمانی مۆدێڕندا هێشتاش ڕەنگ و بۆنی ڕیئالیزمی هەیە، لە بەر ئەوەی وەسفی هەر شـتێک هـەر بـەو چەشـنەی

کە لە ڕاستیدا بەرچاو دەکەوێ، خاڵێکی سەرەکییە کە کەمتر ڕۆماننووسێک ئامادەبوونی هەیە وەلای بنێ. ئەغڵەب دەڵێین ڕۆمانی ڕیئالیزمی جێگەی خۆی داوەتە «ڕۆمانی دەروونناسەکی» و ئەمەش ڕوونە کە لێکدانەوەی ڕاستەوخۆی بڕێ دۆخی زەین؛ بڕێک دۆخی دەروونی کە تازە و لەم دواییانەدا ناسراون، یەکێک لە تایبەتمەندییەکانی سەرەکی ڕۆمانی مۆدێڕن بووە. وێڕای ئەمانەش ڕیئالیزم وەکوو کاری بە ئەنقەستی نووسەر لە وەسفی ئەم دۆخانەدا زۆریش وەلا نەندراوە. بڵێی قسە و باس هەر ئەمە بێ کە «ڕاستیی ڕۆژانە و ئاسایی» لە هەنووکەدا بە چەشنێکی دیکە فامست دەکردرێ و تەکنیکگەلی نوێ لە بۆ وەسفی ئەم ڕاستییە تازەیە دادەهێندرێ؟ بلێی ئەم تەکنیکە نوێیانە هێشتاش هەر بە مەبەستی تەواوەن ڕیالیزمییەوە کەڵکیان لێ وەربگیردرێ؟ بە ئاشکرایی ئەم پرسیارانە زۆر دژوارن؛ بەڵام ڕەنگە ڕێگایەکی وەڵامدانەوە بەوان، سەلماندنی ئەم بڕوا گشتییە بێ کە ئێمە ئیدی ڕۆمانی ڕیئالیزمی‌مان وەلا ناوە (یان وەدوامان داوە)؛ لە پاشان دەبێ ئەم بڕوا کەسانە و تایبەتییەی منیش بێتە ئاراوە کە لە ئەدەبی چیرۆکیی مۆدێڕندا، بۆشاییەکی ڕواڵەتی هەیە کە دەربڕینی ئەو تەنها چەشنە ئەزموونێکی بۆ مسۆگەر ناکات، چەشنێک ئەزموون کە بە گومانی من بە تایبەت گرینگە و لە بۆ نێوبرد کردنەوەی بەردەوام وشەی «ڕیئالیزم» بەردەوام لە زەیندا قوت دەبێتەوە.

دەبێ ئاگادار بین کە ڕۆمان تەنها چەشنێک لە ئەدەب نیە، بەڵکوو هەر لە خۆیدا خاوەن تەواوەتی ئەدەبە. تەقریبەن هەر چەشنە نووسراوەیەکی سەردەم لە مەیانی بەربڵاوی ڕۆماندا جێگای دەبێتەوە. بێت و «ڕۆمان» تاقە دەگەڵ چەشنێک لە بەرهەمە پەخشانییە هاوتاکانیدا بەراورد بکەین، لە دۆخێکی وادا نەریتی ئەدەبی چیرۆکی و لێدوانە پێویستە ڕەخنەییەکانی سەبارەت بەومان زۆر زۆر سنووردار کردۆتەوە. بە هۆکاری هەر ئەم تاوانە

نادرووستەوە بوو کە تالستۆی سەبارەت بە رۆمانی *شەڕو ئاشتی* وتی کە ناتوانین ئەم بەرهەمە بە واتای راستینەی وشە بە رۆمان نێوبرد بکەین.

هەروەکوو لە پێشتردا ئاماژەم پێکرد،ئەو چەشنە ئەدەبەی کە *میدڵ مارچ و سووتاندنی کابرای بێ ئیمان و بەرزاییە باگرەکان و هاکلبری فین و کۆلکەزێڕینە و کێوی جادوو* لە خۆی دەگرێ، لە راستیدا زیاتر شەباهەتی بە چەشنێک ئەدەبی تەواو عەیارەوە هەیە. ئەڵبەت مەبەستی من لە سەرنجدان بەو شتەی کە گومان دەکەم بۆشاییەکی رواڵەتی بێت، ئەمە نیە کە ئەم چەشنە ئەدەبە (رۆمان) لایەنێک لە خۆ بگرێ و روو بکاتە شوێنێک کە ئەم بۆشاییە پڕکاتەوە، بەڵام لە لایەکی دیکەوە لە بەر ئەوەی رۆمان زیاتر وەکی ئەدەبێکی تەواو عەیار وایە، هەر چەشنە بۆشاییەکی رواڵەتی لە رۆماندا بە تایبەت زۆر گرینگە.

سەرقاڵبوون بە نەریتی ریئالیزم لە ئەدەبی چیرۆکیدا، لە راستیدا سەرقاڵبوون بەو چەشنە رۆمانەوەیە کە چەندایەتی و چلۆنایەتی شێوازێک لە ژیان تەواوەن لە سەر تایبەتمەندی کەسێتییەکان دەخولقێنێ و هەڵیدەسەنگێنێ. ئەم دەستکەوتە پێویستی بە هاوسەنگی‌یەک هەیە کە گرینگترین لایەنی ئەو بێ. لە سەرەتای کاردا، دەڵێی ئەم بابەتە زۆر گشتییە و دۆخی زۆربەی رۆمانەکان دەگرێتەوە، ئەم هاوسەنگییە لە *شەڕ و ئاشتی*دا هەیە، هەروەکوو لە *میدڵ مارچ*یشدا هەیە و لە *کۆلکە زێڕینە*شدا. بەڵام جیاوازی ئەم چەشنە هاوسەنگییە لەوە دایە کە بایەخ دادەنێ هەم بە سەر گشت شێوازێکی ژیانـدا و بە سەر کۆمەڵگایەکدا کە گەورەترە لە یەکە یەکەی تاکە پێکهێنەرەکانی و هەم بە سەر مرۆڤێکدا کە باوەکوو سەر بەو شێوازە ژیانەن و کاریگەری ئەویان بە سەرەوەیە و بەشێک لە واتای ئەون، بەڵام هەروەها بە شێوازی تایبەتی خۆیان، لە خۆیاندا غایەتێکی رەهاشن.

هیچ کام لەو دوو کۆڵەکە و بناغەیە (کۆمەڵگا و تاک) بە خاوەن سەرەتێکی سەرەکی دانانـدرێن. کۆمەڵگا پاش بەستێنێک بۆ شرۆڤەی پێوەندییەکانی جەماوەر نیە و مرۆڤیش نیشاندەری لایەنەکانی جیاوازی شێوازێکی تایبەتی ژیان نین. هەموو لایەنەکانی ژیانی تایبەتیی تاک لە بنەڕەت و بنچینەوە لە ژێر کاریگەری چلۆنایەتی ژیانی گشتی و کۆمەڵگادایە، بەڵام ژیانی گشتی لە گرینگترین دۆخی خۆیدا بە چەشنێکی تەواوەن تاک و تایبەت لە بەر چاو دەگیردرێ. بە تەواوی هەبوونمانەوە سەرنج دەدەینە تەواوی لایەنەکانی ژیانی گشتی، بەم حاڵەشەوە بەردەوام مرۆڤ وەکوو تاکێک، بە ناوەندی بایەخ دادەنێین ـ نەک مرۆڤێکی تاک، بەڵکوو مرۆڤگەلی جیاواز کە «راستی»ی ژیانی «گشتی»ن. لە ناو رۆماننووسانی جۆرانجۆردا، تالستۆی و جۆرج ئەلیۆت ئەغلەب بە هۆکارگەلێکی وەکوو ئەو شتەی ئاماژەم پێکرد، دەیانووت مەبەستی سەلماندنی ئەم روانگەیەیان هەیە.

ئەڵبەت لێکدانەوە و شرۆڤەی ئەو رۆمانانەی کە لەم نەریتە ریئالیزمییەدا نووسراون، نیشاندەری پلەی زۆر جیاوازی سەرکەوتن لە وەدیهێنانی روانگەی نێوبراودان؛ بەڵام ئەم روانگەیە (یانی فامستی پێوەندییەک لە نێوان تاک و کۆمەڵگادا) لە قاوغی شێوازێک لە رۆماننووسیندا ئاشکرایە. نابێ فەرامۆشی بکەین کە ئەم روانگەیە، ئاکامی پێشکەوتی کامڵبوونەوەی رۆمانە. مێژووی رۆمان لە سەرەتای سەرهەڵدانییەوە لە سەدەی هەژدەدا، لە بنەڕەتدا لێکۆڵینەوەیەکە بۆ گەیشتن بەم روانگەیە، لێکۆڵینەوەیەک کە زۆر تێشکانی سەرەتاییشی بەسەردا تێپەڕیوە. رۆمانی سەدەی هەژدە،بە رواڵەت زۆر لە رۆمانی سەردەمی ئێمە دەچێ و نیشاندەری هەمان گوشار و زەخت و نەبوونی رەهایەتییە. لە راستیدا هاوکات دەگەڵ زیاتر بوونی فامستی ئێمە لە پەیوەندی نێوان تاک و کۆمەڵگادا بوو کە رۆمان پەرەی گرت. کاتێ

دەبیسم کە تەمەنی نەریتی ریئالیزم هاتۆتە کۆتایی خۆی، لە گەڵ خۆمدا بیر دەکەمەوە کە بە هۆکاری گوشارگەلی تازەوە کە بەرهەمی ئەزموونی تایبەتن،ئەم روانگە کامڵبووەی رۆمان تێداچووە. مەبەستم ئەوە نیە کە ئەم روانگەیە، بە پێی پێویست بە شێوازێکی تایبەت پێشکەش دەکرێ، (یان دەبێ بێتە گۆڕێ) ئەو چەشنە وەسفە ریئالیزمییە (یان بە شرۆڤەی ئەمڕۆیی خۆی ـ نیچرالیزمی ـ) کە (دەگەڵ داشقەدا تێداچووە) ئیدی بە هیچ چەشنێک بۆ ئەم روانگەیە پێویست نیە.

رەنگە بتوانین بڵێین لە رۆمانی نووسەرانێکی وەکوو ئارنۆڵد بنێت ( Arnold Bennett ) (رۆماننووسی ١٩٣١ـ١٨٦٧ی) بەریتانیاییدا تەنانەت بوونەتە جێگری ئەویش. ئەم روانگەیە بە وەسفی دوور و درێژی دووکانەکان و هۆدەکان و هۆڵی چاوەڕوانی وێستگەکان کە زیاتر لە پێرست هەڵگرتنەوەی شتەکانی ناو ئەوان دەچێ، جێبەجێ نابێ. دەتوانین ئەم چەشنە وەسفانە وەکوو توخمگەلێکی رووداوەکانی رۆمان دەکار بکەین. بەڵام ناتوانین ئەوانە بە ریئالیزمی سروشتی رۆمان دابنێین. لە راستیدا چما ئەم وەسفانە هەر بۆ مەبەستی وەسف کردن بێنە ئاراوە، بۆی دەچێ ئەو هاوسەنگییەی کە جەوهەری ریئالیزمە زایەع ببێ و بۆوێنە ببنە هۆی ئەوەی سەرنجی خوێنەر لە کەسێتییەکانەوە بەرەو شتەکان وەربچەرخێ. لە راستیدا ئەم چەشنە حاڵیبوونە کە (لەم رۆمانە بێ کەموکووڕیانەدا هەموو شتێ هەیە بێج لە ژیانی تاک وەکوو راستییەک)، لە دەیەی ١٩٢٠دا بوونە هۆی بەدنێوی «ریئالیزم».

ڤیرجینیا وۆلف (رۆماننووسی بەریتانیایی،١٩٤١ــ١٨٨٢) لە رۆمانی *شەپۆلەکان*دا بە چەشنێکی توندڕۆیانە دژکردەی ئەم چەشنە وەسفە دوور و درێژانەی نیشان دا و وێڕای دووری کردن لە وەسفی کەلوپەلی ناو ژوورەکان یا تەنانەت لەشی مرۆڤەکان، کارێکی کرد کە خوێنەر دەگەڵ

دەنگەکان و هەستەکاندا بە تەنێ بمێنێتەوە (ئەویش ئەو دەنگانەی کە خاوەنەکەیان دیوناس نیە). ئەڵبەت لەمڕۆدا دەرکەوتووە کە ئەم نەبوونی هاوسەنگییەش هەروەها بێ کەڵکە. لە ڕاستیدا ڕەنگە بتوانین مێژووی ڕۆمانی مۆدێڕن بە پێی پۆلێن کردنی شێوازی نووسەران بە دوو شێوازی «سروشتی دەرەکی ـ ڕیئالیزم» و «سروشتی ناوەکی، ئەمپرسیۆنیزم» بنووسین، بەڵام پۆلێن کردنێکی سەرەکی‌تر کە بە گشتی لە ساڵی ١٩٠٠ بەم لاوە دامەزراوە، دابەشکردنی ڕۆمانی ڕیئالیزمی (کە سروشت و تایبەتمەندی شێوازێکی ژیانی بە پێی سروشت و تایبەتمەندی کەسێتییەکان خولقاندبوو) لە سەر دوو نەریتی جیاوازە:

١ـ ڕۆمانی «کۆمەڵگاخواز» ٢ـ ڕۆمانی «کەسێتی خواز».

لە ڕۆمانی کۆمەڵگاخوازدا دەتوانین وەسف و بینینێکی وردمان لە ژیانی گشتی «جەماوەر» هەبێ و لە ڕۆمانی کەسێتی خوازدا وەسف و بینینمان بە وردی لە سەر کەسێتی «مرۆڤەکان» دەبێ. بەم حاڵەشەوە هەریەک لەم دوو نەریتی ڕۆمان نووسینە کەم و کوڕییەکی هەیە، چونکە شێوازی ژیان نە لە سەر جەماوەرە و نە لە سەر تاکە، بەڵکوو پرۆسەیەکی یەکە و لێکهەڵنەوەشاوەیە.

لەمەودوا بە گشتی لە نێوان ڕۆمانی «کۆمەڵگاخواز» و «ڕۆمانی کەسێتی خواز»دا جیاوازی دادەنێین و لە ڕاستیدا بە ڕاستییەکی دەناسین. بەڵکەم بتوانین بە شرۆڤەی چەند نموونەیەک، بابەتی سەرەکی ڕوون کەینەوە. لەمڕۆدا ڕۆمانی «کۆمەڵگاخواز» دوو چەشنی گشتی دەگرێتەوە، یەکەم ڕۆمانی وەسفی سەبارەت بە کۆمەڵگا کە لە حوکمی «موستەنەد = بەڵگەیی»دایە. ئەم چەشنە ڕۆمانە لە یەکەم پلەدا، شێوازێکی گشتی بۆ ژیان (یان بە وتەیەکی دیکە،تاقمێکی کۆمەڵایەتی یان جەماوەرێکی تایبەت) پێکدێنێ. ئەڵبەت ڕۆمانێکی ئاوا خاوەن کەسێتیشە و بڕێجار کەسێتییەکانی

زۆر بـە وردی وێنـا دەکـرێن، بەڵـام بـۆ ڕادەربـڕین سـەبارەت بـەم چەشـنە رۆمانانـە دەڵـێین چمـا بێـت و کەسـێک بیهـەوێ دەگـەڵ چۆنیـەتی ژیـانی کرێکارانی کانگا لە شارۆچکەیەکی سەنعاتی و تەکنیکیدا دیونـاس بـێ یـان بیهـەوێ بزانـێ کـە لـە زانـستگایەکدا یـان لـە پـاپۆڕێکی قوماشـدا یـان لـە یەکەیەکی گەشتیی سپا لە بێرمە (وڵاتێکی ئاسیایی)دا چـی دەقـەومێ، دەبـێ رۆمانێکی لەم چەشنە بخوێنێتەوە. لە راستیدا زۆرێـک لـەم چەشـنە رۆمانانـە زۆر بایەخـدارن. رۆمـانی موسـتەنەدی (رۆمـانی بەڵـگەیی) بـاش ئەغـلەب دڵڕفێنە. کێشەیەک نیە دەبا چەندان چەشـنی جۆرانجـۆری ئـەم رۆمانـە هـەر بنووسرێ. بەڵام ئاشکرایە کە ئەم رۆمانانە چ کـەم و کوورِییـەکیان هەیـە: لـە یەکەم پلەدا، کەسێتییەکان، کرێکاری کانگا، مامۆستای زانکۆ یـان پیـاوێکی «سوپایی»ن؛ بە وتەیەکی دیکـە، کەسـێتییەکانی ئـەم رۆمانانـە، شـێوازێک لـە ژیان وێنا دەکەن.

هەروەکوو لەمەوبەر وتم، لەم رۆمانانەدا جەخت کـردن لەسـەر ئـەو لایەنانـە دەکردرێت کە کەسێتییەکان لە خۆیاندا زۆر سەرنجڕاکێـشەرن و لـە عـەینی حاڵدا، هەر کامێکیان بەشێکن لە شێوازێکی ژیان. ئەم رۆمانانە لـە بـاری ئـەم جەخت و تەئکیدەوە، کەم و کوورِییەکیان نیە. لە نێو چەندان چەشنی بـاوی رۆمانـدا، باشـترین نموونـەکانی ئـەم چەشـنە تایبەتییـە (رۆمـانی وەسـفیی کۆمەڵگاخواز) بە رواڵەت زۆرترین شـەباهەتی لـە گـەڵ ئـەو چەشـنەی مـن رۆمانی ریالیزمی پێدەڵێم هەیە. بەڵام جیاوازی گرینگی ئەم دوانـە لـە کـاتی موتاڵـایاندا بـە تـەواوی خۆیـا دەبـێ: لـە راسـتیدا کـارکردی کۆمەڵـایەتی ـ وەسفی لە رۆمانی وەسفیی کۆمەڵگاخوازدا سەرەتی سەرەکی هەیە.

چەشنێکی زۆر جیاواز و سەرقاڵ کەرەوەی رۆمانی کۆمەڵگا خواز؟ لەمڕۆدا پەسندی گشتی وەدەست هێناوە و ئەم خاڵـەش خـاوەن گرینگـی و بایەخـە. لایـەنی زۆرینـەی ئـەم چەشـنە رۆمانـە، وەسـف نیـە، بەڵـکوو دۆزینـەوە و

پێکهێنـانی فۆرموولەیـەک سـەبارەت بـە کۆمەڵـگایە. لـە گـشت ئـەزموونی کۆمەڵگادا، نموونەیەکی تایبەت جیا دەکرێتـەوە، لـە «پاشـان» بـە پێـی ئـەو نموونەیە، کۆمەڵگایە ک پێکدێ. ساناترین نموونەی ئەم چەشـنە ڕۆمانـە لـە بەستێنی «چیرۆکەکانی داهاتوو»دا دەتوانین بدۆزینەوە کـە خاڵـی «داهـاتوو» لەواندا، گێرەوکێشەی نێـوان نموونـەی هەڵـبژاردراو و ئـەو شـتە ئاسـاییانەی دەیانـدینن دەسـڕێتەوە (ئەغـڵەب لـەم چەشـنە چیرۆکانـەدا، «داهـاتوو» هـەر حـوکمی وشـەیەکی هەیـە، چونکـە بـە ڕواڵـەت لـە زۆربـەی دۆخەکانـدا، چیرۆکەکە سەبارەت بە کۆمەڵـگای ئێـستا و سـەردەمە؛ لـە ڕاسـتیدا کەڵـک وەرگرتن لەم خاڵە بەرە بەرە دەبێتـە شـێوازی هـەرە گـشتی چیرۆکنووسـین سەبارەت بە ئەزموونی کۆمەڵایەتی). *جیهانی قەشەنگی نوێ، هەزار و نۆسەد و هەشـتا و چـوار، فارنهایـت ٤٥١*، چیرۆکگـەلێکی کۆمەڵـایەتی قـورس و قایمن کە لەواندا نموونەیەک کە لە کۆمەڵگای سەردەمەوە هەڵـگیراوە، بـە گشتی و تەواوەتی لە زەمان و شوێنێکی دیکەدا باس دەکردرێ. ڕۆمانگەلی *گـــەورەی مێـــشولەکان و میراتبـــەران* نووســـراوەی ویلیـــەم گۆڵـــدینگ (William Golding)ی بەریتانیایی و تەقریبەن هەموو چیرۆکە «زانستی ـ خەیاڵـــیەکانی» هانـــدەری هـــزر لـــە لیزگـــەی ئـــەم چەشـــنە ڕۆمانـــەی کۆمەڵگاخوازدان. زۆر کات ئەم ڕۆمانانە جۆرێـک دەنووسـرێن کـە وەکـی ڕۆمانـە ڕیالیزمییـەکان بـن و لـە بنەڕەتـدا ڕەوتێکـی وەکـوو یـەکیان هەیـە. هەروەها زۆربەی ئەوانە لە بنەڕەتدا خاوەن هزرێـک سـەبارەت بـە پێوەنـدی نێوان کۆمەڵگا و مرۆڤ و تاکەکانن. (ئەغڵەب کەسـێکی پـاک تینـەت ـ یـا تـاقمێکی چکۆڵـە لـەم تاکانـە ـ لـە هەمبـەری کۆمەڵـگایەکی گەنـدەڵدان). ڕووداوەکانی ڕۆمانگەلێکی ئاوا زۆرینەیان لە سەر کێشەکانی ئـەم پێوەندییـە ئاڵۆزکاوەی نێوان تاک و کۆمەڵگادایە. ئەڵـبەت مـن دەڵـێم ڕزگـار بـوونی کێشەکان و نـەک دۆزینـەوەی ڕێگـای چـارە سـەرێک بـۆ ئـەوان، چونکـە

ئەغلەب ئەم خاڵە بە چەشنێکی دووره چاو کێشەکان دوچاری گۆڕانکـاری دەکات و بە چەشنێکی تایبەت پێ نیشانی خوێنەری ئـەدات و لـە ئاکامیـشدا لە جیاتی شرۆڤەی هەمە لایەنەی ئەم کێشانە لە هێنانە گۆڕێیاندا پـڕ کێـشی و توندڕۆیی دەکرێ.

پەڕاوێز نشینی و لە خود نامۆبوون و غوربەت هەڵـبژاردن بەشـێکی گرینگـی ئـەو هەسـت و کـەف‌وکوڵـانەن کـە لـە کۆمەڵـگای سـەردەمدا ئـەزموونیان دەکەین و هەر رۆمانێکی ریالیزمی سەردەم دەبـێ زۆر بـە هـەژڵ «جیـددی» سەرقاڵی شرۆڤەیان بێ. (هەروەها سەرسووڕهێنەرە کە لەم نەریتی ریالیزمەدا، بـە چەنـدان کـەڕەت و بـە تایبـەت لـە رۆمـانی «*تـاوان و سـزا*»ی دەسـتا یۆفیسکی‌دا،هەروەها بە سـۆنگەی کەسـێتی *بزۆخۆفـەوە* لـە رۆمـانی «*شـەڕ و ئاشـتی*» تالـستۆی‌دا لێـدوانی ئـەم هەسـتانە دەکـەن و چـارە سـەرێکیان بـۆ دۆزینەوە کە دەگەڵ فۆرموولەی باوی ئەو سـەردەمەدا ـ دوور خستنەوە لـە بەر دژایەتی کردن دەگـەڵ جـەماوەری ئاسـایی‌دا؛ (مـات بـوون)، جیـاوازی زۆری هەیە.) ئەو رۆمانانەی لە سـەر بناغـەی تیـۆر و فەرموولـە دەنووسـرێن، پێکهێنەری شادین، چونکـە شرۆڤـەی هەسـتە شـادەکانی کۆمەڵـگا دەکـەن، بەڵام کەم‌وکووڕیشیان هەیە کە بریتییە لە نـەبوونی کۆمەڵـگایەکی راسـتی و هەروەها کەسایەتیگەلێکی راستی. هۆکارەکەی ئەمەیە کە ژیانی گشتی لـەم چەشـنە رۆمانانـەدا هـەر تاقـە کـارێکی دەرهەسـتانەیە و چۆنیـەتی ژیـان و چارەنووسی کەسێتییەکانیش هەر دەوری ئەوان لە تیۆر و فەرموولەدا دابـینی دەکات.

رۆمـانی ریـالیزمی دابـەش کـرا بـە: ١ــ رۆمـانی کۆمەڵـگاخواز ٢ــ رۆمـانی کەسێتی خوازدا. رۆمانی کۆمەڵگا خـوازیش لـە سـەردەم و زەمـەنی ئێمـەدا دابەشـکرا بـە رۆمـانی موسـتەنەدی کۆمەڵـایەتی «بەڵـگەنامەیی» و رۆمـانی فەرموولە و تیۆری کۆمەڵایەتی. ئەمە راستە کە نموونەهایەک لەم رۆمانانە لە

دەورەکانی ڕابردووشدا دەتوانین بدۆزینەوە،بەڵام هەرگیز بەم ڕادەیە باو نەبوون. هەر ئەم خاڵە سەبارەت بە ڕۆمانی کەسێتی خواز و دابەشکرانی ئەو بە ڕۆمانی موستەنەد و ڕۆمانی فەرمولەوە، ڕاستە و هاوتای هەیە. دەستەیەک لە باشترین ڕۆمانەکانی دەورە وزەمانەی ئێمە،ئەو ڕۆمانانەن کە هەڵبژاردەیەک لە پێوەندی کەسێتییەکان بە وردی و وردەکارییەوە وەسف دەکەن. زۆر کات ئەم ڕۆمانانە زۆر لە چەند بەشێکی ئەو ڕۆمانە ریالیزمییانە دەچن کە لە پێشتردا وەسفم کردن و شێوازی نووسین و ناوەڕۆکیشیان لە بنچینەدا وەکوو یەک وایە.

ڕۆمانی *گەشتێک بە ئینـدیادا* نووسراوەی فۆرستەر ( E-M.Forster) (ڕۆماننووس و ڕەخنەگری بەریتانیایی، ١٩٧٠ـ١٨٧٩) نموونەیەکی باشە کە دەتوانین هەم نیشانەکانی هاوسەنگی سەلەفی تێیا بدینین و هەم پلەوپایەیەکی بەرزی لەم چەشنە ڕۆمانە چەند پێکهاتەییانەدا هەیە، ئەمەش بە هۆکاری توخمگەلێکی کۆمەڵگای هیندوستانی ڕۆمانەکەوەیە کە کۆمەڵگای ڕاستیی بۆ بە یەکگرتنی دەگەڵ هەوجێکانی تاقمێ لە کەسێتییەکان لە بەر دڵان و خۆشەویست نیشان دەدات. ئەم کارە زۆر باوە و بەم چەشنە چێ دەکرێ: بە ڕواڵەت ئەو شتەی وەسف دەکردرێ کۆمەڵگا یا چۆنیەتی ژیانی گشتێکی زۆر لە جەماوەرە، بەڵام لە ڕاستیدا ڕوانگەیەکی زۆر تایبەتی کراوە کە بۆ مەبەستی لە خۆ گرتن و خۆیا کردنەوەی وێنەی تاکێکە و نەک وڵاتێک بێت بۆ نواندنی چەند کەس.

بەستێنی کۆمەڵایەتی ڕۆمانەکانی گراهام گرین (Graham_Green) (ڕۆماننووسی بەریتانیایی، ١٩٩١ـ١٩٠٤) نموونەگەلێکی باش لەم چەشنەن: ڕووداوی ڕۆمانەکانی ئەو لە برایتۆن، ئافریقای ڕۆژاوایی، مەکزیک و هیندوچیندا دەقەمێن؛ چەند تایبەتمەندی گرینگ لە نێوان کۆی ئەم شوێنانەدا هاوبەشە کە پێوەندییەکی بە چۆنیەتی ژیانی ڕاستی لەواندا

نیە،بەڵکوو ئاکامی ئەو شتەن کە کەسێتییەکان و نموونەی سۆزەکانی خودی گراهام گرین دەیهەوێ. کاتێک ئەم کارە بە روونی و بـە چەشـنێکی تـەواو عـەیار بکـردرێ (وەکـوو بەرهەمـەکانی کافکـا) لانی کـەم خوێنـەر، رێ و شوێن گـوم ناکـات؛ بەڵـام ئەغـلەب بـە پێچەوانـەی رواڵـەتی ریـالیزمی ئـەم رۆمانانە، هەمان نەبوونی هاوسەنگی لە مێژینە لەواندا بە دیارەوەیە. لە رۆمانی وەسـفیی کومەڵـگاخوازدا کـەموکورییـەکی هـەروەکوو ئەمـە لـە لایـەنێکی دیکـەوە هەیـە. لـە رۆمـانی کەسـێتی خوازیـشدا کەسـێتییەکان ناسـێنەری لایەنگەلێکی کۆمەڵگان و لـە رۆمـانی وەسـفیی کۆمەڵـگاخوازدا، کۆمەڵـگا نیشاندەری لایەنێکی کەسایەتییەکانە. هەروەکوو لـە یادتانـە، لـە هاوسـەنگیی مەبەستی ئێمـەدا، هـەم چۆنیـەتی ژیـانی جـەماوەر و هـەم کەسـێتییە تـاک و یەکەکان، بە رەها دادەندرێن.

ئەڵبەت لە زۆر رۆمانی کەسێتی خوازدا کە لە چەشـنی خۆیانـدا بـە چەشـنی ئاسایی باشـن، چۆنیـەتی ژیـانی کـۆی جـەماوەر تەنانـەت بـەم چەشـنە نیـوە حەشاردراوەش نیشان نـادرێ، بەڵـکوو هـەر لـە پـەردەی شـێوەکاری پـشت دیمـەنی شـانۆ دەچـێ کـە کـەلوپـەل کـڕینی خەڵـک لـە شـەقام، دەسـت پێکردنی شەڕ، هاموشۆی پاسەکان، یان کەسێتی سەیر و سەمەرەی لاوەکـی سەر بە چینێکـی دیکـەی کۆمەڵـایەتی دەتـوانین لـەودا بـدینین. لـەم چەشـنە رۆمانانەدا، کۆمەڵگا لە دەرەوەی کۆی خەڵکە، باوەکوو بڕێجار تەنانەت بـە چەشـنێکی تونـدوتیژ خـۆی بـە سـەر خەڵـکدا دا دەسـەپێنێ. ئەڵـبەت دەبـێ ئەمەشمان لە بـەرچاو بـێ کـە رۆمـانی کەسـێتی خـواز کـە لەوانـدا نووسـەر بابەتێکی تایبەت هەڵدەبژێرێ و دەیخاتە ناوەندی سەرنجدانی خۆیەوە، زۆر بایەخدارن، لە بەر ئەوەی ئەزموونگەلێکی گرینگی بـێ ئـەژمار هـەن کـە بـە ئاشـکرا کەسـانە و تایبـەتن و نووسـەر دەتوانـێ بـە چەشـنێکی زۆر شـیاویی سـەرنجدان شرۆڤـەیان بکـات. بەڵـام بـە گومـانی مـن، لـە بەرابـەر هـەر

هەڵـبژاردنێکی هۆشـیارانەدا (وەکـوو بەرهەمـەکانی پرۆسـت کـە ناوەنـدی سەرنجدانێکی تـەواوەن سـەلماوی هەیـە و لـە عـەینی حاڵـدا بـە چەشـنێکی ناڕاسـتەوخۆ، وێنایـەکی پـسپۆڕانە لـە چۆنیـەتی ژیـانی کـۆی جـەماوەر بـە دەستەوە دەدەن)، رەنگە بتوانین هەزار شوێن بژمێرین کە سنووردار بوونیـان هەربە سۆنگەی نەبوونی ئاگـاداری و فامـست نـەکردنی ئـەم بابەتەوەیـە کـە چەندایەتی و چلۆنایەتی ژیانی کۆی جـەماوەر هـەتا تایبـەتی‌تـرین ئەزموونـە کەسانە و تایبەتییەکان دەخەنە ژێـر کاریگەرییـەوە. ئەڵـبەت چمـا کۆمەڵـگا بۆنووسـەرانی ئـاوا بۆتـە بابـەتێکی دەرهەسـتکارانە و خـەم و خورپەسـاز، لـە خەرابترین چەشنی رۆمانی کۆمەڵگاخوازدا،ئیدی نابێ سەرمان سووڕ بمێنـێ کە ئەوان هۆکارێک بۆ سەرقاڵبوون بەوانەوە نابینن. ئەم جۆرە رۆماننووسـانە جەخت دەکەن کـە مـرۆڤ لـە پلـەی یەکەمـدا مرۆڤـن و نـەک یەکـەکانی کۆمەڵگا، بە رای منیش تەواوەن حـەق بەوانـە. بەڵـام ئـەو شـتەی لـە چـاوی ئەوانەوە نەبیندراوە، هاوبەشییەکانی مرۆڤە کە بە رواڵەت «ریالیزمییـەکان» لـە بەرهەمەکانی خۆیاندا سەرنجیان ئەدایـە. کەسـێتی تـاک لـە هـەر گروپێکـی بیچکۆلانەدا بە خـاوەن بایـەخ دادەنـدرێ، بەڵـام لـە دەرەوەی گرووپـدا، تـا ئاستی هیچ دادەشکێتەوە. لە کاتی خوێندنـەوەی رۆمانگـەلی ئـەم چەشـنەدا، خوێنەر وای بۆ دەچێ کە رۆماننووس وتوویەتی «مرۆڤ خودی ئێمەین؛ ئەم شتانە بۆ ئێمە گـرینگن». ئـەم وتەیـە هـەر بـە واتـای فڕێـدانی کۆمەڵـگا یـان نیشانەی خۆبەزلزانین نیە، باوەکوو رەخنەگرتنێکی ئـاواش بـە جێیـە،بەڵـکوو نیشانەی فامست نەکردنی توخمی کۆمەڵایەتی لە ژیانی خودی ئێمەدایە. ئەم جۆرە رۆماننووسانە دەڵێن: «ئێمە بۆ خۆمان مرۆڤـین، خەڵـقین، خـەلق،تـەواو بوو و رۆیی. ئەو شتەی دەمێنێتەوە جیهانی هەبوون یـا کۆمەڵگا یا سیاسـەت و . . .ـــیە. یـانی ئـەو شـتە بێزارکەرەیـە کـە رۆژنامـەکان سـەبارەت بـەوان

دەنووسـن». ئێمـە مرۆڤـین؛ ئەمـە راسـتە،بەڵـام لـە راسـتیدا مرۆڤـێک لـە کۆمەڵگادایـن، هەر ئەم رایە تەواوی تەوەری رۆمانی ریالیزمی بوو.
زۆربەی رۆمانە وەسفییە کەسێتیخوازەکان،بە پێچەوانـەی سـنووردار بـوونی ئەم چەشنە رۆمانانە، دەستکەوتە گرینگەکانی رۆماننووسینن،بەڵام بە رواڵەت وەرچـەرخانێکی بـەرچاو لەوانـدا بـەرە بـەرە دەیانگۆڕێتـە سـەر چەشـنێکی دیکەی رۆمانی «کەسـێتیخـواز، یـانی رۆمـانی فەرموولـەی کەسـێتی» .لـەم چەشنە رۆمانەشدا هەروەکوو رۆمانی فەرموولەی کۆمەڵایەتی، نموونەیـەکی تایبەت لە کۆی ئەزموونەکانی مرۆڤایەتی جیا دەکەنەوە و لە پاشان لـە سـەر بنچینـەی ئـەو نموونەیـە، کەسـێتیگەلێک (نـەک کۆمەڵـگایەکی نـوێ) دەخولقێنن. وێڕای کەڵک وەرگرتن لەو شێوازە، زۆر رۆمانی گرینگ و لە چەشنی خۆیانـدا بایەخـدار، نووسـراون، بەڵـام بـە گومـانی مـن ئـەم چەشـنە نووسینە، هەروەها بەخێرایی دەبێتە هۆکاری کرانەوەی دەرگایەکی نـوێ لـە ئەدەبی چیرۆکیدا کە دەتوانین نێـوی بنـێین:« بـە تـەنیا چوونـە لای دادوەر». سەبارەت بە رۆمانی ئاوا دەتوانین بـڵێین لەوانـەدا تاقـە هـەر کەسـێتییەک بـە چەشنێکی هەژڵ «جیددی» شرۆڤە دەکرێ. ئەڵـبەت دەبـێ بـڵێینەوە کـە ئـەم شرۆڤەیە، لە راستیدا زۆر جیددییە. رۆمانی *وێنەی هونەرمەند لە تافی لاویـدا* بەرهەمی جەیمز جۆیس نەک هەر رۆمانێکی لەم چەشنەیە، بەڵکوو هەر ئـەم تایبەتمەندییـە تـەوەری سـەرەکی ئـەو پێکـدێنێ. هێنانـە گـۆڕێی نـاوی ئـەم بەرهەمە کەڵەکارە بـە مانـای سـەلماندنی چڕکردنـەوەی راسـتی و بـەرزایی راستی شێوازی چیرۆکنووسینە کە ئەو تایبەتمەندییـە باسـکراوە، زەمانـەت و پشتگیری لێکراوە. لەم رۆمانەدا جیهان بە پێی هەستەکانی مرۆیەک پێکـدێ، بە وتەیەکی دیکە، جیهان ناگێڕدرێتەوە و ئێمەش هەست بە مەودا و نێوانێک دەگەڵ ئەودا ناکەین، بەڵکوو جیهان هەر بەو چەشنەی لـە راسـتیدا هەیـە لـە بەر چاوی دەگرین. جەیمز جۆیس لە رۆمانی *ئوولیسووس*دا جیهانی بە پێـی

زەینییەتی سێ کەس (نەک کەسێک) پێکهێنا و بەو کارە سەرەتاکانی بەرزی ئەم شێوازەی لە چیرۆکنووسیندا نومایش کرد.

لە *ئوولیسووس*دا، سێ روانگە یان سێ جیهانی جیاواز هەیە کە روانگە و جیهانی سێ کەسێتی بە نێوی ستیفن (Stephen) بلۆوم (Bloom) و مالّی (Molly)ن. بەڵام لە راستیدا ئەم سێ جیهانە پێکەوە جیهانێک پێکدێنن کە بریتییە لە جیهانی کۆی رۆمانەکە. ئەم هاوسەنگییە لە تەواوی *ئوولیسووس*دا بەرچاو ناکەوێ. ئاوێتەی سێ جیهانی باسکراو بە گشتی لە سێ بەش لە چوار بەشی سەرەتایی رۆمانەکەدا پێکدێ و بەشی چوارەمی رۆمانەکە، دۆخی پاژێک یا بەشێکی سەر بە خۆی هەیە. بەم حاڵەشەوە،نەریتی ریالیزمی لەم رۆمانەدا دەتوانین بە فۆڕمێکی نوێ بدینین. لەم فۆڕمەدا بە چەند تەکنیکی جیاواز سەرقاڵی شرۆڤەی هەمان ئەزموونەکانی لەمێژینەی مرۆڤ بوون.

ئەم دەستکەوتە لە پاش رۆمانی *ئوولیسووس*دا درەوشاوەیی سەرەتایی خۆی بزر کردووە، وەک شتێک دەڵێی ئەم تەکنیکەی رۆماننووسین بایەخی سەرەتایی خۆی نەماوە.

رۆمانی *زاری ئەسپ* نووسراوەی جۆیس کەری (Joyce Cary) (نووسەری بەریتانیایی، ١٩٥٧ــ١٨٨١) نموونەیەکی سەیرە. لە بەر ئەوەی نووسەر گۆشەنیگا و شێوازێکی لە جیهانڕوانینی تایبەتی هەڵبژاردووە و جیهانی پێ هەڵسەنگاندووە. ئەم راڤەیە هەروەها کلیلی فامستی رۆمانگەلێکی گشتخوازی تازەیە کە نموونەکانی بریتین لە: *ئەو هەستە نادیارە*، رۆمانی کینگزلی ئێیمیس (Kingsley-Amis) (نووسەری بەریتانیایی، بە دونیاهاتووی ١٩٢٢)، هەروەها رۆمانی *ژیان لە زەمانی ئێستادا*، رۆمانی جان واین (John-Wain) (رۆمانووسی بەریتانیایی، بەدنیا هاتووی ١٩٢٥). پارادۆکسی رواڵەتی ئەم رۆمانانە لەوەدایە کە لە لایەکەوە دەڵێی

ڕاستی‌نوماترین ڕۆمانی ئەم سەردەمەن (ئەو پێشوازییەی کە لێیان کـراوە بـەم هۆکارەوە بووە کە زۆربـەی هەسـت و سـۆزەکانی ڕاسـتیی ئێستایان تۆمـار کردووە)، لە لایەکی دیکەشەوە لـە ئاکامـدا ڕاسـتییان بـە گاڵـتە و تەوسـەوە نیشان داوە.

گرفتی گشت ڕۆماننووسانی ڕیالیستی سەردەم هەر ئەوەیە کە ئەم نووسەرانە لە سەرەتای ڕۆمانەکانیاندا هەستە ڕاستینەکانی مرۆڤ شرۆڤە دەکەن،بەڵام لە درێژەی کاریاندا بۆپۆزیتیو نیشاندانی ئـەو هەسـت و سـۆزانە، لێدەبـڕێن ئـەو جیهانە ڕاستییەی کە ئەم ڕووداوانە لەوێدا دەقەومێن،بەرەو کاریکـاتێر بـەرن. چارلز دیکەنزیـش کاتـێ لـەو شـتەدا کـە بـە ئاشـکرا دەیتـوانی بیـدینێ یـان بینووسێ دوچاری سنوور و گرفت دەبوو، هەر بەم چەشنە، گێـرە و کێـشەی بۆساز دەبوو، بەم مانایە، کاریکاتێرگەری و نقوومبوون لـە هەسـتەکاندا (ئـەم دیو و ئەو دیوی پووڵ و پارەیەکن کە لە بۆچوونە ناو پـەڕاوێزەوە کەڵـکیان لێ وەردەگیرێ). هێنانە گـۆڕێی ئـەم هەسـتانە لـە جیهـانی ڕاسـتیی خۆمانـدا (نەک لە جیهـانی ئـەو ڕۆمانانـەدا کـە لـە قەیرانـدا بـە چەشـنێکی تەوسـاوی دوچاری گۆڕانکاری دەبن)، لە ڕاستیدا بە واتـای گومـانکردن سـەبارەت بـە هەقدار بوونی ئەو هەستانەیە و ـ لەویش چەتوونتر ـ گومانکردن سەبارەت بە حەقدار بوونی ڕاستییە. بەڵام لە جێگای ئەم کێشە ڕاستییە، لە ڕۆماندا لە گەڵ ئاراسـتەی خەیاڵـات هەمبـەر دەبینـەوە: جـوێن فرۆشـی کەسـایەتییەکان لـە ئاخـــافتنی تەلەفۆنیـــدا، مژوولیـــایش کـــردن (ســـوخەنڕانی) لـــە لایـــەن کەسێتییەکەوە، یان دۆزینـەوەی کەسـێتییەکی تیپیکـاڵ کـە دەبێتـە مەبەسـتی هێرش بۆ بردن. بەوەیدا کـە ئەمانـە چـالاکترین نووسـەرانی ئێمـەن، گـرفتی دەورە و زەمانی ئێمە لە بەرچاوترین دۆخی خۆیدا وێنـا دەکـەن. قەڵـشت و درز لە نێوان هەستەکانمان و ئـەو شـتانەدا کـە لـە کۆمەڵـگادا دەیـدینین، بـە چەشنێکی پڕمەترسی زۆر و گەورەیە.

ئەدەبی چیرۆکیی *بە تەنها چوونە لای دادوەر* لە ئاشکراترین قاوغ و دۆخدا لە زۆربەی رۆمانەکانی سەردەمدا دەبینین کە لەواندا وێڕای یەکە و رەها کردنەوەی هەست و هەوجێکانی تاکێک، ئەو کەسێتییانەی دیکە بە پێی ئەو هەست و هەوجێیانە دەخولێن. ئەم چۆنیەتی کەسێتی‌سازاندنە لە گێڕانەوە گشت‌خوازییەکانی تاکەکەسدا زۆر و زەبەن بەرچاو دەکەون و ئەغڵەب گۆشەنیگای یەکەم کەس تاقە هەر بۆ ئەم مەبەستە دەکار دەکرێ. لە بەشەکانی نێوەڕاستی رۆمانی *هاکلبری فین*دا ـ رۆمانی مارک تواین ـ راستییەکی گشتی پێکدێ کە چوارچێوەی بەرین بوونەوەی گێڕانەوەی کەسانە و تایبەتی لەودایە. رۆمانی «*دەشتەوان*»ی دەیوید سەلینجەر (رۆماننووسی ئەمریکی، ١٩١٩ ـ . . . ) خاوەن تەوسێکە کە دەیپارێزێ، بەڵام لەم بابەتەوە کەم‌وکووڕی هەیە و ئەوەندەی بەشگەلی زیاتری لێدەخوێنینەوە، ئەم کەم‌وکووڕییەمان زیاتر بۆ دەردەکەوێ. رۆمانی *هۆدەی ژووروو* بەرهەمی جان براین (John Braine) (نووسەری بەریتانیایی، لە دایکبووی ١٩٢٢) بە جارێک تێکدەچێ، لە بەر ئەوەی راستییەکی دیکە لە بۆ گەڕانەوە بۆسەرچاوە هەبوونی نیە؛ تەنیا هەر هەمان ئاڵوێری لە مێژینەی بەزە و بێبەزەیی وەکوو خۆی ماوەتەوە کەلە باشترین دۆخدا ئۆین و ئەدایەکی ئاکاری نیگاتیوە. بۆ وێنە رۆمانی *ئەندامی نەریتی زەماوەندی* کارسن سمیت مەکالەرز (Carson Smith Macullers) (نووسەری ئەمریکی، ١٩٦٧ـ١٩١٧) بۆ هەڵسەنگاندن بدەنە بەر زەین کە ریالیستییە و راستیی هەستە کەسانە و تایبەتییەکان لەودا دەبنە خەیاڵاتکردن. لە کاتی کێشە دەگەڵ ئەو دنیادا کە دەبێ ئەم هەستانەی تێدا ئەزموون کرێ، ئاڵوێر دەکردرێ. یان رۆمانی «*سڵاو لە خەم*» نووسراوەی فرانسوا ساگان (Francoise Sagan) (ژنە نووسەری فەڕانسی، لە دایکبووی ١٩٣٥) لە بەر چاو بگرن کە کەسێتییەکان لەوێدا دەوێکی بەرچاویان هەیە، بەڵام

کردەیـان دەگـەڵ خەیاڵـاتکردنی کەسـایەتی سـەرەکی رۆمانـدا هەمبـەر کراوەتەوە. هەمبـەر کردنـەوە و پێکگـرتنی مەکالـەرز دەگـەڵ سـاگاندا لـە راستیدا پێکگرتن و هەمبەر کردنەوەی ریالیزم و گەندەڵبوونەکەیەتی. دەبـێ مایەی مەخابن و ئەسەف بێت کە هەموو وێنە هێنانەوەکانمان لە تێـداچوونی ریالیزمـە. گێڕانـەوەی یەکـەم کـەس کـە تـا ئـەو رادەیـە تەکنیکـەکانی بـە درەوشاوە داندراوە، لە ئێستادا ئەغڵەب حوکمی هۆکار و سۆنگەیەکی هەیـە بۆ ماقووڵ نواندنی ئەم تێداچوونە.

بەم حاڵەوە، ئەدەبی چیرۆکی *بە تەنها چوونە لای دادوەر* ئـەو رۆمانانـە دەگرێتەوە کە لە باری رواڵـەتییەوە هێـشتا لـە رۆمانـە ریالیـستییەکان دەچـن. بـۆوێنـە لـە رۆمـانی *گـەرمای رۆژی* ئـەلیزابێت بـۆئیندا ( Elizabeth Bowen) (ژنـە رۆماننووسـی ئیرلەنـدیایی، ١٩٧٣ــ١٨٩٩) کەسـێتییەکان لـە پلەی یەکەمدا لە جیاتی توخمگەلێکن لە وڵاتی سۆز و هەستەکانی کەسـێتی سەرەکیدا و لە سەر هیچ بنچینەیەکی دیکە نابیندرێن یان هەڵناسـەنگێندرێن، باوەکوو گێڕانـەوەی یەکـەم کـەس نیـە و تەنانـەت وەسـفگەلێکی ریـالیزمی وردیشی تێیا هەیە هەتا خوێنەر زۆر هەسـت نـەکات ئـەوا نووسـەر بـە تـەنێ چۆتە لای دادوەر.

رۆمانی کەسێتیخـواز لـە درێـژەی رەوتی کامـڵبوونی خۆیـدا، رەفـزی زۆربەی کەسـایەتییەکان دەکـات. لـەم چەشـنە رۆمانـەدا، راسـتیی کۆمەڵـگا وەلانراوە و دەیجا لە ئاکامدا هـەموو ئەندامـەکانی کۆمەڵـگا بـێج لـە چەنـد کەسێکی زۆر کـەم چارە ناچـار وەلا دەنـدرێن. بـەم چەشـنە نابـێ سـەرمان سوورِ بمێنـێ کـە بەشـێکی گـەورەی هەسـتەکان کـە لـەم چەشـنە رۆمانـەدا وەسف دەکردرێ، لە راستیدا دەبێ ئاکامی ئەزموونی تێداچوون بێ.

ئـەم پـۆلێن کردنـە چـوار لایەنەیـە (وەسـفیی کۆمەڵـایەتی،فەرموولـەی کۆمەڵایەتی، وەسفیی کەسێتی، فەرموولـەی کەسـێتی) لـە بـەر ئـەو مەبەسـتە

پێشنیاز دەکەم کە هەم بتوانین ڕۆمانی سەردەم بە گشتی ڕاڤە و شرۆڤە بکەین و هەم بتوانین وەسفێکیشمان لە نەریتی ریالیزم خستبێتە بەردەست کە ئەم چەشنە چوارانەیەی ڕۆمان بە چەندان چەشنی جیاواز بوونەتە جێگری ئەوان. پرسیارێکی کە ئێستا دەبێ وەڵامی بدەینەوە ئەمەیە کە بڵێی ئەم چەشنە چوارانەیەی کە نێوبردم کرد دەگەڵ چەشنێک ڕاستیی ئاڵوگۆڕ بەسەرداهاتوودا هاودەنگی هەبێ و نەریتی لەمێژینەتری بە ڕاستی وەکوو داشقە وەلا نابێ یان لە ڕاستیدا نیشانەکانی قەیرانێکی هەموو لایەنە لە ئەزموونـدان کە بە پێچەوانەی باروبەرهەم هێنانی ئەم هەموو بەرهەمە هونەرمەندانەیە، هەروەها بە بێ‌ئەوەی لێکدرابێتەوە درێژە دەدرێن و بە پێی پێویست دەبنە هۆی نارەزامەندی ئێمە. حەتمەن ناڵێم کە وەلانانی ئەم هاوسەنگییە ریالیزمییە بە چەشنێکی بە ئانقەستە بووە و ئەم جۆرە نووسەرانە بە قیرسیچمەییەکەوە کە زۆرێک لە خوێنەرانی گێژوویژ بەوانەوەی دەلکێنن، بە ئانقەستە پشتیان کردۆتە نەریتێکی لەمێژینە. بە ڕای من، ئەم قەیرانە ئەوەندە بەرین و بەربڵاوە کە ناتوانین بە سانایی و بە لۆمە کردن چارەسەری بکەین، دەسا لەم قاوغەدا شوناسی گشتی ئەم قەیرانە چییە؟

هۆکارگەلێکی تایبەت ڕاستەوخۆ لەم قەیرانەدا دەستیان تێدایە و شرۆڤەی ئەوان، بابەتەکە ڕوون دەکاتەوە. ڕۆمانی ریالیزمی بە پێی یاسا هەوجێی بە کۆمەڵگایەکی ڕاستی ڕاستی هەیە، یانی کۆمەڵگایەک کە ئەندامەکانی نەک هەر بە سۆنکەی پێوەندییەکەوە (بۆ وێنە پێوەندی پیشەیی،هەڤاڵانە یان بنەماڵەیی)، بەڵکوو بە سۆنگەی چەندان پێوەندی پێکەوە لکاوەوە، پێوەندییان بە یەکەوە هەیە. بە بێ ئەوەی بە زار بیڵێین دەزانین کە دۆزینەوەی کۆمەڵگایەکی ئاوا لە سەدەی بیستەمدا کارێکی چەتوونە.

ڕۆمانی *میدڵ مارچ* کۆیەک پێوەندی تایبەتی و بنەماڵەیی و پیشەیی لە خۆ دەگرێ و پێکهاتنی ڕۆمان بە گشتی لە ئەنجامی کارتێکردنی ئەم پێوەندییانە بە سەر یەکدیدا، لە ڕەوتێکی یەکە دایە، لە حاڵێکدا پێوەندی نێوان کەسایەتییەکانی زۆربەی ڕۆمانەکانی ئەم سەردەمە، تایبەتمەندییەکی تا ڕادەیەک تەک ڕەهەندی و مات بوون و بە بێدەوامەی هەیە. ئەڵبەت ئەم بابەتە،لە پێش ئەوەیدا کە گۆڕانکارییەک لە قاوغی ئەدەبدا بێ، گۆڕانکارییەک لە کۆمەڵگادا بوو (یان لانی کەم لەو بەشە لە کۆمەڵگادا کە زۆربەی ڕۆماننووسان زۆرترین هەڵس‌وکەوتیان دەگەڵیدا بوو). هۆکارێکی دیکە کە پێوەندی بە خاڵی نێوبردکراوەوە هەیە، بەڵام هەروەها لە ژێر کاریگەری هۆکارگەلێکی بەهێزی دیکە دایە،ئەزموونی تایبەت نومای ئەم سەدەیە، یانی دەربڕینی یەکە بوون و پاراستنی ئەوە (کە دیسانەکەش شەباهەتێکی زۆری دەگەڵ ئەزموونی مرۆڤ لە سەدەی هەژدەدا هەیە). ئەمە بەراورد کەنەوە دەگەڵ ئەزموونی تایبەت‌نومای مرۆڤ لە سەدەی نۆزدەهەمدا کە بریتی بوو لە دۆزینەوەی شوێن و ڕێک‌کەوتن. هەروەکوو هەر توێژەر و ڕەخنەگرێک دەزانێ ڕۆمانی سەردەمی ڤیکتۆریا ئەغڵەب وێڕای کۆیەک ڕێک‌کەوتن و بەرپرسی و ئیلتیزامی نوێ و پێوەندییە نەریتییەکان دەگاتە کۆتایی، لە حاڵێکدا لە کۆتایی ڕۆمانی سەدەی بیستەمدا مرۆڤێک خۆی لە دەست زاڵبوونی دیتران ڕزگار کردووە و لە بەر ئەوەی بەم کارە خۆی ناسیوەتەوە، دەست لە ماڵ و سامانی خۆی هەڵدەگرێ و بە تاقی تەنێ ڕێگایەکی تازە دەگرێتە بەر. ئەم چەشنە کردانەش لە پێش ئەوەیدا لە بەرهەمی ئەدەبیدا ببێتە یاسا و باو، لە ڕاستیدا ڕووی دەدا و دەقەوما. لە دەورە و زەمەنی گۆڕانکارییە گەورەکاندا، خۆ ڕزگار کردن و خۆ ناسینەوە و خۆ دۆزینەوە بەم شێوازە،بە بزووتنەوەیەکی پێویست و بایەخدار دادەندرا. سەربوردی تۆمار کراوی یەکەکان، مێژووی گشتیی

دەورەیەک پێکدێنێ. هەتا ئەو زەمانەی کە هێشتا دامودەزگا کۆنەکان هەر ماون و دامودەزگا زاڵبوونخوازەکان هەر وەها پێکدێن، ئەم دابڕانەش دەبێ هەر ئاوەها بەردەوام بێ، خۆ نیشاندانی یەکە و تاک دەبێ وەها قاوغ و ناوەڕۆکێک بە خۆوە بگرێ کە تەنانەت بتوانێ ببێتە تەنها بابەتی ئەدەب. لە بەر ئەوەی دەزانم چ زەخت و گوشارهایەک لە گۆڕێدایە، ئەم وەڵامانە دەسەلمێنم؛ بەڵام قسەی من ئەمەیە کە ئێمە بەرە بەرە دەگەین بە بن بەست و کۆڵینەوە و توێژینەوە بۆ گەیشتن بە وەسفێکی نوێ لە ریالیزم کە دەتوانێ ڕێگای دەربازبوون لەم بن بەستە بێ و دۆزینەوەی بەستێنێکی نوێ بێت.

ڕۆمانی ئەم سەردەمەش نیشاندەری قەیرانی کۆمەڵگای ئێمە و هەروەها دەبێ رووناککەرەوەی شوناسی ئەو بێت. ئەڵبەت دەتوانین هەروەکوو رابردوو هۆکارساز کەین کە هەر بە پێکهێنانی کۆمەڵگایەکی جیاواز دەتوانین گرفتەکانی ئەدەب چارە سەر بکەین. بەڵام ئەدەب ئەرکی خۆیەتی کە سەرقاڵی پاژەکانی ئەزموونگەلی بەڕاستی مرۆڤ بێت و هەر چەشنە گۆڕانکارییەکی بایەخدار راست هەر وەکوو ئەدەب کردن،بەرپرسانە و شیاوی ئەوەیە بە کردە بکردرێ.

لە سەرەتا و دەسپێکدا دەبێ ئەم دۆخی ئێستایە بناسین و بە گومانی من، تایبەتمەندی گرینگی ئەم بارودۆخە بە وردی بریتییە لە هەمان مەودای نێوان تاک و کۆمەڵگا بە دوو هەبوونی ڕەهاوە کە دووبارە وێناندنەوەکەی لە قاوغی ڕۆمانی سەردەمدا دەبینین. چالاکی بە راستی خوڵقێنەرانە لە سەردەم و زەمەنی ئێمەدا یانی خەبات بۆ پێکهێنانی پێوەندی بێ کەم و کووڕی، هەم لە ڕەهەندی کەسانە و تایبەتیدا و هەم لە ڕەهەندی کۆمەڵایەتیدا. بە وتەیەکی دیکە، دەبێ لە کردەدا فێر ببین کە چۆن پێوەندییەکانمان بەربڵاو بکەین، ریالیزم بەو چەشنەی کە لە نەریتی لەمێژینەیدا خۆیا بووە، یاسا و ڕێسایەکە بۆ پێکهێنانی ئەم مەبەستە، چونکە ڕەخنەی هزر بۆ جیهانی هەست

و رەخنەی تـاک بـۆنێـو کۆمەڵـگا و هـەر وەهـا گۆڕانکـاری بـەرەو قـورس وقایمبوون کە هەوجێیەکی ئاشکرا و زۆرمان پێی هەیە، لەم دەورە و زەمەنـە لـە یـەک هەڵـپچڕاو و دابڕدابـڕەدا بـە دەرکـەوتووە. لـە بـەرزترین فـۆڕمی ریالیزمدا، کۆمەڵگا لە بنـەڕەت و بنچینـەدا بـە پێـی تاکـەکان و تاکـەکان بـە سـۆنگەی پێوەندییەکانـەوە لـە کۆمەڵـگادا لـە بـەرچاو دەگیرێـن. یەکپارچـە بوونی ئەم دوانە، دەورێکی کاریگەر و دامەزرێنەری هەیە، بەڵام هەر بە پێـی ویـستن وە دەسـت ناکـەوێ. چمـا بێتـوو بـە دەسـتیش کـەوێ، حـوکمی دۆزینەوەیەکی ئەفرێنەرانەی هەیە و بۆی دەچێ هەر لە چوارچێوەی پێکهاتە و یاسای رۆمانی ریالیزمیدا بتوانین تۆماری بکەین.

لە عەینی حاڵدا، چونکە یەکپارچـە بـووتی تـاک و کۆمەڵـگا حـوکمی دۆزینـەوەی هەیـە و نـەک دووبـارە دۆزینـەوە،هـەر وەهـا چونکـە خۆزیـا بۆرابردوو و لاسایی کردنەوە لە نموونەکانی رابردوودا، نـەک هـەر شـیاوی نیە بەڵکوو هەروەها لەمپەر و راگرێکیشە لە کۆنـدا، ریـالیزمی نـوێ لـە هـەر دۆخێکـدا لـە گـەل ریـالیزمی سـەلەفی جیـاوزای دەبـێ و دەچێتـە رێـزەی دۆزینەوەکانی ریالیزمی کەسێتیخوازەوە کە دەسکەوتی گـەورەی سـەدەی بیستەمە. دەتوانین لایەنی تیۆریکی و گریمانەی ئەم بابەتـە وێـڕای ئامـاژە بـۆ دۆزراوە نوێیـەکان سـەبارەت بـە فامـست و پێوەندییـەکانی مـرۆڤ شرۆڤـە بکەین.

لە هەر حاڵێکدا فۆڕمی قەدیمی و ساویلکانەی ریالیزم ئیدی مردووە، لـە بەر ئەوەی لە سەر بنچینەی تیۆر و گریمانەیەک لە بەستێنی بینـینی سروشـتدا داڕژابوو کە لەمڕۆدا ناکرێ و ناگونجێ. لـە رابـردوودا فیکرمـان دەکـردەوە هەر ئەوەندەی دەوێ چاوەکانمان بکەینەوە تا تـەواوەتی جیهـانی یەکـسانی ببینین و هەر بەم هۆکارەوە دەمانتوانی وایدانێین کە ریالیزم تاک و تەرا هەر لە رەوتی تۆمار کردنی راستیدایە، کە نووسەر بە چەشـنێکی ناهۆشـیار چێـی

دەکا. بەڵام لەمڕۆدا دەزانین کە لە راستیدا خودی ئێمە خوڵقێنەری ئەو جیهانەین کە بە چاو دەیبینین و ئەم خوڵقاوەی دەست و زەینی ئینسان ـ یانی دۆزینەوەی چلۆن ژیان بە سەر بردن لەم جیهانە ماددییەدا ـ بە پێی پێویست شوناسێکی دینامیک و چالاکی هەیە. بەم چەشنە، ریالیزمی کۆن بووی بینەری بێ کردە کە تایبەتمەندییەکی نادینامیک و بەرەو مەرگی بوو، ئیدی لە نەریتێکی نەحاواوەی سەخت و رەق بەو لاوە هیچی دیکە نیە.

لە سەرەتای دۆزینەوەی ئەم بابەتەدا کە ئینسان بە سۆنگەی جیهانی فامستەکانی خۆیەوە دەژی و ئەم جیهانی فامستانە، شرۆڤەی ئەو لە جیهانی ماددی لە دەرەوەی زەینی خۆیدان، وا دادەندرا کە ئەم گۆشەنیگایە دەبێتە بناغە و دەستپێکێک بۆرەفز کردنەوەی ریالیزم، چونکە بە پێی ئەم تیۆر و بیرۆکەیە،هەر گۆشەنیگایەک بە پێی پێویست پاڵپشتی بە بینەرەکەیەوە هەیە. باڵام هونەر هەر فامستی راستی نیە، بەڵکوو چەشنێکی تایبەت لە تێکۆشان و چالاکییە و بەشێک لە کۆی پێوەندییە مرۆڤایەتیەکانە. دەیجا راستی شتێکە کە مرۆڤ لە ریگەی کار یا زبانەوە، تایبەتمەندییەکی گشتی دەدەنێ. بەم چەشنە، ئەم ئاڵوێرە کردەییە لە نێوان ئەو شتەدا کە مرۆڤ دەیدینێ و شرۆڤە و یاسامەندی دەکات و لە گەڵ ئەو شتەدا کە کۆمەڵگا راڤەی دەکا و دەیناسێ و قاوغی دەداتێ،ئەمە بە چەشنێکی ساماندار و زەریف لە فامست و پێوەندییەکاندا دەردەکەوێ.

حاڵیبوون لەم ئاڵوێرە بنەڕەتییە، زۆر دژوارە، بەڵام حەتمەن سەرە دەزوویەک بە دەستەوە دەدا هەتا باشتر بتوانین سەبارەت بە ئایدیۆلۆژی کەسانە و تایبەت و پێوەندییە کومەڵایەتییەکان و هەروەها پێوەندی تاک و کۆمەڵگا فیکر بکەینەوە. هەر کەسێک میراتبەری مۆخێکە کە بەرە بەرە لە مرۆڤدا کامڵ بۆتەوە و بەردی بناغەی هاوبەشی ئەو و ئینسانەکانی دیکەیە. مرۆڤ بە سۆنگەی ئەم میراتەوە هەروەها بە هۆی ئەو فۆرم و قاوغانەوە کە

کەلتووری فێر دەکەن، چۆنیەتی روانین لە جیهان فێر دەبێ. بەڵام چونکە فێربوون رەوتێکی چالاک و دینامیکە و هەروەها بەوەیدا کە ئەو جیهانەی وا ئەو لێیدەڕوانێ، گۆڕانکاری بە سەردادێ و دەگۆڕدرێ، فامستەکان، شرۆڤەکان و نەریتە تازەکان، نەوەکوو هەر ئەگەری هەیە، بەڵکوو لە راستیدا پێویستە. ئەمە مەزنبوونی مرۆڤە کە لە سەر بناغەیەکی تاکە کەسییە، بەڵام مەزنبوونی شوناسی مرۆڤ لە ئاڵوێرێکدایە کە لە داهاتوودا دەتوانێ لە چالاکی تاکە کەسدا بۆ پێکهێنانی پێوەندی و گواستنەوەی ئەو شتانەدا کە فێریان بووە، هەروەها بەراورد کردنەوەی ئەوانە دەگەڵ ئەو راستییەدا کە خوومان پێگرتووە و پێکهێنانی راستییەکی نوێ بە سۆنگەی کار و زبانەوە، روو بدا و بقەومێ، راستی هەمیشە بە چالاکی هاوبەشی ئینسانەکان پێکدێ و هونەر یەکێک لە بەرزترین قاوغەکانی ئەم رەوت و پرۆسەیەیە. بەڵام دەبێ لە یادمان بێت کە لەم پرۆسەیەی بە پێویست دژواری پێکهێنانی راستییەدا،بۆی دەچێ کێشەیەکی زۆر پێکبێ و چەندان چەشنە شکست و ناکامی بێتە پێشێ. بە رای من لە دەورەی پێشکەوتنی لەڕادەبەدەری مرۆڤدا (وەکوو دەورەی ئێمە کە پێشکەوتنی مرۆڤ لەودا لە رادە بەدەر بووە و هەرواش دەڕوا و هەواش دەبێ) کێشەش بە چەشنێکی لە رادە بەدەر زۆر دەبێ و بۆی دەچێ برێک سەرنەکەوتن و تێکشکان لە تایبەتمەندییەکانی ئەم دەورەیە بێ.

تۆمار کردنی چەند و چۆنی ئەم چالاکییە بۆ مەبەستی لێکدانەوەی هەمە لایەنەی سەرنەکەوتن و تێکشکانی ئاوا لە هەموو لایەنێکەوە، ناکرێ بە سانایی لە بەد کەڵک وەرگرتن لە سەرنەکەوتن ـ کە بە بێ هەر چەشنە سەناعەت و تەکنیکێکە و. بە چەشنێکی ناشارەزایانە سەرسووڕهێنەرە ـ ناناسرێتەوە. لە غەیری ئەم دۆخەدا، روو دەکرێتە قاوغگەلێک کە ئەو راستییانەمان بە یاد دێننەوە وا لە رابردوودا فێریان بووین، تا لەم رێگەوە،

چەشنێکی تایبەت وەکوو «ئەگەرێک» وەبەر چاو بخەن. بەم چەشنە، یا دەتوانین کێشە کەم کەینەوە (هەروەکوو لە ڕۆمانی کۆمەڵگاخوازدا وا دەکرێ) یان دەتوانین زیادی بکەین (هەروەکوو لە ڕۆمانی کەسێتیخوازدا دەکرێ). لە هەر دوو دۆخەکەدا، ئاکامێکی بێج لە دوور کەوتنەوە لە ریالیزم بە مانای پێش نیاز کراوی من پێک نایە، چونکە ریالیزم بە وردی هەر ئەم کێشە زیندەیەیە کە لە قاوغێکی پێشنیاز کراودا وەدەست دەکەوێ. چ ئەم کێشەیە بە گرفتی تاک لە کۆمەڵگادا دابنێین و چ بە گرفتی وەسف کردنی بێنینە گۆڕێوە و بە ئاشکرای بزانین، لە هەر دۆخێکدا دەگەڵ کێشەیەکی خوڵقێنەر ڕووبەڕوو دەبینەوە. دەستکەوتی ریالیزم بریتییە لە هاوسەنگی بەردەوام، دەیجا نەبوونی هاوسەنگی لە چەندان چەشنی ڕۆمانی سەردەمدا دەتوانین هەم بە چەشنێک هۆشدار و وەخەبەرهێنانەوە دابنێین و هەم بە چەشنێک کێشە. حەتمەن چالاکی بۆ دەست پێڕاگەیشتن بە هاوسەنگی لە ڕۆمانی سەردەمدا، بە هەر حاڵ کارێکی ئاڵۆزکاو و دژوارە، بەڵام بێت و بمانهەوێ خوڵقێنەر بوونی خۆمان بپارێزین، ئەم چالاکییە و هەروەها ریالیزمێکی نوێ پێویستە.

## تێبینی و پەڕاویزەکان

١ـ بۆرژوایی و بۆرجوایی: هەردووکیان بە مانای نەریتی سەرمایەداری و دارایی و ماڵ و سامانخوازی دەوترێ
٢ـ نیچرالیزم: سروشتخوازی، شێوازی لێدوانی زۆر ورد و رەشبینانە لە ئەدەب و هونەردا.
٣ـ پەڕنیچرالیزم: ئەوپەڕی سروشتخوازی، لەولای سروشتخوازییەوە.
٤ـ رۆمانی کەسێتی خواز: رۆمانی سەبارەت بە کەسێتی.
٥ـ رۆمانی کۆمەڵگاخواز: رۆمانی سەبارەت بە کۆمەڵگا.
٦ـ رۆمانی فەرموولەی کەسێتی خواز: رۆمانێک لە سەر بناغەی تیۆر و فەرموولەی ناسینی کەسێتی.
٧ـ رۆمانی فەرموولەی کۆمەڵگاخواز: رۆمانێک لە سەر بنچینەی تیۆر و فەرموولەی ناسینی کۆمەڵگا.

# رۆمانی سەدەی بیستەم

نووسەر: دەیڤید دەیچز (David Daiches)
جان ستۆلووردی (Jon Stallworthy)

ساڵانی ١٩١٢ تا ١٩٣٠ زایینی «چاخە زێڕینە» ی رۆمانی مۆدێڕن و بەرهەمی رۆماننووسانێکی وەکوو: جۆزێف کۆنراد، جەیمز جۆیس ، دی ــ ئێچ لاڕنس ، ڤیرجینیا ڤۆڵف و ئی ئێم فۆرستەر بوو.
گۆڕانکاری تەکنیک و روانگەکانی ئەدەبی چیرۆکی لەم سە ردەمەدا بە گشتی سێ هۆکاری بوو. یەکەم هۆکار ئاگادار بوونی نووسەران لەو پێش بەستێنە چیرۆکە گشتییە بوو کە ئەوانی لە هەڵکڕاندن و لێحاڵیبوونێکی هاوبەش سەبارەت بە ئەزموونگەلێکی گرینگ دەگەڵ خەڵکی رەشۆکی و ئاساییدا یەکگرتوو دەکرد ، کە ئەمە ئیدی نەمابوو. لە رۆمانی سەردەمی ڤیکتۆریادا دەکرا قەیرانە سەرەکییەکانی گەڵاڵەی چیرۆک لە گۆڕانکاری پلەوپایەی کۆمەڵایەتی یان بارودۆخی ئابووری و ماڵ و سامانی کەسێتیە سەرەکییەکاندا نیشان بدرێ، بەڵام ئەم بایەخە گشتییانەی رۆمانی سەردەمی ڤیکتۆریا لە رۆمانی مۆدێڕندا جێگای خۆیان داوەتە چەندان چەمکی تایبەتی‌تر لە بایەخەکان کە پاڵپشتیان زیاتر بە سەلیقە و هەستی ناسیاری خودی رۆماننووسەکانەوەیە، نەک بە بیرۆکەی گشتییەوە. ڤیرجینیا ڤۆڵف ( لە باسێکدا سەبارەت بە جین ئاستین) دەنووسێ: «بڕوا پێکردن بەوەی کە هەڵکڕاندن و لێحاڵیبوونی کەسانە و تایبەتی ئێمە بە لای دیترانیشەوە

بەڕاست دەناسرێن ، ئێمە لە سنوور و کەندوکۆسپە تایبـەتییـەکانمـان ڕزگـار دەکات.» بەڵام ڕۆماننووسە مۆدێڕنەکان ئیدی نەیاندەتوانی بڕوایەکی ئاوایـان هەبێ. بەڵکوو دەبایە ڕوویان کردبایەتە کەسێتی و لە بۆ دۆزینەوەی چەنـدان هۆکار بە مەبەستی بـڕیار دەرکـردن سـەبـارەت بـەوەی کـام لایـەنی ژیـانی مرۆڤ خاوەنی گرینگییە «بە وتەیەکی دیکە ، بۆ هەڵبژاردنی یاساگەلێک بۆ مەبەستی هەڵبژاردنی بابەتی بەرهـەمـەکـانی خۆیـان»، لـە زەوق و سـەلیقـەی تایبەتی خۆیانیان کەڵک وەردەگرت. سەبـارەت بـەم هۆکـارە ، نووسـەرانی مۆدێڕن لێبڕابوون دروست بوونی بڕوای خۆیان سـەبـارەت بـە گرینگبـوونی ئـەو ئـەزموونـە مرۆڤـایەتییانـەی کـە بـە نێـوی بابـەتی بـەرهـەمـەکانیانـەوە هەڵیاندەبژارد، بۆ خوێنەرانیانی بسەلمێنن. بەم چەشـنە کـاری ڕۆمـاننووس بـە هۆی ئەو تەکنیکانەوە کە لە پەخشانی خۆیـدا دەکـاری دەکـردن ، دژوارتـر بوو، چوونکە ئیدی دەبایە لە جیاتی کەڵک وەرگرتن لە بایەخـە ئامـادەکـان کۆیەکی تـازەی لـە بایـەخـەکـان بنیـات بنایـە. ڤیرجینیا ڤۆڵـف تێکۆشـا بـۆ چارەسەرکردنی ئەم گرفتە بڕێک لە تەکنیکـەکـانی شـیعر لـە ڕۆمانـەکانیـدا دەکار بێنێ هەتا لەم ڕێگەوە هەڵکڕاندنی تایبـەتی ڕۆماننووسـی لـە بایـەخ و گومانی ئەوی سەبارەت بە جیهان نیشان دابێ . لە لایەکی دیکەوە ، جـەیمـز جۆیس هیچ هەوڵی نەدا تاکوو ڕوانینێکی تایبەتی یـەکـە کاریگـەر بکـات ، بـەڵـکوو لـە دژەکـردە بـۆ ڕووخانـدنی بایـەخـە گـشتییەکـان ، چـەشـنە نووسینەوەیەکی ڕەچاو کرد کە دەلالەتە جۆراوجـۆرەکـانی ئـەو، دەربـڕینی هاوکاتی ڕوانگە جیاوازەکان بێت و نووسەر لەم دۆخەشدا وێـڕای پاراسـتنی بابەتخوازیی«عینیت گرایی» فرەلایەنە ، نەبێتە پـشتیوان و پـارێزەری هیچکـام لەم ڕوانگانە و ــ ئەڵـبەت ئـەم چـەشـنە نووسـینە پێویـستی بـە پـسپۆڕییەکـی بەرچاو لە بەستێنی تەکنیکەکانی چیرۆکنووسیندا بوو. ـ

دووهەم هۆکاری گۆڕانکاری تەکنیک و روانگەکانی رۆمانی مۆدێرن ، هەڵکراندنێکی تازە لە چەمکی زەمان بوو. لە رۆمانی سەدەی بیستەمدا، ئیدی زەمان بە هەودایەک لە کاتە یەک لە پاش یەکەکان دانانـدرێ کە بڕیار وابێ رۆماننووس بە نۆرە و جاروبارە بە نیگایەکی مەبەستدار و بە ئانقەستەوە بۆ رابردوو پێشکەشی بکات، وەکوو( ئەم بابەتە وەیادی هێناوە کە ...، یان وە یادی هاتەوە کە ... و . . . ) بەڵکوو پرۆسە و رەوتێکی بەردەوام لە زەینی تاکدا دادەندرێ کە لەوێدا ، رووداوەکانی رابردوو بەردەوام دەڕژێنە زەمانی ئێستاوە و روانینی دووبارە بۆ رابردوو دەگەڵ پێش‌بینینی داهاتوو ئاوێتەی یەکدی دەبن. ئەم هەڵکراندن و بۆچوونە نوێیە بۆ زەمان ، پێوەندییەکی چڕوپڕی دەگەڵ سێهەم هۆکاری کاریگەر لە گۆڕانکارییەکانی رۆمانی مۆدێرندا هەیە: تێفکرینە تازەکان سەبارەت بە سروشتی زە ین کە بە چەشنێکی گشتی لە توێژینەوە و کۆڵینەوە رێ‌خۆشکەرەوەکانی زیگمۆند فرۆید و کارل گۆستاف یۆنگدا سەبارەت بە ئاوەڵناوی ناهۆشیار «نەست و ناهۆشیار»ەوە خۆیا دەبێ. بەڵام هەروەها بەشێک لە روانگەی زاڵی زەمان بوو و تەنانەت لە رۆمانی ئەو نووسەرانەشدا کە بەرهەمەکانی هیچکام لەم دوو دەروونناسەیان نەخوێندبۆوە ، بەرچاو دەکەوت. بە پێی ئەم تێفکرینە نوێ یانە ، زەینی مرۆڤ خاوەن سروشتێکی چەند لایەنەیە ، رابردوو بەردەوام لە یەکێ لە لایەن و رووکەشەکانی زەینی ئێمەدا ئامادەیە و هەمیشە کاریگەری بە سەر دژەکردەکانی ئێستای ئێمەدا هەیە. لە فەرەنسادا مارسێل پرووست لە ماوەی زنجیرەی چەند بەرگی رۆمانی بەرزی «بە دووای زەمەنی لە کیس چوودا» لەم بابەتەی کۆڵیبۆوە کە چۆن رابردوو کاریگەری بە سەر ئێستادا دەبێ و چۆن بیرەوەری دۆخ و قاوغ ئەداتە زەینییەتی ئێمە. ئەم روانگەیە کە دەڵێ (ئێمەی مرۆڤ لە

بیرەوەری بەدەر هیچ نین ، زەمـانی ئێستای ئێمـە کـۆی داهـاتی رابـردووی ئێمەیە ، کە بە لێکۆڵینەوە لە زەینی ئینساندا، دەتوانین سـەرەنـدەری هـەمـوو شتێ سەبارەت بە ئینسان بکەین ، بـە بـێ ئـەوەی پێویـست بـێ چـاوەنـوارِی تێپەڕبوونی ساڵژمێری زەمەن بین هەتاکوو ئەوانـە لـە بـارودۆخی دژواردا بـە ئێمە بناسێنێ ،) ئـەمانـە بـە زۆرە ملـە و چـارە ناچـار بوونـە هـۆی شـۆڕش و گۆڕانکاری لە تەکنیکی رۆماننووسیدا ، لە بەر ئەوەی ئیـدی رۆمـاننووس لـە جیاتی ئەوەی رووداوەکانی رۆمـان بـە چـەشـنێکی راسـتەوخـۆ لـە مـەودای زەماندا بەرنە پێشەوە، دەیانتوانی بە کۆڵینەوە لە قووڵایی زەیـن و بـیرەوەری کـەسـێتییەکـان ، رۆمانێـک بنووسـن کـە بـە رواڵـەت تاقـە رۆژێکـی ژیـانی کەسێتییەکی سەرەکی لە خۆ دەگرێ ( وەکوو رۆمانی *ئـوولیس*ی جـەیمز جۆیس و *خاتوو دەلۆوی* ڤیرجینیا ڤۆڵف).

ئەم روانگەیە سەبارەت بە کردەی هاوکاتی رووکەشەکانی چـەنـد لایـەنـەی زەین وێڕای ئەو روانگەیەی کە زەمان بـە پرۆسـەیـەکـی بـەردەوام دادەنـێ، نەک کاتە پچڕپچڕە جیا لە یەکەکان، بەو مانایە بوو کە رۆماننووسـەکـان لـە جیاتی ئەوەی گەڵاڵەیەکی دەرەکی لە گێڕانەوەیەک لە سەر بناغەی نەریتی زەمان بە دەستەوە بـدەن، وایـان پـێ باشـتر بـوو لـە زەیـنی کـەسـێتییەکـانی چیرۆکەکانیاندا بین بخۆنەوە و لەم رێگەیەوە سەربووردی ئە وان بگێڕنـەوە. تە کنیکی » شەپۆلانی زەیـن« کـە نووسـەر وێـڕای کـەڵـک وەرگـرتن لـەو تێدەکۆشێ بنەمای زەینیی کەسێتییەکان راستەوخـۆ و بـە بـێ گێڕانـەوەی تـە واو عەیار و بێ کەم و کووڕی نیشان بدات، لە دەیەی ١٩٢٠ دا بە چـەشـنی میتۆدێکی تازە و گرینگ لە رۆماننووسیندا دەکار کرا . ئەم تـەکنیکـە، لانی کەم بۆ ئەو کەسانەی کە هەر خوو و خدەیان بە تـەکنیکـەکـانی پێشووتری رۆمانـەوە گرتبـوو ، خوێندنـەوەی دژوارتـر دەکـرد، لـە بـەر ئـەوەی هـیچ

«دەروازەی ڕێنوێنی»یەک دەکار نەکرابوو هەتاکوو خوێنەر بتوانێ زانیاری سەرەتایی پێویست لە بۆچوونە ناو جیهانی ڕۆمانەکە وەدەست خات ، بەڵکوو ئەم زانیارییانە هاوکات دەگەڵ بەرەو پێشەوەچوونی ڕووداوەکانی ڕۆمان، لە زەینی کەسێتییەکانەوە و لە نێوان دژکردەی ئەوان سەبارەت بە زەمانی ئێستا و وێڕای دەنگدانەوەکانی زەمانی ڕابردوو، وەچنگ دەکەوت. ڕۆماننووسان بە پێچەوانەی ئەو کارەی لە ڕابردوودا «باو» بوو، سەری تاڵە دەزوویەکیان بۆ خوێنەر دانەدەنا هەتاکوو سەرەندەری چۆنیەتی هەموو شتێ بکات، چوونکە بە بڕوای ئەوان ئەم کارە لێحاڵیبوون و هەڵکڕاندنی ڕاستەوخۆی خوێنەر ڕەفز دەکاتەوە. بەڵام لە گەڵکوو خوێنەر فێر بێ کە چۆن ڕێگای خۆی لەم وڵاتە بە بێ نیشانەی ڕێنوێنییەدا بدۆزێتەوە، وردبینینێکی تازەی لە بەستێنی ئیدراک «لێحاڵیبوون» و جوانییەتازەکانی هەرێمی ناسیاری ڕاستەقینەدا وەدەست دەکەوێ .

سەرنجدان و وردبوونەوە لە «شەپۆلانی زەین» و وەیادهاتنەوەی فیکرەکان لە زەینی تاکدا، لێبڕاوانە گەیشتە ئاکامی جەخت کردن لە سەر تەنیایی سروشتی تاک؛ لە بەر ئەوەی هەر زەینییەتێک خۆی لە خۆیدا تاکە و جیاوازی دەگەڵ زەینەکانی دیکەدا هەیە و؛ چما ئەم جیهانە ڕاستە قینەیەش کە تێیایدا دەژین هەر ئەم جیهانە تاک و کەسێتییەی ناو زەینی ئێمە بێ، چما ئەو بایەخە گشتییانەی کە لە ناو کۆمەڵگادا مەجبوورین لە قسەدا یارمەتیدەری بین، ئەو بایەخە ڕاستەقینەیە نین کە واتا دەدەنە کەسێتی ئێمە، دە یجا هەموومان بەرحوکمی ئەوەین کە لە بەندیخانەی زەینییەتی سەرەندەر نەکراوماندا درێژە بە ژیان بدەین. چلۆن دەتوانین لە جیهانێکی ئاوهادا هەڵس و کەوتمان دەگەڵ دیتراندا هەبێ؟ ئەو فیگۆرە گشتییانەی کە کۆمەڵگا بە سەر ئێمەیدا دادەسەپێنێ؛ ببڕابڕ ناتوانێ دەگەڵ پێداویستییەکانی

نـاخ و هـەناومانـدا سـازگاری هـەبـێ . ئـەم فیگۆڕانـە بـە واتـای ناحـەزی و شەوەجیاواز و بە بێ دەروونن و چـەشـنێک هاوتـابوونی گـەنـدەڵ بـە سـەر جوانییەکانی بێ سنووری ئەزموونەکانی مرۆڤایەتیماندا دادەسەپێنن .

بێتوو هەوڵ بدەین بە چەشنێک سروشتی راستەقینەمان نیشان بدەین، کاتێـک ئەو هەوڵدانە لە لایەن سروشتێکی دیکەوە بخوێندرێتەوە کـە کـەسـێتییەکـی تەواوەن جیاوازی دەگەڵ ئێمەدا هەیە، حەتمەن خەراپی سەرەندەر دەکـات. بەم هۆکارەوە، نێوەرۆکی زۆربەی رۆمانە مۆدێرنـەکـان بـریتین لـە ئیمکـانی پێکهاتنی ئەوین و پێکهێنانی هەڵس و کەوتی سۆزخوازانە لە نێو زەینە تاک و تایبـەتـەکانـدا.نێـوەرۆکـی رۆمانـەکـانی جـۆیس و ڤۆڵـف و فۆرسـتەر و کۆنراد(لە ئەندازەیەکی کەم و زۆر جیاوازدا و نەک هەمیـشە بـە چـەشـنێکی راسـتەوخـۆ) روخـسارگەلێکـی جیـاواز هـەر لـەم نێـوەرۆکـەن. تـەقـالا و هەڵـسووڕانی لیئۆپووڵـدبلوم لـە رۆمـانی *ئـوولیس*دا بۆمـەبـەستی پێکهێنـانی هەڵس و کەوتی رۆحانی یە و دوورەپـەرێـزی مـەجبوورانـەی ئـەو، حـاڵ و رۆژی مرۆڤ لە روانگەی رۆماننووسەوە بە چەشنێکی هێمایین و سەمبۆلیک نیشان دەدا. فۆرستەر بە توێژینەوە لەو عورف و نـەریتانـەی کـە بـە رواڵـەت ژین و ژیان ئاسانتر دەکەن، بەڵام لە راستیدا دەبنە دژی پێکهـاتنی پێـوەنـدی راستینەی مرۆڤایەتییەکان، ڤۆڵف بە وێناکردنی پێوەندی نێوان هەوجێی زات و سروشت بۆخـەڵـوەت و هـەوجێی زات و سروشـت بـە هـەڵـس و کـەوتی راستەقینە،دەست دەکەن بە لێکۆڵینەوە لە سەر چۆنیەتی ژین و ژیانی ئینـسان لەم خولە نوێیەدا . نێوەرۆکی هەموو رۆمانـەکـانی لاڕنـس، پێـوەندییـەکـانی مرۆڤە و ئەم نووسەرە تەواوەتی ماوەی نووسەرایـەتی خـۆی کـەم و زۆر لـە پێناوی ئـەم توێژینـەوەیـە سـەبـارەت بـە روخـساری ئاڕمـانج خوازانـەی ئـەم پێوەندیەدا تەرخان کرد. بە بڕوای لاڕنس عورف و نەریتە بە بێ رۆحەکـانی

کۆمەڵگا،چەمک گەلێکی وەکوو کردەوەی پەسند و شیاوی رێز و دەغەڵبازییەکان و جامەلووسیکیە باوەکانی ژیانی چینی نێوەڕاستی کۆمەڵگا وەکوو دەسەڵاتخوازی و پووڵ و پارەپەرەستی و داواکاری سەرکەوتن، پێوەندییەکانی مرۆڤ زۆر بە سانایی لە نێوەرۆکی رەسەنی خۆی بەتاڵ دەکەن . بە متمانەوە دەتوانین بڵێین : درەوشاوەترین رۆمانە مۆدێڕنەکان سەبارەت بە دژواربوون و لە هەمان حاڵدا لێبڕانی ئینسان بوونە . لە راستیدا، ژیانی مرۆڤ لەم رۆمانانەدا هەروەها چەتوون و بێ سەرەوبەرەیە. بەڵام ئاگاداربوون لەو شتەی کە دیترانیش ئەم دژوارییەیان هەیە ( ئاگادارییەکی کە لە رۆمانی *ئوولیسوس*دا زۆر عالی کاریگەری دەبێ و فۆرستەریش بە تەوس و توانجێکی زۆرەوە دەینوێنێ) ،دەتوانێ هەم رووناک کەرەوە و هەم هێمنایەتی بەخش بێت .

ئەڵبەت تەواوی رۆماننووسانی ئەم خولە سەرقاڵی ئەم نێوەرۆکانەی سەرەوە نەبوون و تەکنیکی نوێی شیاوی ئەم نێوەرۆکەیان دەکار نەکرد. رۆماننووسانی «بەڵگەنامە نووس» وەکوو ئارنۆڵد بنێت و جان گالزووردی و ئێچ ـ جی ـ ڤۆڵز لانی کەم لە بڕێک لە رۆمانەکانیدا ـ زۆر جار بە پسپۆڕییەکی زۆرەوە روخساری بەرەو گۆڕانکاری کۆمەڵگایان وێنا کردووە و بە کردەی کەسێتی رۆمانەکانیان، زانیاری و هاودەردییەکی زۆریان لە تۆمارکردنی لایەنە جۆراوجۆرەکانی ئە م گۆڕانکارییە لە خۆیانەوە نیشان داوە. ویرجینیا ڤۆڵف ناوی ئەم چەشنە نووسەرانەی نابوو «مادە خواز = مەتریالیست» ، چونکە بڕوای وابوو کە ئەمانە رواڵەت دەنوێنن و بەس، ئیدی لەو لایەنانەی زەین یا ژینی ناوەکی و راستیی ئیمە ناکۆڵنەوە کە لە خۆگری سروشت و هەناوی ئێمەن . لەبەر ئەوەی ڤۆڵف بۆ دادوەری سەبارەت بە بەرهەمی ئەو نووسەرانە یاسا و رێسای ناشیاوی دەکار دەکرد،

رەنگە بتوانین بڵێین دادوەرییەکەی ناعادڵانە بووە. وێڕای ئەمانە، رەخنەی ئەدەب لەم خولی هاوسەردەمەدا درووستی بیر و بڕوای ئەوی سەلماندووە. لە زۆربەی ئەدەبی چیرۆکی مۆدێرندا (بەڵکەم لە هەموان زیاتر لە *ئوولیس*دا) پاژەکانی رووکەشی سەرەوەی چیرۆک کە دەڵێی خاوەنی پێوەندییەکی لۆژیکی نین، لە راستیدا بنەمای ژێرەوەی ئەویان لە هەر بابەتێکەوە حەشار داوە. ئەمە یەکێ لە داهاتەکانی ئاوێتە کردنی ریالیزم و سەمبۆلیزم، یان تێکەڵ کردنی شیمانەی رووداو و قەومانی رووداوێک لەم سەردەمەدایە و دەلالەتێکی هەمیشەییە. ئەڵبەت لە ئەدەبی چیرۆکی درەوشاوەی هەموو سەردەمێکدا، ئاوێتە کردنی ئاوا دەکردرێ، بەڵام نووسەرانی مۆدێرن لە چاو پێشینیانی خۆیان ئەم پێکەوە ژیانەیان بە خۆهۆشیارییەکی زیاترەوە پێکهێنا.

---

تێبینی و پەراوێزەکان:

١ـ رەوتی شەپۆلانی زەین: شێوازی نوواندنی دەروون و زەین و هۆشی مرۆڤ لە چیرۆک و رۆماننووسیندا، فارسەکان پێیدەڵێن «پروسەی سێال رهن»، لە کوردیدا بە رەوتی شەپۆلانی زەین و پرۆسەی سێلاوی هۆش دەناسرێ.

٢ـ جوزێف کۆنڕاد: (١٩٢٤-١٨٧٥) رۆماننووسی بە رەگەز پۆڵاندیایی کە بەرهەمەکانی بە ئینگلیزی دەنووسی. لۆرد جیم ـ لاوی ـ دڵی تاریکی ـ لە چاوی رۆژئاواییەکەوە، لە رۆمانەکانی ئەون.

٣ـ جەیمز جۆیس: (١٩٤١-١٨٨٢) رۆماننووسی ئیرلەندیایی خاوەن رۆمانی ئۆلیسووس و وێنەی هونەرمەند لە تافی لاویدا و فینەگانەکان و کۆچیرۆکی دوبلێنییەکان.

٤ـ دی ئێچ لارنس: (١٩٣٠-١٨٨٥) رۆماننووسی ئینگلیزی و خاوەن رۆمانی خاتوو چەترلی ـ رێوی ـ ئەوین لە ناو کۆما یۆنجەکاندا و . . . .

٥ـ ڤیرجینیا ۆڵف: (١٩٤١-١٨٨٢) خاتوو رۆماننووسی ئینگلیزی و خاوەن رۆمانی شەپۆلەکان ـ خاتوو دەلۆڤی ـ بەرەو فانووسی زەریایی و . . . .

٦ـ ئی، ئێم، فۆرستەر: (١٩٧٠-١٨٧٩) رۆماننووس و رەخنەگری زۆر نێوداری ئینگلیزی و خاوەن کتێبی تیۆری «لایەنەکانی رۆمان» و رۆمانی گەشتێ بە ئیندیادا.

٧ـ زیگمۆند فرۆید: (١٩٣٩-١٨٥٦) دەروون ناس و دەروون توێژەری نەمسایی «ئۆتریشی».

٨ـ کارل گۆستاف یۆنگ: (١٩٦١-١٨٧٥) دەروون ناسی سویسرایی، لە پێشدا قوتابی فرۆید بوو، لە پاشان شێوازێکی جیاوازی گرتە بەر و بۆ ناسینی دەروون بایەخی دەدایە سەمبۆل و تۆتەمەکانی مرۆڤ.

٩ـ مارسێل پرۆست: (١٩٢٢-١٨٧٥) رۆماننووسی مۆدێرن و نێوداری فەرەنسی و خاوەن رۆمانی هەشت بەرگی «بە شوێن زەمەنی لەکیس چوودا» و . . .

# سەرەتایەک بۆ رۆمانی مۆدێرن

**نووسەر: ئارنۆصد کێتص (Arnold Kettle)**

ئا:یەکەم چارەکی سەدەی بیستەم

بە چیرۆکەکانی جۆزێف کۆنرادەوە «Joseph – conrad» رۆمان بووە خاوەن شوناسێکی سەدەی بیستەمی و ئەمەش هەر بە هۆکاری زەمەنی بڵاوبوونەوەی بەرهەمەکانی ئەوەوە نیە، بەڵکوو روانگەی مێژوویی بە گشتی گۆڕانکاری بە سەردا هات. جیهانی رۆمانی *ناسترۆمۆ* nnastromo «ناوی یەکێک لە رۆمانەکانی کۆنراد» جیهانی ئەمپریالیزمی سەردەمی نوێ، شەڕ و توندوتیژی و هۆردووگاکانی کاری بێگاری - بە زۆری - جیهانی ئینسانی دەربەدەر و ئاوارە و دەروون شێواوی خەڵکی ئاسایی و رەشۆکییە، ئەویش بە چۆنیەتییەکی وەها قووڵ و بەرین و بەربڵاوەوە کە دەگەڵ هیچ بڕگەیەک لە مێژووی ئەزموونەکانی رابردووی ئینساندا بەراورد ناکرێ.

دارمانی کۆمەڵگای بۆرجوایی سەردەمی ڤیکتۆریا گەیشتۆتە قۆناغێکی دژوارتر کە لە رۆمانی «*بڵندایيە باگرەکان*»ی ئێمیلی برۆنتێدا پێش بینین کرابوو، ئەو قۆناغەی کە ئیدی تەواوی دەمامکەکانی دووڕوویی و خۆ بە چاک نواندن و خۆ بە خاوەن ئاکاری پاک و خاوێن و باش نواندن لابردراون و گێرە و کێشمەوکێشەی وەکوو شەڕی نێوان خەڵکی رەشۆکی، قەیرانێکی ئابووری چاوەڕوان نەکراو و پێکدا هەڵشاخانی شۆڕشگێڕانەی چینە دژ بە یەکدییەکان، تایبەتمەندییەکی راستەوخۆ و خۆیایان بە خۆوە گرتووە.

سەیر و سەمەرە نیە کە راویژی زۆربەی بەرهەمەکانی سەدەی بیستەم، بێج لەو روانگەیەی کە لەواندا هاتۆتە ئاراوە، راویژێکە کە لاوی کە و رەها نەبوون «نەبوونی رەهایەتی». تەنانەت لە رۆمانەکانی خاوەنگەلی هێدی و هێمنترین خووخدە، خاوەن سروشتی هەرە زەریف و بە رواڵەت دوورەپەرێزترین رۆماننووسانی سەدەی بیستەمدا یانی کەسانێکی وەکوو ئی ـ ئێم ـ فۆرستەر و ڤیرجینیا ڤۆڵف هەستی گوشار و بێ ئەمنایەتی تەواوەن لە بەرچاوە .گشتمان وای دادەنێین کە بە هۆکاری ئاڵۆزکاوی لە رادەبەدەری ژین و ژیان لەم سەردەمە نوێیەدا، هەروە ها بە هۆکاری نەبوونی سەقامگیربوون و نەبوونی رەهایەتی لەم سەردەم و زەمانەی شۆڕشگێڕییەدا کە هەموو شتێ بەردەوام گۆڕانکاری بە سەردا دێ، چیرۆکنووسینیش لە رادەبەدەر دژوارە. لەم نیگایەدا ، بارودۆخی گشتی کۆمەڵگای ئینگلیزی لەم پەنجا ساڵەی ئەم دواییانەدا، حەتمەن ئەم روانگەیە دەسەلمێنێ.

ئەڵبەت لەم نووسراوەیەدا، مۆڵەتی شیکاری کردن یا ئاخافتنێکی هەمە لایەنەمان سەبارەت بە بارودۆخێکی ئاوا ئاڵۆزکاو و مایەی سەرەگێژە نیە و منیش لە جیاتی هێنانە ئارای ئاکام گرتنە گشتییەکان کە لە نووسراوەیەکی ئاوا کورتدا ناسەلمێندرێن، هەر دەمهەوێ ئاماژە بۆ چەند خاڵێکی گرینگی ئەم باسە بکەم:

١ـ خاڵی هەرە بەرچاو لە برێ لایەنەوە سامناکترین تایبەتمەندی گۆڕانکاری رۆمان لە سەدەی بیستەمدا قەڵشت و مەودایەکی بەرەو زۆربوونە کە لە نێوان رۆمانە «باشەکان» و رۆمانە گشتخوازەکاندا پێکهاتووە. لە لایەکەوە، زۆربەی ئەو رۆمانانەی کە دادوەران و رەخنەگرانی رووناکبیر زۆریان بە سەردا هەڵدەڵێن و پێیان بایەخدارن، تەقریبەن خەڵکی ئاسایی هەر نایانخوێننەوە (لە سەردەمێکدا کە واڵتر سکات و چارلز دیکەنز رۆمانیان دەنووسی، بارودۆخ

ئاوا نەبوو) لە لایەکی دیکەوە رووناکبیرانیش بە دید و نیگایەکی زۆر سووکایەتی پێکردنەوە دەڕواننە ئەو کتێبە عامخواز و پڕفرۆش و نیوە رووناکبیرانەیەی کە زۆرینەی خەڵقی رەشۆکی پەسندیان دەکەن ، رووناکبیران ئەم کتێبانە هەر ناخوێننەوە. داهاتەکانی ئەم بارودۆخە هەر وەک هۆکارەکانی، جۆرانجۆرە. بە بازرگانی بوونی ئەدەب، نەک هەر کاریگەرییەکی کارەسات سازی بە سەر مەزندەکردنی خەڵکەوە بۆ پەسندکردنی کتێب داناوە، بەڵکوو هەر وەها بۆتە هۆکاری ئەوەی کە نووسەری «باش» هەستێکی بەهێز دایبگرێ کە مرۆڤێکی تەنیا و گۆشەگیرە و دەڤەرێکی زۆر سنووداری لە ئەزموونەکانی ئینسانی بە سۆنگەی رەزابوونی بەردەنگانێکی بە ئەژمار کەمەوە داوەتە بەر لێکۆڵینەوە . یەکێ لە ئاکامەکانی ئەم کارە ئەوە بوو کە لە زەینی ملیۆن بە ملیۆنی خەڵقی رەشۆکیدا، ئەدەبی «باش» بە راستی بە واتای تەم و مژ و دەستکرد و تەواوی تایبەتمەندییەکانی فیکری و کۆمەڵایەتی کردەی رووناکبیرانە دادەندرێ؛ لە عەینی حاڵدا، ئیدی زۆربەی نووسەرانی هزرساز خوازیاری خۆشەویست بوون لە لایان خەڵکی ئاساییەوە نین و هەر وەها بە چاوی سووکایەتی پێکردنەوە دەڕواننە خۆشەویست بوونێکی لەم چەشنە.

٢ـ بەم چەشنە، لەبەر ئەوەی ئیدی نووسەران خۆیان بە مولتەزەم نازانن تاکوو بەرهەمێک بنووسن کە بە چەشنێک بە گشتخواز دابندرێن، مەیل و لایەنگری ئەو دەستە نووسەرانەی کە لە بنەماڵەی توێژی رووناکبیری چینەکانی ناونجی کۆمەڵگادا لە دایک دەبن، یان خولق و خووی ئەم توێژەیان گرتووە بۆتە ئەوەی کە سەرقاڵبوونی فیکری خۆیان تا دەتوانن خەریکی کۆڵینەوە لە بەستێنی پسپۆڕیی حەساسییەتێکی تایبەت بۆ تاک و زیاتر زۆر ناتیپیکاڵ بکەن. تیۆر و بیرۆکەکانی دەروون زانستەکی فرۆید و

یۆنگ، هەروەها لایەنگەلێکی تایبەت لە نووسراوەکانی دەستایۆڤسکی و مارسیل پرۆست و بەرهەمە سەیروسەمەرە و دوژمنانەکانی کافکاشدا ئەم مەیلەیان توندوتیژتر دەکرد. هەستی گۆشەگیربوونی هونەرمەند ـ رووناکبیر لە کۆمەڵگای هاوسەردەمدا، لە بەرهەمەکانی کافکادا دەگاتە تەشقی خۆی، ئەو بەرهەمانەی کە لەواندا مەترسی و کابۆس دەبێتە راستەقینە و تاک لە جیهانێکدا گرفتار بووە کە نەک هەر لە گەڵ خودی ئەودا دژایەتی دەکردرێ، بەڵکوو رواڵەتەن کردەی مرۆڤیش کاریگەری بە سەردا دانانێ. شێوازی تێفکرینی سەلماوی ناو زۆربەی ئەو بەرهەمانەی هاندەری هزر لە سەدەی بیستەمدان، لە رادەبەدەر رەش بینانە و دەروون پەرێش و هیوا براوانەیە.

٣ـ تەنانەت لە بەرهەمی بەرچاوترین نووسەرانی ئەم دەورەیەدا (کۆنراد و لارنس و جۆیس) شەڕ و کێشەی نێوان رۆماننووسان و هەوێنی خاوی رۆمانەکەیان زۆرکات شەڕێکی نابەرانبەرە. هیچکام لەم نووسەرانە پێملی لایەنە گەندەڵەکانی کۆمەڵگای خۆیان نابن، بەڵام لە عەینی حاڵدا هیچکامیان هێز و توانای گەیشتن بە فەلسەفەیەکی تایبەت و لە ئاکامدا دید و بۆچوونێکی هونەری کامڵیان نیە هەتاکوو بەم پێیە توانایان هەبێ بە چەشنێکی تەواوەن رازی کەرەوە لە تەک ئەو دونیایەی سەروکاریان لە گەڵیدا هەیە رووبەڕوو بنەوە و بەسەریدا زاڵ بن. هەست کردنی گوشار،نەبوونی هێمنایەتی وێڕای نەبوونی متمانە بە زات و سروشتی خود (هێمنایەتی لە هەر نووسەرێکدا، چ فیلدینگ و چ تالستۆی )، ئیجازی لە رادەبەدەر ( چڕکردنەوەی بێ سنوور ) و مەیلی بەردەوام بەرەودواکەوتن لە سنووری ساخ و سڵامەتی دەروون بۆ نووسینی پڕ لە رەمز و نەهێنی، تەم و

مژاوی و بگێڕەوەی راپەڕینی دەروونی کە بە پێچەوانەی دەروشانەوەی رۆمانە مۆدێرنەکان لە بەرچاوە، هەر لەم کارەوە سەرچاوە دەگرێ.

٤ـ لە شانی رۆمانی نووسەرانێکی وەکوو کۆنراد، ڤیرجینیا ۆڵف، لارنس،جەیمز جۆیس و فۆرستەردا، لەم سەدەیەدا هەروەها بڕێک رۆمانی دیکەش لە روانگەی چینی کرێکارەوە بە واتای تایبەتی وشەوە نووسراوە کە ئەمە روانگەیەکی لە بنەڕەتدا جیاوازە.

هەرکام لەم رۆمانانە بایەخی تایبەتی خۆی هەیە و لەم نووسراوەیەدا ناتوانین بەو چەشنەی شیاوە باسیان لەسەر بکەین. بەس هەر لە رۆمانی «*مرۆخۆشەویستانێک بە شەڵواری کۆنەوە*» لە نووسینی رابرت ترسال و رۆمانی *کوایرێکی سکاتلەندایی* نووسراوەی لووئیز گراسیک گیبۆن وەکوو رۆمانهایەکی گرینگ و راچڵەکێنەر باس دەکەن کە لە بەستێنی مێژوویی خۆیاندا گێڕەوەری بەرهەمگەلی بزاڤێکی تازە لە ئەدەبی چیرۆکی دان.

٥ـ لە یەکەم نیوەی سەدەی بیستەمدا ، تەقەلای لە مێژینەی رۆمانی ئینگلیزی بۆ وەدەست خستنی ریالیزمێکی تەواو عەیار و فرەگر ، زۆرکات لە بەستێنی مێژوویی خۆی لاڕێ دەبوو. هاوکات لە گەڵ توندوتیژتر بوون و توندڕۆتر بوونی بابەتەکان، خەبات و تێکۆشان بۆ وەدەست هێنانی روانگەیەکی بەردەوام و هەمەلایەنە سەبارەت بە ژیانیش تا دێ دژوارتر و وزەبەزێن‌تر دەبێ. بەقەولی مەکسیم گۆرکی: «مەبەستی زۆربەی خەڵک لە تێفکرین و دایەلۆگ و گوتار ئەمە نیە کە دیاردەکانی ژین و ژیان لێکدەنەوە ، بەڵکوو زیاتر دەیانەوێ هەتا زووترە پەنایەکی ئەمن و ئاسوودە بۆ تێفکرینەکانی خۆیان بدۆزنەوە و چەندان «راستی سەلماو» دیسانەکەش بسمەلمێننەوە.

به رای من، دژواری و گرفتی گەورەی رۆماننووسی سەدەی بیستەم شوناسی ئامێر و هەوێنی کاڵی رۆمانەکانی نیە، بەڵکوو دژواربوونی دەست گەیشتن بە روانگەیەکە کە بتوانێ لە سەر بنچینە و بناغەی ئەو، ئەزموونەکانی ژیانی مرۆڤ خۆیا و بە ئاراوقارا و کۆنترۆڵ کات . هۆکارییەکی تایبەت لە ئارادا نیە کە هونەری باش نەتوانێ لە سەردەم و زەمانەی گۆڕانکاری گەورەی کۆمەڵایەتی مەعنەویدا پێک بێ.بە پێچەوانەوە سەبارەت بە هۆکارە مێژووییەکان و ئەو شتەی هزری ساخ و سەلیم حوکمی بۆدەکا، دەتوانرێ بڕوا هەبێ کە ئەگەر و ئیمکاناتی هونەری بە تایبەت لە دەورەیەکی ئاوادا دەتوانێ ساماندار و دەوڵەتمەند بێ.

**ب: دووەم چارەكي سەدەي بيستەم**

لە دووەم چارەکی سەدەی بیستەمدا، هیچ رۆمانێکی گەورە نەنووسراوە و لە راستیدا ئەو کتێبانەی کە مرۆڤ پێی خۆش بێ بۆ وەسف کردنیان ئاوەڵناوی «باش» دەکار کات، هەر بە پەنجە دەژمێردرێن. ئەڵبەت بەڵکەم بڕیار وابێ بەرهەمگەلێکی نەدۆزراوەی بلیمەتێک وەدەست کەون یا شایەد نەوەی داهاتوو لەم بەرهەمانەدا کە ئێمە بە دەرەجە سێی دادەنێین، تایبەتمەندیهایەک بدۆزێتەوە کە ئێمە هەرگیز گومانیشمان بۆی نەدەچوو یا سەرنجمان نەدەدایە. بەڵام زیاتر وا دیارە شیمانەی هەیە کە مێژوو نووسانی ئەدەب، ئەم دەورەیە بە دەورەیەکی بەبێ داهات بژمێرن کە رۆمانەکانی بێت و بشخوێندرێنەوە، زیاتر لە حوکمی دیاردە سەیروسەمەرەکانی کۆمەڵگاناسەکی دا دەبن،نەک لە ریزەی هونەری زیندوودا.

بە شیمانە دوو تایبەتمەندی کە لە لێکدانەوە و کۆڵینەوەی رۆمانی ئەم دەورەیەدا زیاتر سەرنج راکێش دەبن، «سنووردداربوون» و «رەش بینین» دەبن. ئەم دوو تایبەتمەندییە تەقریبەن لە یەکدی جیا نابنەوە و هەردووکیان لە

بەستێنی مێژوویی خۆیاندا بە باشی دەناسرێنەوە. سنووردداربوون هەتا رادەیەکی زۆر ئاکامی لاوەکی رەش بینینە، ئەو نووسەرانەی کە بۆیان دەردەکەوێ ناتوانن بە گشتی لە گەڵ جیهاندا رێک کەون، پێیان خۆشە لە تەنیا گۆشەیەکی دوورەچاودا کە کەم و زۆر هەستی متمانە و هێمنایەتی دەکەن، «یانی لە گێروکێشەی دەروونی خۆیان و کەسانێکی وەکوو خۆیاندا» دوورەپەرێزی و گۆشەگیری بکەن. هەر بەم هۆکارەوەیە کە نووسەرانی چینە ناونجییەکان لە سەدەی بیستەمدا دڵیان پێوەیە مرۆڤگەلێکی گۆشەگیر بن و هەر سەرقاڵی دەروون پەرێشی خۆیان بن، یان لە دۆخێکی دیکەدا هەرسەرقاڵی جیهانێکی لە رادەبەدەر سنووردار بن کە خۆیان لەوێدا غەریب و نامۆ هەست ناکەن، بە وتەی یەکێک لە رەخنەگر و توێژەرانی ئەم دواییانە: «لە پێداچوونەوەی ئەدەبی چیرۆکی ئینگلیز لە ماوەی دوو شەڕی جیهانیدا، بە متمانەوە دەتوانین بڵێین کە باشترین چیرۆکەکانی ئەم دەورەیە تەقریبەن هەموانیان چیرۆک گەلێکی کەمبایەخن کە کەسێتییەکانیان لە ئەدەبی قەدیمتر و پێشووتردا، زیاتر دەورێکی چکۆڵانەیان دەبوو نەک دەوری گەورە پیاوان و مەزنە ژنان». بڵێی «سنووردداربوون» و «رەشبینین» هەر وشەگەلێک نەبن کە خوێنەرێک بۆ دەربڕینی بیروڕای خۆی سەبارەت بە چیرۆکێک کە سەرنجی ئەوی رانەکێشاوە، دەکاریان دەکات؟ بە رای من بە باس و خواسێکی ئاوا ناتوانین خۆمان لە بابەتی سەرەکی حەشار دەین، ئەم شتەی کە کاریگەری گشتی بەرهەمی رۆماننووسانێکی وەکوو ئاڵدۆس هاکسیلی و جۆرج ئۆروێل و ئارتوور کۆستلەر و گراهام گرین و ئیولین ڤۆ رەشبینانەیە. یا رۆمانەکانی ئەم نووسەرانە کە لە ئاکامدا وێنەیەکی هیوابڕدراوانە و بێ خێروبێرە لە حاڵ و رۆژی مرۆڤ وێنا دەکەن، ئەمانە هەر هەڵکڕاندنێکی کەسانە و تایبەت نین، بەڵکوو دەتوانین ئەمانە وەکوو

حوکمێکی دیکە لە رەخنەی ئەدەبدا بسەلمێنین. باس لە سەر ئەوە نیە کە ئەم نووسەرانە بابەتگەلێک هەڵدەبژێرن کە تامەزرۆیی خوێنەر ختووکە نادەن و رۆمانەکانیان سەبارەت بە کۆمەڵگایەک دەنووسن کە هەموو لایەنەکانی مێژینەی لارێیی گەندەڵ بوون لەوێدا لە بەرچاوە. خاڵی گرینگ ئەمەیە کە ئەم نووسەرانە، خۆیان تا رادەیەکی زۆر لە بایەخەکانی کۆمەڵگایەکدا کە وێنای دەکەن بەشدارن، بە وتەیەکی دیکە ئەوان هەر وێناگەرانی گەندەڵبوون نین، بەڵکوو خۆشیان گەندەڵ بوون. ئەڵبەت ئەم پرسیارە دێتە ئاراوە کە بۆچی رۆماننووسی مۆدێرن بەم چەشنە نەبێ؟ رەشبینین و گەندەڵبوون چ عەیبەیەکی تێدایە؟ وای بۆ دەچم وەڵامی ساناى ئەو پرسیارە ئەمە بێ کە روانگەی ئاوا، ژیان نزم و دارماو دەکەن و دەسا هەر ئەمەش بە سەر هونەر دێنن. ئەڵبەت هیچ کەس نایهەوێ چاوی لە حاندی چارەڕەشی و تاواندا بقووچێنێ، یا حاشایان لێ بکا و بڵێ رەشبینین و گەندەڵبوون بەشێک لە ژیانی ئینسانن و دەبێ بە گرینگ دابندرێن ـ نەک بە کەم بایەخ ـ هیچ کەس نایهەوێ حاشا لەوە بکات ئەو شتەی کە لە شانۆی *ماکبێس*دا دەقەومێ بە قەرا چیرۆکی «*رستان*» خاوەن درووستی و گرینگییە. بەڵام دەبێ لە بەر چاوی بگرین، باوەکوو شەکسپیر لە *ماکبێس* دا بە رووناک روانینێکی بێ وێنەوە ئێمە لە گەڵ تەڵە و داوەکانی ناحەزیدا دیوناس دەکات و مۆڵەت و دەرفەتمان نادا لەو راستییە رابکەین، بەڵام ببڕابڕ پێملی ئەم هەستە نابێ کە سروشتی ژیان ناحەز و نگریس یان بێ واتایە، یاخۆ مرۆڤ بوونەوەرێکە کە بێ کیفایەتییەکانی خۆی بەر حوکمی تێداچوونیان کردووە. ئەمە خودی *ماکبێس*ە کە هەتاهەتایە لە ئازاب دایە، نەک وڵاتی سکاتلەند.

ئەمە ئاشکرایە کە کاتێک خوێنەرێک بڕوای وابێ کە ژیان لە رووداوەکانی رۆمانەکانی گراهام گرین دەچێ، ناتوانین بە سانایی بیهێنینە سەر ئەو رایە کە گراهام گرین رۆماننووسێکی گەورە نیە.

وەک هەمیشە دووایین دادوەری بە دەست جیهان و خەڵکی جیهانەوە دەبێ. باوەکوو کاتێ ئەم دادوەرییە درەنگ دەردەبڕدرێ، بمانهەوێ و نەمانهەوێ برێک پڕ بە زار دێتە بەرچاو؛ کەچی بێتوو بڕیار وابێ رەخنەی ئەدەب بە بێدەروون و باندخواز نەبێ، دەبێ سەرچاوەکەی هەر لەم دادوەرییەوە بێ.

**تێبینی و پەراوێزەکان:**

١_ جۆرج ئۆرویل: (١٩٥٠-١٩٠٣) نازنێوی ئەریک بلەر رۆماننووسی ئینگلیزی، خاوەن قەڵای ئاژەڵەکان، رۆژانی بێرمە، لات و لووت لە پاریس و لەندەندا، هەروەها رۆمانی خەیاڵاوی و پڕ لە کابۆس و پێش بینینی «١٩٨٤».

٢_ ئاڵدووس هاکسەلی: (١٩٦٣-١٨٩٤) رۆماننووسی ئینگلیزی کە رۆمانەکانی بە شێوازی زانستی و خەیاڵاوی دەنووسی، خاوەن رۆمانی زۆر نێوداری جیهانی قەشەنگی نوێ و . . . .

٣_ ئارتوور کۆستلەر: (. . . . — ١٩٠٥) رۆماننووسی مەجارستانی (هەنگری) کە لە پاشان خۆی کردە بەریتانیایی، خاوەن رۆمانی توونیەتی، خەزەرەکان، گەیشتن و گەڕانەوە و . . . .

٤_ گراهام گرین: (١٩٩١-١٩٠٤) رۆماننووسی ئینگلیزی کە زیاتر بە شێوازی دەروون توێژەرانەی پۆلیسی رۆمانەکانی دەنووسی و خاوەن: کابرای هێمن، بـــــاڵوێز، وەزارەتی خۆف و . . .

# هێنری جەیمز،
# پێشەنگی نوێخوازی لە ڕۆماننووسیندا

نووسەر :*پیتەر فاکنەر* (Peter Faulkner)

ئەو ڕۆماننووسەی کە لە هەموان زیاتر تێکوشا هەتا فۆرمێکی نوێی ئەدەبی چیرۆکی لە چاخی مۆدێرندا بخولقێنێ ، هێنری جەیمز (1843-1916henry – jamez ز،ڕۆماننووسی ئامریکایی) بوو، کە لە پاشان خۆی کردە بەریتانیایی . هێنری جەیمز بێجگە لەو ڕۆمان وچیرۆکانەی کە نووسیونی ، وتارێکی زۆریشی لە سەر ڕەخنەی ئەدەب نووسیوە کە ئەم کارە نیشانەی تامەزرۆیی زۆری ئەو بۆ لایەنەکانی تەکنیکی هونەری ڕۆماننووسینە. هەر ئەم بابەتە (نووسینی ڕۆمان و هاوکات دەگەڵ ئەودا ، سەرنجدان بۆ گوتار و تیۆری هونەری ڕۆماننووسین) لە خۆیدا تایبەتمەندییەکی تایبەت بە نوێ خوازی دەژمێردرێ. هێنری جەیمز لە ساڵی ١٨٨٤ز دا لەو تارێکدا بە نێوی *هونەری ئەدەبی چێروکی* ئاماژەی بەم گۆڕانکارییە کردووە :

«هەتا ئەم دواییانە شیمانەی بوو وایدانێن کە ڕۆمانی ئینگلیزی بە قەولی فەرەنساییەکان «قسەی لە سەرنیە».

لەوە دەچێ کە ڕۆمان هیچ چەشنە تیۆر و ڕوانگە و سەرنجدانێکی تایبەت بە خۆی نەبێ کە پشتیوانی بێت و گێڕەوەری بیر و ڕایەکی هونەرمەندانە یان ئاکامی هەڵبژاردن و بەراورد کردن نیە .»

بە بڕوای جەیمز، گۆڕانکاری رۆمان لە چارلز دیکەنز و ولیەم تەکری بەرەو ئێرەوە دەبێ بە خۆش ئێقبالی دابنێین ، لە بەر ئەوەی لەو سەردەمەدا «بەگشتی ئەم بڕوا خۆشباوەڕانەیە و ئەم ڕووانینە ساویلکانەیە» باو بوو کە دەیووت: [رۆمان ، رۆمانە ئیدی ! هەر وەکو دیسێر ، دیسێرە و هەردەبێ قووت بدرێ ] لە راستیدا جەیمز دەلالەتی بەوە دەکرد کە ناسیارییەتی تیۆریکی رۆمان بەو چەشنەی کە لە رۆماننووسانی فەڕەنسیدا ـ لە گۆستا فلەوبێرەوە تا ئێمیل زۆلا ـ وەبەر چاو دەکەوێ ، لە بۆ مەبەستی پەسن کردن «کامڵ کردن»ی سەرکەوتنی هونەری رۆمان پێویستە و خودی جەیمز لەو پێشەکییانەدا کە بۆ چاپی رۆمانەکانی لە نیۆیۆرکدا نووسینی (٧- ١٩٠٦ ) بە ڕادەیەکی هەرە بە هێز و بەردەوام رەخنەی رۆمانی بە زبانی ئینگلیزی نووسی و ئەم ناسیارییە تیۆریکییەی خۆیا کرد .هیچ سەر سوڕمانی پێ ناوێ کە جەیمز لەم پێشەکییانەدا راست و دروست بوونی زۆربەی گریمانەکانی سەردەمی ڤیکتۆریای سەبارەت بە رۆمان هێنایە ژێر گومانەوە .

جەیمز لە وتاری *هونەری ئەدەبی چیرۆکی*دا رەخنە لە رۆماننووسانی دەورەی ڤیکتۆریا دەگرێ کە بۆچی بە دەربڕینی بیرو بڕوای راستەوخۆ ، بە بێ داوا لێکردن، دێنە ناو رۆمانەکانیانەوە .

هێنری جەیمز دەنووسی : «لەم دواییانەدا کە زۆربەی بەرهەمەکانی ئانتۆنی ترالێپ (anhonytrollope)م دەخوێندەوە، زۆر توند هەڵبەزیمەوە کە بۆچی ئەو لەم بەستێنە تایبەتەدا ورد بوونەوەی نەبووە لەو پێ و شوێنانەدا کە دەچێتە پەراوێزەوە یا راستەوخۆ بۆ خوێنەر دەدوێ و رایان بۆ دەردەبڕێ . لە راستیدا پێمل دەبێ کە لە گەڵ هەڤاڵەکەیدا [ گێڕەوەری چێروک] کە خوێنەری بە مەحرەم داناوە ، هەر «زاهیر سازی» دەکەن .ترالێپ دەیسەلمێنێ کە ئەو ڕووداوانەی گێڕدرانەوە لە راستیدا هەرگیز نەقەوماون و ئەو دەتوانێ بە هەر

چەشنێک کە خوێنەر پەسندی بێ ، درێژە بە چیرۆکەکە بدات . دەبێ پێی لێ بنێم کە ئەم چەشنە پشت لە ئیلتزام و بەرپرسی کردنە ، بەڕای من جینایەتێکی سامناکە ... )

جەیمز لێرەدا بە چەشنە دەلالەتێک کە رەنگە لەمڕۆدا زۆر کاڵ بێت و پەسند نەبێ، جەخت دەکات کە دەبێ رۆماننووس دەوری خۆی لە پلە و پایەی بگێڕەوەی راستیدا بە کەم نەگرێ. لە گوتاری ئەودا ، پێوەندی سادە و ساویلکانەی نێوان رۆماننووس و مرۆی ئاسایی جێگەی خۆیان دەدەنە بەر پرسایەتییەکی «جیددی» لە هەمبەری خودی بەرهەمدا. جەیمز کاتێ ئاماژە بۆ بەرهەمی ئەدەبی دەکات، جەخت و تەئکید لە سەر یەکیەتی دەق دەکا : «رۆمان، گیانلەبەرێکی زیندووە کە وەکوو هەر گیانلەبەرێکی دیکە خاوەنی ئەندامێکی یەکە و یەکگرتووە ، هەر چەندەش زیاتر لە تەمەنی تێپەڕ بێ ، زیاتر وەدەر دەکەوێ کە لە هەر پاژێکیدا نیشانێک لە پاژەکانی دیکەی تێدایە.»

لە راستیدا هێنری جەیمز بە زبانی رەخنەگرانی رۆمانسی و بە تایبەت کۆلێریج(Samuel Talylor Coleridge ) سەبارەت بە رۆمان قسان دەکات. جەیمز هەمیشە سەرنجێکی زۆری ئەدایە چەمکی «یەکیەتی ئەندامەکان» هەر ئەم بابەتەش بووە هۆکاری دوورکەوتنەوەی ئەو لە نەریتی رۆمانی سەردەمی ڤیکتۆریا . ئەڵبەت ئەو هەمیشە دەیووت کە «یەکیەتی» هەر بە واتای هەڵبژاردنی چەند بابە تێکی بەرتەسک و سنووردار نیە، بە پێچەوانەوە، ئەو شتەی کە ئەدەبی چیرۆکی زیندوو ڕادەگرێ تێکۆشان لە بەستێنی وەدەست خستن و گەیشتن بە «تان و پۆی ژین و ژیان و کوتەی ئاوازی نارێکوپێک و سەرسووڕهێنەری ئەوە.»

لە کۆتایی وتاردا ، ویڕای گوتارەکەی بە راوێژێکی تەوس و توانج ئامێزەوە سەبارەت بە رەزامەندی رۆماننووسانی سەردەمی ڤیکتۆریا لە ئاکاری پاک و خاوێنی رۆمانی ئینگلیزی دەبێژێ : «رۆمانی ئینگلیزی مەبەستی نیە ، بەڵکوو نەبوونی متمانە بە سروشت و زاتی هەیە.» مەبەستی جەیمز ئەوەیە کە رۆماننووسانی ئینگلیزی لەوەی کە سەر قاڵی بابەتی دەردیسەرساز بن ، خۆ کلا دەگرن ـ بەتایبەت لە بابەتی ئاکاری جەستەیی مرۆڤ ـ دوور دەکەونەوە هەتا رۆمان ، ئاوێتەی کێشەی ئاکاری پیس و چەپەڵ و ناحەز نەبێ . کەچی لەوە بێ ئاگان ئاکار خاوێنییەکی ئاوا پاک، بە بێ نێوەرۆک دەردەچێ . بەم چەشنە هێنری جەیمز رەخنە لە رۆمانی سەلەفی و باو دەگرێ ، لە بەر هۆکاری ڕادەربڕینی راستە و خۆی نووسەر و هەر وەها بەو هۆکارەوە کە رۆماننووسان خۆیان لە بڕێ بابەتی تایبەت دەشارنەوە هەتاکوو لە یاساوڕێسای گشتی ئاکاری لایان نەدابێ و پێداگری لە سەر داخوازی کامڵ و پەسندی خۆی «یانی گەیشتن بە پێکهێنانی یەکیەتی زیاتر لە نێوان پاژەکانی ئەندامی رۆمان»دا دەکا.

هێنری جەیمز لە پێشەکی گەلێکی رەخنەگرانەدا کە لە سەر رۆمانەکانی خۆی دەنووسیێ و لە دوواتردا ر- پ - بلەکمیر (R-P-Blakmur) ئەم وتارانەی لە کتێبێکدا بە نێوی *هونەری رۆمان* لە چاپ دا، سەبارەت بە بەرهەمەکانی خۆی و ئەو تەقالا و تێکۆشانەی بۆ چارەسەرکردنی گرفتی سنوورداربوونی رۆمانی دەورەی ڤیکتۆریا کردوویە، باس دەکات. رەنگە نێودارترین بەشی کتێبی *هونەری رۆمان* ئەو بەشەی پێشەکی جەیمز لە سەر یەکێ لە رۆمانەکانی بێت کە لەوێدا دەڵێ: «ئەو تابلۆیەی کە پاژەکانی لە گەڵ یەکدیدا هاودەنگی و رێکەوەندیان نەبێ، پشتی کردۆتە بایەخدارترین ئیقباڵی خۆی لە بۆ جوانبوون و چما شێوەکار نەزانێ کە چۆن ئەم خاڵەی

زامنی دروست بوون و پاراستن [یانی هاودەنگی و ڕێکەوەندی پاژەکانی وێنە] لە پلە و پایەی هونەرێکی تەواوەن دەستکرد و قەستینەدا بە سەر بەرهەمەکەی ئەودا زاڵ بووە، لەو دۆخەدا لە بنەڕەتەوە بەرهەمێکی هونەری نەخولْقاندووە. گومانی تێدا نیە کە بە پێچەوانەی نەبوونی هاودەنگی، بەرهەمی هونەری دەتوانێ خاوەن ژین و ژیان بێ، هەروەکوو ڕۆمانی *بنەماڵەی نیۆکام* بەرهەمی ولیەم تەکری و *سێ تفەنگداری* ئالکساندر دۆما و *شەڕ و ئاشتی* تالستۆی خاوەن ژیانن، بەڵام ئەم بوونەوەرە ئەندام گەورە و هەڵمساوە شل و شەوێقانە کە ئەستوونەکانی هەبوونیان لە سەر ڕووداوەی بە هەڵکەوت و لە خۆڕایی و سەیروسەمەرە دامەزراون، خاوەنی کام واتای هونەرین ؟. . .

چەشنەکانی ژین و ژیان جۆراوجۆرن و بەوەیدا کە زیادینەکانی بەرهەمێک شتی خاوەن ژین و ژیانن کە چاوپۆشینیان لێدەکرێ تاکوو «نەیەنە ئەژمارەوە»، من لە ئیجازێکی «چڕبوونەوەیەکی» هەمەلایەنە و فۆڕمێکی ئەندام ئاسا تام و چێژ دەبەم.

جەیمز ئاوێتەبوونی توخمەکانی ڕۆمان لەگەڵ ئاوێتەبوونی پاژەکانی تابلۆیەکی شێوەکاریدا بەراوەرد دەکا، تا بەم چەشنە جەخت لە سەر پێویست بوونی یەکیەتی جوانی ناسەکی لە ڕۆماندا بکات. لە ڕاستیدا شێوەکارانی سەردەمی ڤیکتۆریاش وەکوو ڕۆماننووسانی ئەو دەورەیە، پاژگەلێکی زۆریان لە بەرهەمی خۆیاندا دەگونجاند . بەڵام جەیمز بە دووای ڕۆمانی یەکدەست و یەکپارچەوە بوو، ڕاست هەر وەکوو ویسلەر (j-wistler ) شێوەکاری ئامریکایی کە سەرقاڵی ئەفراندنی هونەرێکی دیداری (بَصری ) بوو کە پاژەکانی بە چەشنێکی سەرسووڕهێنەر هاودەنگ و یەکهەوا بن. ڕەنگە لەمڕۆدا لە شان یەکدانانی ڕۆماننووسانێکی وەکوو

تەکری و دۆما و تالستۆی سەیروسەمەرە بێت، بەڵام مەبەستی جەیمز ئاماژە کردن بە مەیل کردنی باوی رۆمانی سەدەی نۆزدەیە بەو شتە کە - بە قەولی جەیمز ـ ببێتە *میدل مارچ* رۆمانی جۆرج ئەلیەت. یانی (خەزێنەی پاژەکان ، بەڵام ... بەگشتی خاوەن چۆنیەتییەکی نزم . )

چەمکی «یەکیەتی» یان «قاوغێکی ئەندام ئاسا» لە ئەندێشەی جەیمزدا سەبارەت بە رۆمان پلە و پایەیەکی گرینیگی هەیە. لەم دۆخەشدا، ئەو بە شوێن جێ کردنی ئەم یەکیەتییە لەو شتە نیە کە رەنگە ساناترین رێگەی ئەم کارە بێ یانی ( نووسینی رۆمانی کورت یان چیرۆک گەلێک سەبارەت بەم بابەتانە )باوەکوو جاروبار ئەم کارە دەکات، حەتمەن جەیمز رۆمان لەو بابەتەوە بە گرینگ دانانێ کە رۆمان سەرقاڵی برِێ بابەت نابێ، بەڵکوو زۆرکات لە سەر جۆرانجۆری رۆمان لە پلەوپایەی بایەخێکدا جەخت دەکات، بۆ وێنە لە پێشەکی رۆمانی *وێنەی خاتوونێک*دا دەنووسێ:

«لێرەدا بایەخی زۆری رۆمانمان لە دۆخی فۆرمێکی ئەدەبیدا بە تەواوی بۆ وەدەر دەکەوێ ـ بە توانا و هێزیەوە ... لە بەر ئەوەی وێرای ترازان لە قاوغیخۆیان وێرای تێکشکاندنی قاوغیخۆی بە خێراییەکی دوورە چاوەوە، کەسێتییەکانی لە گوێنی راستی بێنێتە ئاراوە.»

جەیمز زیاتر لە رەخنەگرانی رابردوو لە سەر ئەگەری جۆرانجۆر بوونی دژە کردەی خوێنەرە جیاوازەکان لە هەمبەری رۆمانێکدا، یان بە وتەیەکی دیکە جەخت و تەئکید لە سەر زەینییەتی هەر بینەرێکی تایبەتی رووداوە مرۆقایەتییەکان دەکات :

«ئەو و هاوسێکانی سەرقاڵی روانین لە شانۆیەکی یەکەن، بەڵام یەکیان زیاتر دەبینێ و ئەوی دیکە کەمتر، یەکیان رەشایی دەبینێ و ئەوی دیکەیان

سپیایی ، یەکیان گەورەیی دەبینێ و ئەوی دیکەیان بیچکۆڵەیی، یەکیان زبری دەبینێ و ئەوی دیکەیان نەرمی و . . . »

ئەم روانگەیەی لە سەر بنچینەی رەسەنایەتی زەین «نووسەرانی سەردەمی ڤیکتۆریای دەهەژاند، بەڵام جەیمز لەوە رازی بوو (بەختەوەرانە ناتوانین بڵێین کە بۆ جووتێک چاوی تایبەت، پەنجەرە بە سەر کام روانگەدا ناکرێتەوە) بەم حاڵەوە، سەلماندنی ئەم خاڵە کە جیهان لە لایەن بینەرانێکی جیاوازەوە بەچەشنی جیاواز دەبینرێ، بۆ هونەرمەندێک کە بەگشتی سەرنجی بەرەو یەکیەتی پاژەکانی بەرهەمەکەی دایە، چەندان کێشەی گرینگ پێکدێنێ. ئەو چۆن دەتوانێ ئەو توخمە دژوازانەی کە دەزانێ ژیان لە قاوغ ئەدەن، یەکپارچەکات. بەتایبەت لەو دۆخەدا کە ئاگاداری هەیە هەر زەینێک، ژین و ژیان لە چەشنێکی جیاوازدا ئەزموون دەکات.

وەڵامی جەیمز بەم پرسیارە ئەو شتەیە کە بەلکمەر پێیدەڵێ: «هزری ورد بینینی ناوەندی.»

لە رۆمانی *وێنەی خاتوونێک*دا ئەم هزرە (کە من وام پێباشە پێی بڵێم «زەینییەت») کەسێتییەکە بە نێوی ئیزابل ئارچر (Izabel Archer ) جەیمز لە راڤەکردنی ئەم خاڵەدا کە چۆن ئیزابل ئارچڕی بە وەڵامێک بۆ کێشەی ناوەندی سەرنجدانی رۆمانەکە دانا، دەڵێ :

بە خۆم ووت: «تەوەری بابەتەکە لە سەر زەینی ئەم ژنە دامەزرێنە هەتا گرفتێکی سەیروسەمەرە و جوانت هەبێ کە دەتوانی بە ئاوات بیخوازی و بتهەوێ . بۆ تەوەری رۆمان ، پاڵپشتت هە ر بەو زەینەوە بێ، زۆرترین بەردی تەرازوو بخە ئەو تاتەرازووەوە، ئەو تا تەرازووەی کە زیاتر خۆیا کەرەوەی پێوەندی ئەو لە گەڵ خۆیدا دەبێ.»

جەیمز وێڕای کەڵک وەرگرتن لە کەسێتییەکی ئاوەها، گرفتی یەکیەتی پاژەکانی ڕۆمانی بە بێ چاوپۆشین لە ئەگەری ئاڵۆزکاو بوونی ئەو شتە چارەسەر کرد.

ئەو لە چەمکی سانای یەکیەتییەک کە وەکوو ڕۆمانی *تام جۆنز* بەرهەمی هێنری فیلدینگ بە سۆنگەی کەسێتییەکی ناوەندییەوە وەچنگ دەکەوێ، تێپەڕی. بەم چەشنەی کە زینییەتی ئەو کەسێتییەی وەها لە بەر دڵان کرد کە هێزی ڕاکێشانی ناوەندی ڕۆمانەکە بێ. جەیمز لە کەڵە ـ ڕۆمانگەلێکی وەکوو *وێنەی خاتوونێک* و *باڵوێزەکان*دا لەم شێوازە کەڵک وەردەگرێ، بەڵام لە ڕۆمانی *کاپی ئاڵتوونی*دا هەنگاوێکی دیکەی بەرەو پێشەوە هەڵگرت و بەشی یەکەمی ڕۆمانەکەی بۆ شازادە و بەشی دووهەمی بۆ شازادە خاتوون تەرخان کرد. ئەم کارە بە واتای بەڕەسمی ناسینی «ڕەسەنایەتی زەین» بوو. بەڵام لە هەمان کاتدا بە چەشنێکی توندتر کێشەی یەکیەتی پاژەکانی ڕۆمانی هێنایە بەر لێکدوانەوە. ڕێگە چارەسەری جەیمز لەم ڕۆمانەدا، کەڵک وەرگرتن لە وێنەیەکی ناوەندی ( خودی ئەو کاپە ) و بەرەوپێشەوە بردنی ڕووداوەکان بە چەشنێکە کە شازادە خاتوون جێگەی کەسێتی ناوەندی بگرێتەوە. وێڕای هەمووی ئەمانە، پرسیارگەلێکی دیکەش دەتوانێ بێتە ئاراوە، بۆ وێنە: بۆچی لە زەینییەتی ئاغای وێروێر یان زەینییەتی شارلوت ستەنت کەڵک وەرنەگیراوە؟ ئایا گۆڕانکاری کەسێتی شازادە خاتوون زیاتر بە هۆکاری پێویستی ناوەکی هەڵکراندن و ڕوانگەی نووسەرەوەیە؟ یان بە هۆکاری سروشتی خودی شازادە خاتوونەوە؟ لە ڕاستیدا ، جەیمز لە ڕۆمانی *کاپی ئاڵتوونی*دا (The Golden bowl ) بە سەرکەوتنێکی زۆرەوە دەتوانێ هەم لە نێوان پاژە جیاوازەکانی بەرهەمەکەدا

یەکیەتی پێکبێنێ و هەم ئەم هەستە بگوێزێتەوە بۆ خوێنەر کە زەینییەتی ئینسانەکان، ئاڵوزکاو و تەم و مژاوی و جۆرانجۆرە .

---

**تێبینی و پەراوێزەکان:**

**١_ هێنری جەیمز:** (١٩١٦-١٨٤٣) تیۆرزان و رەخنەگر و رۆماننووسی نوێخوازی ئەمریکی کە لە پاشان خۆی کردە بەریتانیایی. بەرهەمەکانی بریتین لە: ئەوروووپییەکان، کابرای ئەمریکی، باڵوێزەکان، وێنەی خاتوونێک، کاپی ئاڵتوونی و . . .

**٢_ دیسێر:** ئەو شیرینی و میوەیەی لە پاش شێو خواردن یان لە پاش نیوەڕۆژەدا دەیخۆن.

**٣_ ویلیەم تەکری:** (رۆماننووسی سەدەی نۆزدەی ئەمریکی، خاوەن رۆمانگەلی گاڵتەبازار، بنەماڵەی نیۆکام و . . . .

**٤_ ئالەکساندەر دۆما:** رۆماننووسی نێوداری سەدەی نۆزدەی فەرەنسی کە بەرهەمەکانی زۆر گشتخوازن و پێشوازی گشتییان لێ کراوە، وەکوو: سێ چەکدار، گوڵە مێلاقی رەش، کۆنتی مۆنت کریستۆ و . . . .

# رۆمانی پاش نوێخوازی (پۆست مۆدێرنیستی)

نووسەر: دەیڤید لاج (David – Lodge)

دەتوانین مێژووی ئەدەبی نوێ وەکوو جم وجۆڵ و هات و چۆیەک لە نێوان کۆیەکی قوتبی کراوی ڕووانینەکان و تەکنیکەکانی نووسین بناسین: نوێخوازانە، سەمبۆلخوازانە یا ئوستوورەسازانە، نووسەرانە و خوازەیی لە لایەکەوە، دژی نوێخوازانە،ریئالیستی، خوێنەرانە و مەجازی لە لایەکی دیکەوە. بەم هۆکارەوە ئەوشتەی کە لە دەسپێکدا وەک چەشنێک داهێنانی تازە دەنوێنێ (چەشنە نووسینێکی تازە کە لە کاتی کۆنە بوونی شێوازی باوی نووسیندا، لە هەمبەری ئەودا قوت دەبێتەوە) هەروەها بە بۆچوونێک گەڕانەوەیەکە بۆ یاساکان و ڕەوتەکانی چاخێکی پێشووتر. خەیاڵات کردنی مرۆڤ کە هەوێنی کارەکەی ئامێرە تازەکانی بەرهەمی مێژووی جیهانی ماددییە، جۆرانجۆری و بەرهەم هێنانێکی ئەوندە بێ کۆتایی هەیە کە پێش بینینی بەرهەمگەلی داهێنراوی هیچ چاخێک ناکردرێ، باوەکوو ڕادەربڕینی ڕەخنەیی لە دوو قوتبی خوازە و مەجازدا ئاشکرای دەکات کە بۆچی مێژووی ئەدەب لە قووڵترین لایەنەکانی خۆیدا خاوەن چەشنێک سووڕانەوەی دەوران دەورانە، لەبەر ئەوەی کەلام دەبێ لێ براوانە بەرەو یەکێک لەم دوو قوتبە وەرسووڕێ.

بەڵام چەشنێکی تایبەت لە هونەری پێشڕۆی سەردەم هەیە کە دەوترێ تایبەتمەندی نوێخوازانە یان دژی نوێخوازانەی نیە، بەڵکوو پاش نوێخوازانەیە (پۆست مۆدێرنیستی)یە.

پاش نۆیخوازی درێژە بە رەخنەی مۆدێرنیستی لە هونەری «مەحاکاتی» واتە هونەری لاسایی کردنەوەی راستەوخۆ لە سروشت و کۆمەڵگا دەدات و وەکوو مۆدێرنیزم بە شوێن داهێنانی نوێوەیە، بەڵام بە شێوازی تایبەت بە خۆی وەشوێن ئەم مەبەستانە دەکەوێ. هونەری پاش نۆیخوازی تێدەکۆشێ بگاتە ئەو پەڕی نوێخوازی یا دەوروبەری ئەو، یان هەرە قووڵاییەکەی و کەم و زۆر ئەوەندەی رەخنە لە مۆدێرنیزم دەگرێ ئەوەندەش دژی مۆدێرنیزم وەبەر رەخنە دەدات.

بە ئاشکرایی ئەم دیاردەیە لە بازنەی نڤیساریدا، بە چەشنێکی سەیروسەمەرە کێشە لەگەڵ هێزی ناسینەوە و ناساندنی ژانرناسینی ئەدەب دەکات. لەم وتارەدا بە تەمام وەسفێک لە ئەدەبی چێرۆکی پۆست مۆدێرنیستی بە دەستەوە بدەم و بزانم جیاوازی نێوان خوازە و مەجاز چەند لە شیکاری ئەودا بەکەڵکە. چیرۆکی پاش نوێخوازی لە ماوەی ئەم دە ـ پانزە ساڵەی ئەم دواییانەدا بە چەشنێکی زۆر ماقووڵ لە رۆمانی نوێی فەڕەنسی و ئەمریکیدا، وەکوو چەشنێک «نڤیسار» بە مانای بارتی کەلام (یانی چەشنێک نووسینەوە کە ئەژمارێکی زۆر لە نووسەرانی چاخێکی تایبەت کەڵکی لێ وەر دەگرن) سەلماوە و جێی خۆی کردۆتەوە. من لەم وتارەدا زیاتر چاوم لە ئەدەبی چیرۆکی ئەم دوایانەی ئامریکایە، بەڵام لە هەر کوێدا پێویست بێ ئاماژە بۆ نووسراوەی چیرۆکنووسانی بەریتانیاییش دەکەم، لە دەسپێکدا لەسەر بەرهەمەکانی ساموئێل بیکێت( Samuel _ Beckett) دەدوێم کە لە راستیدا دەبێ بە یەکەم نووسەری گرینگی پاش نوێخوازی بژمێردرێ.

بیکێت لە گەشە و کامڵبوونی ئەدەبی خۆیدا، کاریگەرییەکی بە هێزی مۆدێرنیزمی کلاسیکی بەسەرەوە بوو. یەکەم نووسراوە پەخشانییەکانی ئەو بریتی بوون لە: وتارێک کە بۆ کۆنفرانسێک سەبارەت بە جەیمزجۆیس

(James-Joyce) لـە ١٩٢٩ دا نووسـیبووی و لێکۆڵـینەوەیـەک سـەبـارەت بـە بەرهەمەکانی مارسیل پرۆست (Marcel _ Proust) بوو. لـە ١٩٣٠دا چیرۆکـی *دانتێ و قرژاڵ* لە سەرەتای یـەکـەم کتێبـە چیرۆکـەکـانی دا(١٩٣٤) نیـشانەی یەکەم تێکۆشانەکانی ئەون بۆ دابڕان لە نـەریتی مۆدێـڕنیزم و بـە تایبـەت لـە تەکنیکەکانی جۆیس، یانی لەو کەسەی کە لە نێـو هـەمـوو نوێخـوازەکانـدا زۆرترین نزیکایەتی لە گەڵیدا هەیە( ماوەیەکیش وەکوو مـیرزا [ تاپیـست و پیتچن ] کاری بۆ کرد) ئەم چیرۆکە سەرقاڵی لێدوان سەبارەت بە بابـەتی لـە مێژینــەی «هــەبــوون، مــەرگ، زەمــان» دەبــێ. نووســەر باســی کــارە جۆرانجـۆرەکـانی رۆژانـەی خوێنـدکارێکی دووبلـینی بـە نێـوی بێلـە کـووا (Belacqua) دەکات. بێلە کووا بـە نـانی سـووخاری و پـەنیری گۆرگـۆنزولا سەندویچ ( بابۆڵە) بۆ نیوەڕۆژەی خـۆی سـازدەکـات. دەچێتـە یانـەی زبـانی ئیتالیایی و لە بۆ شێوی خۆی و پووری، لە دووکـانی ماسـی فرۆشـتن قـرژاڵ دەکڕێ، هەواڵی جۆرانجۆر دێنە زەینییەوە، یـەکـێ لـەم هـەواڵـانە ئـەمـەیـە: سبەینـێ پیـاوکوژێکی مـەحکـووم لـە دار دەدرێ لـە شـەقامـەکانـدا، وێـڕای تێفکرینی ناوەکانی سەبـارەت بـە دانتـێ (aLIghiri-Dante) ( بـە تایبـەت ئـەم دێڕەی کتێبی *دۆزەخ* کە دەڵێ [ رەحم لێرەدا دەژی لە کاتێکدا کە بە کـردە مردووە.]، ئەم فیکرانە دەبنە هۆی ئەوەی کە بێلە کووا لە رێگـەی گـەڕانـەوە بۆمالێدا لە خۆی بپرسێ: «بـۆچی نـەوتـرێ رەحـم و تـەقـوا ( خـۆ لـە تـاوان پاراستن) هەر دووکیان، تەنانەت لە قووڵاییدا«؟ لە پاشـانە بـۆ «بـڕێک رەحـم دەرحــەق ئــەم گوشــاری دەروونیــەی قوربــانی» دۆعــا دەکــا و لــە گــەڵ جینایەتکاری مەحکووم کراودا دەبێتە هاو دەرد:

«ئای بۆ مێکێیبی چارەڕەش، دەمەوبەیان تەنافی لە ئەستۆ توند دەکەن. لەو کاتەدا چی دەکات؟ چ هەستێکی دەبێ؟ بڵەی ئەو کاتە لە چەشتێکی دیکە یا شەوێکی دیکە تام و چێژ بیات؟.

بەڵام قەدرێکی دیکە دەردەکەوێ کە ئەم دۆخە دەروونییە، تاقە خەیاڵاتێکی هەست ئامێزە و بەس، لەبەر ئەوەی ئەوشتەی کە ئەو بە چەشنێکی سەرسامهێنەر دیونای شوناسی رەنج و مەرگ دەکات ئەم شتەیە کە لە ناکاودا بۆی دەردەکەوێ ئەو قرژاڵەی کڕیویەتی هێشتا زیندووە و دەبێ هەر بەو زیندووییە لە ئاودا بیکوڵێنن هەتا بێلە کووا بتوانێ بیخوات.

بێلە کووا وتی: «یا عیسای مەسیح ! خۆ زیندووە.» پووری تەماشای قرژاڵەکەی کرد. قرژاڵەکە هەمیسان جوڵاوە. جولانەوەیەکی تورە و بێهێزی کرد کە نیشانەی ژیانی ئەو لە سەر موشەماکە بوو. لەسەر سەری قرژاڵەکە راوێستابوون و سەیری ئەویان لەو ژێرەدا دەکرد کە بەسەر موشەماکەوە، قاوغێکی خاچی وەدەرخستبوو. هەمیسان جووڵاوە. بێلە کووا هەستی کرد خەریکە بڕشێتەوە.

بێلە کووا ناڵاندی و وتی: «ئای خواگیان، خۆ زیندووە، دەبێ چی بکەین؟» پووری بە راوێژێکی تووڕەوە وتی: «لەخۆڕا هەراو هوریا دەکەی و خوڵقی من تاڵ دەکەی، کەچی لە پاشان کە دەتهەوێ شێوەکەت بخۆی، هێرشی بۆ دەبەی.»

پووری قرژاڵە کەی لە سەر مێزەکە هەڵگرت. بە قەرا سی چرکە ساتی دیکەی لە ژیداندا مابوو. بێلە کووا لە دڵیدا فیکری کردەوە: باشە، مردنێکی خێرایە، خوا یارمەتی هەمووومان بکات. وانیە؟

کۆتایی چیرۆک بەم چەشنە (کە من زۆر کورتم کردۆتەوە) لە مووبەقی ماڵە پووریدا دەقەومێ، کە هەروەک دۆزەخی دانتێ، «لە قووڵایی زەوی

دا»یە. دەڵێی *بەزمەساتی خودایی* دانتێ لە چیرۆکی بیکێتدا هەمان دەورێکی هەیە کە *ئۆدیسووس*ی هۆمێر لە رۆمانی *ئوولیسوس*ی جەیمز جۆیسدا هەیەتی. ناوی بێلە کووا ( کە هەروەکوو ناوی دێدالووس ـ کەسێتی سەرەکی رۆمانی *ئوولیسووس* ـ نامۆیە) لە *بەرزەخ* وەرگیراوە؛ لە سەرەتای چیرۆکدا، بێلە کووا زۆر جیددی تێدەکۆشێ بەشێکی چەتوونی *بەهەشت* شیکاری بکات، وت و وێژی ئەو لە گەڵ مامۆستای زبانی ئیتالی سەبارەت بە رەحم جووڵاندنە دەگمەنەکانی دانتێ لە *دۆزەخ* دایە.

چیرۆکی بیکێت بە رووالەت ئەمە دەردەخات: حکیمەتی مەسیحی (کە دانتێ ئەوشتەی جوان روون کردۆتەوە) لە ئاکامدا لە کێشەی رەنج و مەرگدا کاربوردی نیە. وێڕای ئەمەش، هێماخوازی مەسیحایی و تەلبەندییە (تەلمیح) کە بە تایبەت لە رەنج و ئازارەکانی عیسای مەسیح دا) لە تەشقی چیرۆکدا تەواو لە بەرچاوە، باوەکوو چەشنە راوێژێکی بە گشتی نزم (وەکوو «یا عیسا مەسیح!»، «قاوغێک لە خاچ»؟ «ئای خوایە گیان»، «هێرشی بۆ دەبەی» ئەم هێما نووسین و تەلبەندییەی (تەلمیح)ەی حەشار داوە، بە رووالەت مەبەست جەخت کردن لەسەر ترس و خۆف کردن بە هۆکاری ناسینی پێناسە و سروشتی راستی جیهان بووە، یانی ترس و خۆف لە زانینی ئەم راستییە کە هەرکام لە بوونەوەرانی زەنجیرەی هەبوون، زۆر بێ بەزەیانە بوونەوەرێکی دیکە قوربانی دەکات هەتا خۆی درێژە بە ژین و ژیان بدات.

لە یەکێ لە بەشەکانی پێشووی ئەم چیرۆکەدا، کاتێک بێلەکووا لە ئاخافتن دەگەڵ مامۆستایەکی فەڕەنسیدا لێدەبڕێ لە وشەی «ماسی» کەڵک وەردەگرێ، وەکوو یەکبوونی شوناسی قرژاڵ و عیسا مەسیح لە چیرۆکدا دەردەکەوێ:

«هاوتای فەڕەنسی قرژاڵی نەدەزانی. وشەی ماسی مەبەستی ئەوی بە چاکی دەگەیاند. بۆ عیسای مەسیح، کوڕی خودا و رزگارکەرەوەی مرۆڤ، ئەم وشەیە کیفایەتی کردبوو، بۆ ملێ گلێین کیفایەتی کردبوو. تەنانەت روداوی گاڵتەجاڕی نیوەڕۆژ سازکردنی بێلە کوواش لە گەڵ ئەم بابەتەدا هاودەنگی هەیە، چوونکە وەسفی بیکێت لە کاری بێلە کووا کە چۆن نانەکە تا رادەی ئەوەی بسووتێ، برشتە دەکات و پەنیری پێدا دەسوێ، کارەکانی ئەو چەشنی کردە گەلێکی بێ بەزەییانە دەنوێنێ کە سەبارەت بە گیان لەبەرێکی زیندە و بێ ئازار بیکات:

نەرمەی نانەکەی نایە سەر کوڵمەکانی خۆی، ئیسفەنجی و گەرم و زیندوو بوو، بەڵام ئەو زۆر زوو رواڵەتی پەروار ( دابەستە) و سپی ئەوەی دەسڕییەوە. . . [ تەئکیدی دەیوید **لاج** ] بە گومانەوە سەیری پەنیرە بڕدراوەکەی کرد. وەریسووڕاند تا بزانێ بڵێی ئەو بەری باشتر بێ یان نا؟ ئەو بەری خەرابتر بوو. . . سوویەوە ئارەقەی دەڕشت. ئەمە بووە شتێک. دانەوی و بۆنی پێوە کرد. حیزە بۆنێکی گەنین. بە کاری چی دەهات، بۆنی نەدەویست، خۆ ئەو چێشت ناسێکی زۆرزان نەبوو، بۆگەنێکی راست و دروستی دەویست. قاشە پەنیرێکی گۆرگۆنزولای دەویست کە زۆر باش کەڕووی هێنابێ، بوگەن و ڕزیو بێ، زیندووبێ، بەو خودایە هەر چۆنێک بێ وەگیری دەخات.[ ئەمە تەئکیدی دەیوید **لاج**ە].»

کردەی بێلە کووا لەگەڵ پەنیردا، پێشەکییەکە بۆ ئەو کارەی کە پووری لە کۆتایی چیرۆکدا لەگەڵ قرژالەکەیدا دەکات : «قرژاڵەکەی هەڵگرت و پشتەو قەفار داینا. دەجووڵاوە. وتی: هیچ شتێ هەست ناکەن» دەیجا بۆمان دەردەکەوێ کە دەتوانین چیرۆکی *دانتێ و قرژاڵ* تا رادەیەک وەکوو ڕووداوێکی لاوەکی لە رۆمانی *ئوولیسووس*دا راڤە بکەین، یانی وەکوو

ڕووداوێک سەبارەت بە ژیان لە سەردەمی نوێدا بە تەلبەندییەکەوە لەسەر ئوستوورەیەکی لە مێژینە کە بە مانایەک کلیلی مانا کردنەوەی ئەوە، زنجیرەی ڕواڵەتی بەبێ هۆکاری ڕووداوە بێ تام و چێژەکانیش کە بە سۆنگەی ئەو نێوەرۆک و بابەتە چەند پات کراوەوە کە بە وردی چندراون، لە ئاکامدا دەگەنە خۆیا بوونی بابەت و نێوەرۆکی چیرۆک. بەڵام چەند بەشێکی چیرۆکەکە ناتوانین بەم چەشنە لێکدەینەوە. بۆ وێنە کردەی سەرشێتانە و وەسواسی و نائاسایی قارەمانی چیرۆک ( کە هیچ لە هەوا و هەوەس و کارە خۆڕافە شیرینەکانی بلووم (bloom ) ناچێ)، بە لەوێنێک لە چیرۆکەکەدا «ڕاڤە» نەکراوە. بێلە کووا کردەیەکی گاڵتەجاڕ و بەڵام لە عەینی حاڵدا ناڕەحەتی هەیە. دێڕی کۆتایی چیرۆک یانی (وانیە؟)ش دۆخێکی ئاوای هەیە. ئەمە یەکەم کەڕەت نیە کە نووسەر لە پلە و پایەی ئەو کەسەدا کە ڕووداوەکە «دەگێڕێتەوە» لە بێلە کووا (کە بەشی هەرە زۆری چیرۆک لە گۆشەی نیگای ئەوەوەیە) دەبێ لێک جیا کرێنەوە، بەڵام حەتمەن ئەم جیاوازیە لێرەدا بە زۆرترین جەختەوە زەق کراوەتەوە، لەبەر ئەوەی ئیدی ئەمە هەر ڕادەربڕینێک نیە، بەڵکوو لە ڕاستیدا ڕەفز و وەلانانی ئاشکرای پاڵەوانی چیرۆک یانی( ئیشراق) ە درۆیینەکەی ئەوە.

نووسەر لە ڕستەی کۆتاییدا بە ئیستلاح چیرۆکەکەی زایە دەکات وئەمە دەبێتە هۆکاری ئەوەی کە خوێنەر نەتوانێ وێڕای دەلالەتی دژ بە هێمنایەتی خۆی لە وتەزای «ئەدەب» یا «ئەدەبی چیرۆکی»دا خۆی ئاسوودەخاتر کات. ئەم تایبەتمەندییانە لە چیرۆکەکانی بیکێتدا (بەگشتی لە دەقە پۆست مۆدێرنیستیەکاندا) بەرەبەرە زەقتر دەبن. لەدۆخێکدا ( هەروەکوو تی ـ ئێس ـ ئەلیەت لە وتارێکدا سەبارەت بە جۆیس دەڵێ:

«شێوازی ئوستوورەیی» ( بۆ وێنە هاوتاکانی ئەم چیرۆکەی بیکێت لە *بەزمەساتی خودایی* دانتێدا)کە بریتیە لە هاودەنگی و قەوارە و مەعنادان بە ڕوانگەی بەرینی بێ هۆیی و ئاژاوە و شێواوی، لە مێژووی سەردەمدا» کاڵ دەبێتەوە لە جیاتیدا یەگجار زۆر لەسەر ئەم شتە پێ دادەگرن کە هیچ هاودەنگی و پێکهاتە و واتەیەک لە هیچ کوێدا وەگیر ناکەوێ.)

چیرۆکی دوایی بیکێت یانی *مۆرفی* (Murphy) ـ ١٩٣٨ـ ئاوا دەست پێدەکا: «خۆر لێبڕا بەسەر ئەو شتەدا کە تازە بوونی نەبوو، بدرەوشێتەوە. مۆرفی وەک بڵێی ئازاد بێ، لە کۆڵانێکدا لە شەقامی برامپتنی ڕۆژ ئاوایی (Weg Brompton) دا لەو لای تیشکی خۆرەوە دانیشتبوو ... بە ڕووتی لەسەر کورسی حەسانەوەی خۆی دانیشتبوو، کورسییەکە لە داروتەختەی درەختی ساجی بێ ڕووکەش ساز کرابوو زەمانەت کرابوو: نەقەڵەشێ، شل نەبێتەوە، نەڕزێ و بە شەودا غژەغژ نەکات.

کورسیی خۆی بوو وبڕابڕ بە جێی نەدەهێشت. لە سووچێکی وادا دانیشتبوو کە پەردەیەک دەبووە هۆی ئەوەی تیشکی خۆری نەگاتێ، ئەو خۆرە پیرە چارەڕەشەی کە بۆ میلیاردەمین کەڕەت کچێنی هەرمابوو. حەوت ڕێسمان مۆرفی‌یان لەو دۆخەدا ڕاگرتبوو. بەدوو ڕێسمان بەلەکی قاچەکانی بە پایەی کورسییەکەوە بەستبوو، بە ڕێسمانێک ڕانەکانی بە سەر کورسییەکەدا، بەدوو ڕیسمان سنگ و زگی بە پشتی کورسییەکەوە، بە ڕێسمانێکیش جومگە و مەچەکی دەستەکانی بە «بەست»ی پشت کورسییەکەوە بەسترابوون. هەر ئەوەندە بووکە دەیتوانی لە جێی خۆیدا بجووڵێتەوە. ئارەقە لە لەشیەوە دادەچۆڕا و تەسمەکانی توندتر دەکرد. هەست بە پشووکێشانی نەدەکرا. چاوەکانی سارد و بەبێ‌جووڵانەوە بوون، ڕاست وەک چاوی گاکی. لە

ترووسکە ترووسکی تیشکی خۆری سەر «گەچ بڕی»ی ساپیتکی ژوورەکە کوڕ ببۆوە، تیشکەکە خەریک بوو ڕەنگەکەی دەدۆڕاند و بزر دەبوو.

کەلامی نووسەر دەبێتە هۆی پرسیاری جۆرانجۆر لە زەینی خوێنەردا. بڕێک لەم پرسیارانە لە ناو چیرۆکەکەدا وەڵام دراونەتەوە، بۆ وێنە: مۆرفی بۆیە ئەندامی خۆی بەم چەشنە سەیروسەمەرەیە بەکورسیەوە بەستۆتەوە تاکوو تەواوەن لە زەینیدا بژی؛ بە وتەیەکی دیکە، ئەو زۆر توند بڕوای بە «ڕەسەنایەتی زەین»ە.

بەڵام مۆرفی چۆن دەتوانێ بە بێ یارمەتی دیتران خۆی بەو کورسیەوە ببەستێتەوە؟ حەوتەمین ڕێسمان لە کوێیە؟ لەم چیرۆکەدا دەنگی کێ دەبیستن؟ چ کەسێک بۆ خۆری پیری چارەڕەش دڵسۆزی دەکا؟ کێ چاوەکانی مۆرفی دەگەڵ چاوەکانی گاکیدا بەراورد دەکا و واتای ئەم سەناعاتی ئەدەبیە چیە؟ زۆر ئەستەمە ئەم پرسیارانە وەڵام دەینەوە.

چیرۆکی *دانتێ و قرژاڵ* بەرهەمەکانی جۆیس‌مان بە یاد دێنێتەوە و *مۆرفی*ش رۆمانی دەیەی ١٩٣٠ بیکێتە.

زەمەن و شوێنی مانووکەرە و تایبەتی ئەم رۆمانە (لەندەنی١٩٣٥) و بابەتەکەی (لاوێکی دەست تەنگ و لەخۆ نامۆبوو کە کارێکی شیاوی بۆ نیە و لە چارە سەرکردنی هەوجێ و مەخاریجی کیژە دەسگیرانەکەیدا گرفتی هەیە)، لە بڕێ لایەنەوە لە رۆمانەکانی ئیشرووود (Christopher_Isherwood) و ئۆروێل (George-orwell) دەچێ، بەڵام دەبێ بە چەشنێکی تەواوەن جیاواز بخوێندرێتەوە. رۆمانی *مۆرفی* لە عەینی رەفز کردنەوەی هاوتاسازی ئوستوورەیی جۆیس سەبارەت بەوەسفی دۆبلین ( پاتەختی ئیرلەندیا ) نەریتە ریالیستییەکانی رۆماننوسانی گەورەی دەیەی ١٩٣٠ زایینیش لە بەر چاو ناگرێ و گاڵتەیان پێدەکا. لەم رۆمانەدا رەنگی ناوچەیی هەبوونی نیە و

وەسفی کەسێتی و شوێن وێڕای کەڵک وەرگرتن لە ( مەجازی مورسەل) و بە چەشنێکی بیرەوەری ئاسا نەقەوماوە. لە سەرەتای بەشی دووهەمدا، بۆ وەسفی کەسێتی سیلیا ( Celia) پێرستێک لە ئەژمار و ئاگاداری و زانیاری نووسراوە کە بەشێکیان بەو چەشنەیە:

| | |
|---|---|
| *تەمەن* | *بایەخی نیە* |
| *سەر* | *چکۆڵە و خڕ* |
| *رەنگی چاو* | *سەوز* |
| *رەنگ و روو* | *سپی* |
| *قژ* | *قاوەیی* |
| *دۆخی روخسار* | *جۆرانجۆر* |
| *گەردن* | $13\frac{3}{4}$ |

**نووسەر بەم چەشنە شئوازت باوت وەسفت رووافەیت کەسئیتەکان لە رژماندا بە گاڤیە دەگری، هەر وەکوو وەسفت کژی و شەڤوارت سەترو رەنگ سەوزت مژرفت لاساتت کردنەوەتەکت گاڤیە جارانەتە لە دەسیەوداوئن بوونت رژماننوسانت رتالتسی بژ رەمز و نتشانەت لتباس وەکوو یاتبەیمەندت کەسئیت. چاخئوەر ( گئرڕەوەر= بگئرڕەوە = راوت) زتایر رژمانەکە بە بی باسکردنت برڕوات یاتبەیت خژت و بە راویژئکت بی لاتەنگرت کردن دەگئرڕیەوە بەڤام هەروەها خژیئهەڤقوریاندنت نابەجی دەکا. خوئنەرتش بژ گوی دئر بوون دەنگ دەدا ( چەت خوئنەرت پاتەبەرز کە چەم رژمانە بە چەشنئکت رووکەش وچاوەکت دەخوئنتتەوە) بترووڕات «پەرڕ**

**چترژکـــت»ش دەردەبــڕی ( ســـئلتا، شـــوکر بـــژ خودا، نـــاوئکت مەستحت». . . «چەم بەشـەت سـەرەوە بـە چانقـەسیەت یـەواو و بـژ مەبەسیت ناحەزکردنت چاکارت خۆئنەرت چتماندار نووسراوە»).**

زۆر چەتوونە بکرێ شێوازی بەشە جۆرانجورەکـانی رۆمـان یـان زنجیرەی رووداوەکان پێشبینی بکەین و باوەکوو چیروکێکی زۆر پێکەنین سازە، بەڵام خوێندنەوەکەی هەر بەم هۆکارەوە هیچ کارێکی ئاسان نیە. رۆمـانی *مۆرفی* قاوغ یان ریتمێکی یەک هەوا هەڵناگرێ کە بتوانین بە سانایی دەست نیشانی کەین و بەم سۆنگەوە لە هـەمبـەری خوێنـەردا خـۆی بـە دەسـتەوە نـادا؛ ئـەم رۆمانە بەم چەشنە لە باری نەریتەکانی خوێندنەوەوە، خۆ بە دەسـتەوە نـەدانی جیهانی هەستی سەبارەت بە راڤە و شیکاری دەکاتە سەرمەشقی خۆی.

ئەم ئیدەیە لە رۆمانی دوای مۆرفیدا بە نێوی *وات* (Watt) نوسـراوەی سالـانی ٤٣-١٩٤٢ دا و بـڵاوەوە بـووی سالـی ١٩٥٣ ز. دۆخێکـی ئاشـکرا بـە خـۆوە دەگرێ، بە تایبەت لە رووداوی لاوەکی هاتنی باب و کوڕێک بە نێوی گاڵ (Gall) بـۆ بـەر دەرگـای ماڵـی ئاغـای نـات (Natt) کـە وات لـەوێ وەکـوو خزمەتکارێک کار دەکات:

ئیمە گاڵین، باب وکوڕ، بابـەتی گـرینگیش ئـەمـەیـە کـە دنیایـەک بـەرێـدا هاتووین، لە شارەوە بۆ ئێرە، تا کۆکی (قورمیش)ی پیانۆکەتان میزان کەیـن. دووکەس بوون و ژێر باڵی یەکـدییان گرتبـوو، بـەم چـەشـنە، چوونکـە ئـەو باوکە، وەکوو زۆربەی ئەو کەسانەی لەم پیشەیەدان، کوێر بوو. چونکە چمـا ئەو باوکە کوێر نەبایە، ئیدی هەوجێی بەوە نەبوو کوڕەکەی ژێر باڵی بگـرێ و لە چوونە ئەم لاو ئەولادا رێنـوێنی بکـات، نـا، بـەڵـکوو کـوڕەکـەی ئـازاد دەکرد تا بڕوات و کارەکانی خۆی جێ بە جێ بکات. ئەمە بۆ چوونی وات بوو، باوەکوو لە روخساری ئەو باوکەدا هیچ نیشانەیەکی کوێری نەدەبینـدرا،

هەروەها لە چەشنی راوێستانەکەشیدا.تەنها چەشنێک پاڵی بە کورەکەیەوە دابوو کە دیار بوو هەوجێی زۆری بە کەسێک هەیە کە پاڵی پێوەدا. بەڵام بەڵکوو هۆکاری ئەم چەشنە راوێستانەی عەیبدار بوونی قاچەکانی یان هەر بە هۆی ماندوو بوون بە سۆنگەی تەمەنی زۆرەوە بوو. ئەوەندەی هزری وات کاری دەکرد، هیچ لە یەکچوونێکی بنەماڵەیی لە نێوان ئەو دووانەدا نەبوو، وێرای ئەمەش دەیزانی کە لە لای باب و کورێکە، چما هەر خولەکێک پێشتر وایانی پێ نەوتبوو؟ یان بەڵکەم زرباب و زرکوری یەکدی بوون. ئێمە گاڵین، باوە پیارە و زرکور ـ رەنگە پێویست بایە ئەم رستەیە بووترایە ـ بەڵام سروشتی بوو کە ئەو رستەیەی دیکە هەڵبژێردرێ ـ نەک هەر هیچ لێک نەچن و باب و کور نەبن، چوونکە بۆی هەبوو باب و کور بن.»

نەبوونی رەهایەتی (عدم قطعیت) هەروەکوو تاعوون خۆی دەسەپێنێتە هەموو جیهانی واتەوە. گێرەوەری چیرۆک دەڵێ: «بە شوێن رووداوی هاتنی باب و کورێک بە نێوی گاڵ، چەند رووداوێکی دیکەی وەکی ئەمەش قەوما، یانی رووداوگەلێک کە بە رواڵەت زۆر لە بەرچاو و زەق بوون بەڵام مەعناکانیان رون نەبوو، واتیش نەیدەزانی بیسەلمێنێ، شیمانەی هەیە ئەم رووداوانە تەنیا گاڵتەی زەمەن لەگەڵ شوێندا بێ. . . شایەد بە هۆکاری کەسێتی تایبەتییەوە، دەبایە لە واتاکەیان حاڵی بایە. . . بەڵام داواکردنی مەعنا لەو کەسەی سەرنج ناداتە مەعنا، یانی چی؟ ئاکامی ئەم کارە چ دەبوو؟ ئەمانە پرسیارگەلێکی گرینگن.»

بە راستی هەروایە، بەڵام ئەم پرسیارانە لە بەرهەمەکانی بیکێتدا بایەخێکی تەواوەن بنەرەتی یان هەیە. خۆ بەدەستەوە نەدانی جیهانی هەستی لە هەمبەری راڤەکردنی مەعناداردا کە زۆر کات جەختی لەسەر دەکەن، بنەما و بناغەیەکی بە بێداهاتە بۆ رۆماننووسین، مەگەم هەروا مەبەستی مرۆڤ بۆ

تێکۆشان بەرەو راڤەیەکی ئاوا بە چەشنێکی پڕئێش و ژان نیشان بدات، بە تایبەت بە سۆنگەی راستە و پاستەکردنی بیرەوەری کەسانە لە قاوغی گێڕانەوەدا. لە قۆناغی دواتری ریوایەت نووسینەوەی بیکێتدا (یانی ئەو کاتەی بەرهەمی سێ یانەی *ملۆی* (Molloy) «١٩٥٠» ـ *مێلۆن دەمرێ* ( Malone Dias ) «١٩٥١» ـ *ناو نەهێنان* (Unhamable ) «١٩٥٣» بڵاو بۆوە، گێڕەوەری بێ سەرنجی یەکەم چیرۆکەکانی بیکێت کە بە چەشنێکی نائاسایی خۆی لە گێڕانەوەدا تێهەڵدەقورتاند و لەبز بازییەکانی شیاوی پێش بینین نەبوو، جێگەی خۆیان داوەتە کۆیەک ئاخێوەری یەکەم کەس کە لەو پەڕی دوورە پەرێزی دان و لە هانەکانی هەست بێ بەشن و لەو پەڕی داماویدا تێدەکۆشن هەتا وێڕای وەیاد هێنانەوەی رووداوەکانی رابردوو، سەر لەو شتە دەربێنن کە بەسەریان هاتووە دژایەتی نێوان بێ کەڵک بوونی ئەم تەقەلایە و مەجبوور بوون بۆ بە جێ هێنانەکەی، دەبێتە هۆکاری تێداچوون و بێدەنگی، کە ئەمەش لە جێی خۆیدا ترس و خۆف سازە و مرۆڤ پێمل بەوە دەکا تاکوو زۆر شێواوانە پەنا بەرێتە بەر پاشماوەی زانیاریەکانی ـ بەڵام ئەم کارەش ورەبەزێنە.

«... خۆزیا شتێک هەبوونی بایە، بەڵام چ ناکرێ، هەبوونی نیە، لە کاتی رۆشتندا هەموو شتێکیان برد، سروشتیان لە گەڵ خۆیاندا برد، هەرگیز کەسێک نەبوو، کەسێک بێج لە خۆم، هیچ شتێ بێج لە خۆم، تا لە گەڵ من باسی خۆم بکا، ناتوانم کۆتایی پێ بێنم، ناتوانم درێژەی پێ بدەم، بەڵام دەبێ درێژەی پێ بدەم، درێژەی پێ دەدەم، یانی کۆتایی پێ دێنم، تەواوی دەکەم، ئیدی کاتی کۆتایی گەیشتووە، مردار، ئەمە چیە؟ چاڵێکی چکۆڵانە،دەڕۆیە قووڵاییەکەی، بۆ نێو بێدەنگی، لە هەڵا و زەنا خەراپترە، دەیبیستی؟ لە قسەکردن خراپترە، نا، نەک خەراپتر، چاوەڕوان دەبی، بە

نیگەرانیەوە، بلێی منیان فەرامۆش کردبێ؟نا، ئەرێ، نا، کەسێک بانگم دەکا، هەمیسان دێمە دەرێ، ئەمە چیە؟قوولکێکی گچکە، لە عەرد و بیاباندا، کۆتایی لە هەموو شتێ خەراپترە، نا، سەرەتا لە هەموو شتێ خەراپترە، لە پاشان نێوەڕاست، لە دوایە کۆتایی، لە کۆتاییدا ئەمە کۆتاییە کە لە هەموو شتێ خەراپترە، ئەم دەنگە، ئەو، نازانم، هەر چرکە ساتێک لەهەمووی خەراپترە. . . ».

ئەمە زۆر هەڵەیە بێتوو بڵێین هەموو رۆمان نووسانی پۆست مۆدێرن ئەم سەرقاڵبوونی زەین وگیرۆدە بوونە فەلسەفیەی بیکێت یان هەیە، بەڵام بە گشتی جیهانی هەستی لە هەمبەر چالاکی بێ ئێختیاری زەینی ئینساندا بۆ شرۆڤەی کائینات خۆڕاگری دەکا و ئەم کێشە و گرفتەی کە مرۆڤ یەخسیری بووە، بە واتایەک «پووچ»ە و بناغەی بەشێکی گەورەی چیرۆکی پاش نوێخوازی پێکهێناوە. بەم هۆکارەوە، پاش نوێخوازی بە پێ و شوێنی دۆزینەوەی جێگرێکی رووالەتی لە بەرامبەر مۆدێرنیزم و هەروەها دژەمۆدێرنیزمدایە. لایەنی هاوبەشی نوێخوازی و پاش نوێخوازی ئەمەیە کە قاوغی داسەپاو بەسەر ئەزموونەکانی ژیان لە رۆمانی ریالیزمی سەلەفیدا رەفز دەکەنەوە. بەڵام پۆست مۆدێرنەکان بڕوایان وایە کە مۆدێرنەکانیش وێڕای ئەم هەموو تازەگەری و واتای داپۆشراو و ئاڵۆزکاوی و تەم ومژاوی بوونی بەرهەمەکانیان، جیهانی هەستییان لە ڕادەبەدەر ساف و سانا نیشان داوە و ئەم هیوا درۆیینەیان پێکهێناوە کە دەکرێ زەینی مرۆڤ دەگەڵ ئەم جیهانەدا ئۆگری یەکدی بکەین. بۆ وێنە، شێوازی کەلام و چۆنیەتی گێڕانەوەی لە ڕادەبەر دژواری رۆمانی *شەونخوونی فینیگانەکان* کە بەرهەمێکی هەرە توندڕۆی خەیاڵاتخوازی ئەدەبی مۆدێرنیستییە، حەتمەن خوێندنەوە و شیکارییەکەی ئێخسیری گرفت و دژواری دەکات و رەنگە

هێشتا ئەو «خوێنەرە دڵخوازە ڕەموودە (موعتاد) و بە بێخەوە دڵخوازەی» کە جۆیس وتبووی ئەم ڕۆمانەی بۆ ئەو لە بەر چاو گرتووە نەیدۆزیبێتەوە، دیسانەکەش وێڕای ئەمانە شیاوی فامست و لێحاڵیبوونە و ـ ئاخری دەتوانین تەواوەتی ئەو واتایانەی کە جۆیس تێیدا حەشاری داوە، دەری کێشین و ئەم واتایانە بە چەشنێکی یەکپارچە، یەک گرتوویی‌یان دەبێ، پاش نوێخوازی ئەم بڕوایە لەرزۆک دەکات ـ

یەکێک لە کەسێتی‌یەکانی ڕۆمانی *سپیلە بەفرینە* ( Snow _ white) بەرهەمی دۆناڵدبار تێلمی (Donald Barthelme) وێڕای ئاماژە بۆ نێوی چیرۆکێکی هێنری جەیمز (henry - games) کە وەکوو سەمبۆلی مەبەستی ڕاقە و شیکاری، بۆتە بنێشتە خۆشەی سەر زاری ڕەخنەگرانی مۆدێڕن، پرسیار دەکا: «ئەی بەس نەقش و نیگاری قاڵی لە کوێیدایە؟» لە پاشان بە چەشنێکی نیگەران کەرەوە تێهەڵدەچێتەوە : «یان خۆ هەر... قاڵی یە؟» زۆرێک لە دەقە پاش نوێخوازییەکان ئەم فیکرە سازدەکەن کە ئەزموون «قالییە و بەس» هەرنیگارێکیش لەوێدا بدۆزینەوە، لە خەیاڵێکی خۆڕایی و گومانێکی «دڵ خۆشکەرە» زیاترنین.

گرفتی خوێنەری ڕۆمانی پۆست مۆدێڕنیستی، ئیبهام (شاردراوەیی) دەق نیە ـ چوونکە دەکرێ شاراوەیی چارەسەر بکەین ـ بەڵکوو ئەغلەب نەبوونی ڕەهایەتی‌یە (عَدَم قطعیت) کە بە سەر هەموو دەقەکەدا دەکشێ و خۆی زیاتر لە ڕادەی گێڕانەوەدا نیشان ئەدا نەک لە شێوازدا. بۆ وێنە، تا هەر ڕادەیەک بە وزەوە ڕۆمانی *مێلۆی* لێکدەینەوە، دیسانیش بە ڕەهایەتییەوە، ناتوانین بڵێین: بڵێی ئەو پیاوەی کە مۆڕێن (Moran) دەیدینێ و کۆتی ئەستوور و کڵاو و گۆچانی هەیە، هەمان پیاوێک بێت کە مێلۆی پێیدەڵێ «س» یا خودی مێلۆیە یان کەسێکی دیکەیە؟

ئەو وتەیەی هیۆ کێنێر کە دەڵێ : «بیکێت کەش و هەوایەک لە نەبوونی رەهایەتی پێکدێنێ و چیرۆکێک کە بناغەی لە سەر نەبوونی رەهایەتی بێ زۆرکات زایە دەبێ ... » سەبارەت بە زۆربەی نووسەرانی پاش نوێخوازی راستە. ببڕاببڕ ناتوانین شاراوەیی ناو گەڵاڵەی رۆمانە پاش نوێخوازییەکان چارەسەر بکەین، چوونکە ئەم چەشنە رۆمانانە ـکە لە کلافێکی ئاڵۆزکاو دەچن، لەم بەستێنەدا، بە تایبەت چەشنی کۆتایی هاتنی ئەم رۆمانانە ـ کە لە جیاتی «دەرگای چوونە دەرێ»ی ئەوانە ـ شیاوی سەرنجدانە. لە جیاتی کۆتایی رەهای رۆمانی سوننەتی ( رۆمانی باو و سەلەفی) کە لەواندا هەموو نەهێنی یەکان ئاشکرا دەبن و چارەنووسی کە سایەتییەکان خۆیا دەبێ، هەروەها لەبری کۆتایی نادیاری رۆمانی مۆدێڕنیستی ( کە هەر وەکوو کۆنراد ( Goseph_ Conrad ) سەبارەت بە رۆمانەکانی هێنری جەیمز دەڵێ: «رازیمان دەکەن، بەڵام راستی نین». لە رۆمانی پاش نوێخوازانەدا لەگەڵ کۆتایی چەند چەشنەی درۆیین، دەستکرد، یان لاسایی کردنەوەیەکی گاڵتەجاڕانەدا رووبەڕوو دەبینەوە.

چەشنی کۆنەی کۆتایی «رەها» لە چیرۆکە جینایییەکاندا هەیە کە لەواندا «کاراگا» نەهێنی جینایەت ئاشکرا دەکات. سەری تاڵە هەودای بە ڕواڵەت بێ پێوەندی و ئاڵۆزکاوەکان بە چەشنێکی یەک گرتوو پێکەوە گرێ دەدا و ئەگەری سازدانی «عەدالەت» جێ بە جێ دەکا، میۆریێل سپارک (Mureil_Spark) بە نووسینی چەشنێک رۆمان کە لەواندا جێ گۆڕکەی دەوری قاتڵ و بەکوژچوو و شاهیدەکان دەبنە هۆکاری شێواوی و دڵەڕاوکەی خوێنەر، نەریتی «کۆتایی رەها»ی چیرۆکە جینایییەکان بە گاڵتە دەگرێ و نیوە ئاماژە و نیوە ئاشکرا، رەخنە لە پەڕڕوویی رۆماننووسان و هەروەها ئەو «کارئاگا»یانە دەگرێ کە وادەنوێنن ئەوان سۆنگە و بکەری

جێ بە جێ کردنی چارە نووسی خودایین. بۆ وێنە لە رۆمانی *کورسی سایەق*دا کەسێتییەک بە نێوی لایس (Lyse) لە دوایین رۆژەکانی تەمەنی خۆیدا چەندان سەرە تاڵە دەزوو لە چەند وڵاتی ئەورووپی بە دەستەوە دەدا کە هیچ واتایەکی تایبەتیان نیە، هەتا لە کۆتاییدا بۆمان دەردەکەوێ کە بە وتەیەک ئەو هەم گەڵاڵەی پیاو کوشتنێکی دارشتووە و هەم تێدا چووە.

لە رۆمانێکی دیکەی ئەم نووسەرەدا بە نێوی *سەرەخەر نەبوون* (NottoDisturb) نۆکەر و قەرەواشی کۆشکێکی گەورەی نێزیک زەریالەی ژینێڤ قەرار و بڕیار دادەنێن بە سۆنگەی جینایەتێکی کە بەڕێوەیە و ئەمەش بە هۆکاری پێوەندیی ناشەرعی ژنی خاون کۆشکەکەوەیە، بە نان و رۆنێک بگەن. بۆ ئەم مەبەستە هەر لە بەرەوە هەواڵ بە هەواڵنێران دەدەن، چەند بڕیارنامە ئامادە دەکەن، بە تەلەفۆن لە گەڵ هاومامڵەکەیان لە ئامریکادا وتوویژ دەکەن و چەند ئاخافتنێک لە سەر نەوار و فیلم تۆمار دەکەن، ئەڵبەت تەواوەتی ئەم کارانە لە کاتێکدا دەکەن کە خاوەن کۆشک لە کتێبخانەیماڵەکەیدا سەرقاڵی دەمەتەقە دەگەڵ خێزانی و کەڵەگاکەیدایە. هێشتاش پیاو کوشتنەکە نەقەوماوە. لیستەر (Lister) گەورە خزمەتکاری بە ئەدەبی ماڵێ کەهەمووی ئەم کارانە لە ژێر چاوەدێری ئەودایە، سەبارەت بە ئەربابەکانی خۆی دەڵێ: «بە داخەوە خۆیان خستۆتە مەیانی «جەبر»ەوە ئەو ناهێڵێ دووکەس لە کەسێتییەکان بچنە نێو ماڵەوە، هەرلە بەر ئەوەی ئەوان لەگەڵ چیرۆکەکەدا یەک ناگرنەوە» و بە مەرحەمەتی هەورە تریشقەوە (کە هەر کاتێ پێویست بێ دێتە یارمەتی خودایان ورۆماننووسان ) ئەم دووکەسە لە رۆمان وەدەر دەنرێن.

جان فالز(Gohn fowles) چەند چەشنە کۆتایی جۆراوجۆر بۆ رۆمانی *ژنی سیتوانی فەڕەنسی* لە بەر چاو دەگرێ و داوا لە خوێنەر دەکات هەرکامیانی پەسەندە، هەڵیبژێرێ.

جان بارت(Gohn Barth) لە کورتە چیرۆکێکدا بە نێوی *ون بوو لە نساری کایەدا* ـ ١٩٦٨ـ کۆیەک لەو کۆتایی‌یانەی ئەگەری هەیە، دێنێتە ئاراوە، بەڵام لە ئاکامدا هەموویان رەفز دەکاتەوە بێج لە کۆتاییە هەرە نارەها و هەرە بێ‌تام و چێژەکەیان. هەر ئەو لە چیرۆکێکی دیکەی لە ژێر سەردێڕی *عینوان*دا کە بە ئاشکرا کاریگەری بیکێتی بە سەرەوەیە، تێدەکۆشێ خۆی لە تەواوکردنی چیرۆک نەدا:

«تەقریبەن تەواو بووە، ئێزن بدەن گرێ کردنەوەی چیرۆک، فەوری و چاوەنوارِ نەکراوبێ، پڕداخ و کەسەر نەبێ، لانی کەم خێرا بێ و لە هەموو شتێ گرینگتر فەوری بێ. ئێستا، ئێستا! ئاکام چۆن دەبێ؟» لە کۆتایی یەکێک لە رۆمانەکانی ریچارد براتیگان(Richard _ Brautigan)دا بەشێک دەبینین کە نێوەکەی *دووهەمین کۆتایی*یە. نووسەر لە پاشان ئاکامی سێهەم و چوارەم و پێنجەمیشی زیاد کردووە: «دەیجا ئاکامی زیاتر و زیاتریش هەن: ئاکامی ژمارە ٦ـ ژمارەی ٥٣ ـ ژمارەی ١٣١ ـ ژمارەی ٩٤٣٥ و ئاکامگەلێک کە خێراتر و خێراتر بە شوێن یەکدیدا دێن، ئاکامی زۆرتر و زۆرتر، خێراتر و خێراتر، هەتا ئەم کتێبە لە هەر چرکەساتدا ـ ١٨٦٠٠٠کۆتایی هەبێ.

لە رۆمانی *راوکردنی ماسی قزل ئالا لە ئامریکا*دا کە ئەمەیش بەرهەمی ریچارد براتیگانە ـ ١٩٦٧ ـ بەشی پێش کۆتایی لە ژێر سەردێڕی «سۆسی مایۆنێز»دا بەم چەشنە کۆتایی پێدێ:

«بۆ مەبەستی دەربڕینی هەوجێیەکی مرۆڤانە، هەمیشە دڵم پێوە بوو کتێبێک بنووسم کە بە وشەی «مایۆنێز» تەواو بێ. بەم هۆکارەوە، دوایین بەشی ئەم

رۆمانە لە راستیدا روونووسی نامەی *دایک و نانسی* لە ساڵی ١٩٥٢دا بۆ فلۆرانس و هارڤ ( Nancy,Floerance,harv) کە لە ژێر نووسیدا نووسراوە: «ببوورن کە لە یادم چوو «سۆسی مایەنز» (هەڵەی ئیملایی وشەی مایۆنێز بە ئانقەستە لە لایەن نووسەرەوە) خودی ئەم خاڵەش دەبێتە هۆی پێکەنین، کە ئەم هەوجێ ئینسانیەش ـ کە زیاتر لە هەوا و هەوەسێک دەچێ ـ بە بێ دوایین بەشیش دەیتوانی چارەسەر بکرێت. چوونکە بەشی بەر لە کۆتاییش بە وشەی «مایۆنێز» کۆتایی پێدێ. «بەشی سۆسی مایۆنێز»یش شێوازێکی لە خۆڕا و دەسکردە بۆ ئەم متمانەیە کە کتێبەکە بە وشەی «مایۆنێز» کۆتایی پێ بێ. چوونکە ئەو نامەیەی لە بەشی کۆتاییدا لە چاپدراوە، پێوەندییەکی لە گەڵ هیچ کام لە رووداوەکانی پێشووتری رۆمانەکەوە نیە. لە راستیدا، هەڵەی ئیملایی «مایۆنێز» وەدەری دەخات کە نووسەر وێڕای نووسینی فۆنۆتیکی ئەم وشەیە، کارێکی کردووە تا مەبەستەکەی وەڕاست نەگەڕێ.

سەبارەت بەوەی تازەبوونی ئەو تەکنیکانەی کە لە رۆمانە پاش نوێخوازییەکاندا دەکار کراون، بە راستی تا چ رادەیەک سەرنج ڕاکێشەر بوون، رەخنەگر بیر و رای جیاوازیان دەربڕیوە. بۆ وێنە «لیزلی فیدلەر»(Leslie Fiedler) بڕوای وایە پۆست مۆدێرنیزم لە مەیدانی رۆماننووسیندا بە راستی شۆڕشێکی پێکهێناوە، لە دۆخێکدا فرانک کرمۆد(Frank Kermode) بڕوای وایە کە پۆست مۆدێرنیزم تەنها بۆتە هۆکاری «پێشکەوتنی ناچیزەی مۆدێرنیزمی کۆن». دەتوانین لە هەر دوو بڕوا پشتیوانی بکەین؛ مەبەستم ئەمەیە کە بە وتەیەک هەر دووکیان «درووست»ن. بەستە بەمەیە کە مەبەستی رەخنەگر چ بێ و لە بۆ گەیشتن بەم مەبەستە، کارەکەی لە کوێ وە دەست پێ بکا. فیدلەر بە گشتی ئەدەب و فەرهەنگی ئەمریکی دەسەلمێنێ (بە واتای مرۆناسییەوە) کرمۆدیش چاوی لە

تەواوی هونەرە پێشتازەکانە لە پانتاییەکی نێو نەتەوەییدا. بە لای فیدلەرەوە پۆست مۆدێرنیزم لە بناغەدا دیاردەیەکی «پەرمرۆڤخوازانە» و زۆر ئی ئەم دووایانەیە کە دە گەڵ وتەزا و بایەخە جوانی ناسینانەکانی سەلەفیدا دژایەتی دەکا، یان بە هەندیان ناگرێ، قاوغە جۆرانجۆرەکانی ئاینی تام و چێژخوازی بۆ بەردەنگە بە گشتی لاوەکانی خۆی دەناسێنێ و بە شیکاری فۆرمالیستی ناتوانین ئەوە لێکدەینەوە، هونەرەکەی دژی هونەرە و دەبێ بە «شێوازی رەخنەیی مەرگی هونەر» راڤەی بکەین ـ لە لایەکی دیکەوە، کرمۆد لە پلەوپایەی مێژوونووسی هونەر و جوانی ناسیندا پاش نوێخوازی هەڵدەسەنگێنێ. تەقریبەن بە سانایی سەرچاوەی گریمانەی تیۆرەکانی ئەو لە مۆدێرنیسمی کلاسیکیدا یان لە پاژەکانی دادائیزمدا (کە زۆر لە مەوبەر لە ١٩١٦ دا بە بڕوای کرمۆد، لە راستیدا دادائیزم بزووتنەوەیەکی کەمبایەخ بوو و بەرهەمە دادائیستیەکان زیاتر لە شۆخی دەچن نەک لە هونەر. کرمۆد لە وتارێکیدا دەنووسێ: «ئەم بەرهەمانە ئاماژەی لە بەر دڵان بۆ شتی وان کە لە راستیدا لە دادائیزم زیاتر سەرنجی ئێمە بەرەو خۆیان رادەکێشن.»

مەبەستی من لەم وتارەدا ئاشتکردنەوەی ئەم روانگە جیاوازانە نیە، بەڵکوو دەمهەوێ ئەو خاڵ و یاسا رووالەتی یانەی کە بنچینە و بناغەی بەرهەمی پۆست مۆدێرنیزمن روون کەمەوە.

چما ئەم وتەیەی رۆمەن یاکووبسن (Roman Yakobson) راست بێ کە هەموو روخسارەکانی کەلام سەر بە یەکێک لە دوو قوتبی «خوازە» و «مەجاز»ن، دەسا دەبی بتوانین بەرهەمە پاش نوێخوازییەکان لە سەر بناغەی یەکێک لەم دوو قوتبە پۆلێن بکەین. کورتەی ساناکراوی بیرۆکەی یاکووبسن ئەمەیە: «کەلام لە هەر قاوغ و رووخسارێکدا بابەتێک بە بابەتێکی دیکەوە دەلکێنێ، چوونکە ئەم دوو بابەتە یان لە لایەنێکەوە لە یەکدی

دەچن یان لە نێزیکی یەکدی دان. بە پێی ئەم تیۆرە، بێت و تێ بکۆشین بابەتگەلێک لە سەر بناغەی یاسا و ڕێسایەکی دیکە (یان بە بێ هیچ یاساورێسایەک) پۆلێن بکەین، بۆمان دەردەکەوێ کە زەینی مرۆڤ هەروەها تێدەکۆشێ تا لە دەقی بەرهەم هاتووی پێوەندی ئەو بابەتانە، یەکێک لە پێوەندییەکانی لە یەکچوون یان نێزیکایەتی (یا هەردووکی ئەم پێوەندییانە) بدۆزێتەوە و چما نەتوانین دەقێک بەم چەشنە لێکدەینەوە، لەو دۆخەدا دەتوانین بڵێین لە ڕاستیدا دەقێک لە گۆڕێدا نیە. بە گومانی من دەتوانین دەقە پۆست مۆدێرنیستییەکان بە پێی ئەم تیۆرە شیکاری بکەین، بەڵام بەڵکوو ئەم کارەش زۆر بە کەڵک نەبێ. چوونکە چما فرەگر بوونی زاراوەی «پاش نوێ خوازانە» ئەوەندە بەربڵاو بێ تا هەمووی ئەو نووسەرانەی کە ئەم زاراوەیە بە ڕووالەت سەبارەت بەوان ڕاستە و دەیانگرێتەوە، بە پێی یاسا دەبێ بتوانین بە وردی مەعلوومی بکەین کام یەک لەوان خوازیاری کەڵک وەرگرتن لە خوازە و کامیان لە مەجازن. بەڵام بە دژوارییەوە دەکرێ نیشان بدرێ کە بەرهەمەکانیان، بە گشتی، سەر بە یەکێک لەم دوو قوتبەیە. دەڵێی بۆ زەق کردنەوەی تایبەتمەندییەکانی ڕووالەتی بەرهەمی پۆست مۆدێرنیستی باشتر وایە بزانین کە چۆن خوازە و مەجاز لەم بەرهەمانەدا بە شێوازێکی تەواوەن نوێ دەکار کراون و نەمانهەوێ کە حەتمەن یەکێک لەم دوو یاسایەی لکاندنی پێوەندی بابەتێک بە بابەتێکی دیکەوە هەڵبژێرین ( باوەکوو هەڵنەبژاردنی یەکێ لەم دوو یاسایە لە ئاکامدا کارێکی بێ کەڵک بێ.) بێج لە دوو قوتبی خوازە و مەجازی کەلام، دەتوانین چ جێگر و جێ نشین گەلێکی دیکە بۆ مەبەستی شیکاری دەقە پۆست مۆدێرنیستییەکان دەکار کەین؟ لە بەشەکانی دیکەی ئەم وتارەدا، برێ ناوم بۆ ڕوونکردنەوەی ئەگەری ئەم جێگرانە هێناوەتە گۆڕێ.

## ١ ـ پارادۆکس ( دژوازی، دژایەتی )

«بەڵام قسە کردن سەبارەت بەم شتە، یانی لەگەڵکوو وۆرم ( **Worm** ) جووڵاوە و بەڕێ کەوت تا بە هەر چەشنێک بێ خۆی بگەیەنێتە ئەوان، ئەوان چی دەکەن؟ چ کەڵکێکی هەیە؟ لە بەر ئەوەی ئەو ناتوانێ خۆی بجووڵێنێتەوە، باوەکوو دایمە دڵی پێوەیە بجووڵێتەوە، بێت و سەبارەت بەو باسی دڵ پێوەبوون بکەین، ئەڵبەت ناتوانین و ناکرێ. بەڵام چی بکەین؟ دەبێ سەبارەت بەو ئاوا قسە بکردرێ، وایدانێی زیندووە، وەک بڵێی دەفامێ، وەک بڵێی دەتوانێ دڵی پێوەبێ. باوەکوو کارێکی لەخۆڕایی بێ، ئاخە لەخۆڕاییشە.»

هەر کۆپلەیەکی ئەو وتەگێڕانەوەیەی سەرەوە کە لە رۆمانی *شیاوی ناونەهێنان‌ی* ساموویێل بیکێتە، کۆپلەکانی دیکەی بەر لە خۆی رەفز دەکاتەوە، لە راستیدا ئەو وتەگێڕانەوەیە نموونەی ئەو دەقانەیە کە ئاخێوەرەکەی بەرحوکمی دوودڵ مانەوە لە نێوان ویستەکان و داواکارییە نەحەواوەکەیدایە. لە کۆتایی رۆمانەکەدا زۆر پسپۆڕانە نووسراوە: «دەبێ درێژەی پێ بدەی، ناتوانم درێژەی پێ بدەم، درێژەی پێ دەدەم.» بێت و نەزم و تەرتیبی رستەکانی ئەم دەستەواژەیە بڕێک گۆڕدرابایە، یانی بەم چەشنە: ( ناتوانم درێژەی پێ بدەم، درێژەی پێ بدە، درێژەی پێدەدەم )، ئیدی لەم دۆخەدا لەگەڵ خۆیدا دژایەتی نەدەبوو، بەڵکوو دەگۆڕایە سەر بەردەوامبوونێکی لۆژیکی و (دڵخۆشکەرە )ی پڕ لە ناهومێدی و خۆئامۆژگاری کردن و نوێ کردنەوەی ویست و خواز. هەر رستەیەکی ئەم دەستەواژەیە ـ لەم دۆخەی ئێستای خۆیدا ـ رستەی بەر لە خۆی رەفز دەکاتەوە. ئەم رستەیەی کورتەچیرۆکی *دەستایۆڤیسکی* بەرهەمی لیئۆنارد مەیکلز (**Leonard Michels** ) کە نووسراوە: «ناکرێ بە خەیاڵات کردن یا

بـەبێ خەیاڵـات کـردن بـژی»، لەگـەڵ بنچینـە و بنـەمای زۆر دژوازبـوونی نڤیساریی پـاش نـوێ خوازانـەدا نێزیکایـەتی هەیـە. ئـاین و نـەریتی بـاکێنیزم (boconusim) لـــە رۆمـــانی *دەزووبـــازی* بەرهـــەمی کـــۆرت ڤـــۆنیگات (Vonnegut)دا لە سەر بنچینەی دژواز نوانـدنی پـرژان و کەسـەر...، پێویـست بـوونی درۆ وتـن سـەبارەت بـە راسـتی و نـەگونجانی غـەمناکی درۆ وتـن سەبارەت بەو شتەیە».

یەکێ لـە هـەرە نمـوودە بەگوڕوتینـەکانی دژوازبـوون کـە نـەریتی دوویانـە (دووگانـە) لـە بنەڕەتــەوە رەفـز دەکاتــەوە، بوونــەوەری دوو نێرمـاییـیـە (دوجنسی) و دەیجا نابێ لەوەی کە کەسایەتی زۆرێـک لـە چیرۆکـە پـاش نوێخوازەکان لە باری نێرماییـیەوە، دوولاخوازن، سەرمان سوڕ بمێنێ.

بۆ وێنـە دەتـوانین نـاوی کەسـێتی مـایرار/ مـایرێن برێکینـریج Myrar/myron Brechinridge) لە رۆمانەکانی گۆرڤیداڵ دا (GoreVidal) بێنین کە نێرماییـیـەکـی بگۆڕی هەیە، هەروەها کەسێتی سـەرەکی لـە رۆمـانی *لـە گواستنەوەدا* ( In Transit) بەرهەمی بریجید بـرۆفی (Brigid Brophy) کـە لـە فرۆکـەخانـەیـەکـی نێونەتەوەییدا ئێخسیری فەرامۆشی دەبێ و نێرمایيەتی خۆی لە یاد نامێنێ.

( ئاخێوەر ناتوانێ لە ئامادەبوونی جەماوەردا تەماشای ئالەتی نێرمایەتی خـۆی بکات، تەنانەت کاتێکیش کە مەبالێکی گشتی وەگیر دەخات، نازانـێ بـۆ چ مەبەستێک هاتۆتە ئەو شوێنە.)

هێنری ( Henry ) کەسێتی سەرەکی و نیوەپۆست مۆدێرنەی رۆمـانی *وڵـاتی نەدۆزراوەوە* بەرهەمی جوولیەن مـەیچڵ (Julian Mitchell) وێـڕای گـۆڕینی نێرمایەتی خۆی لە سەرەتادا دەبێتە ژن و لە پاشان دەبێتە دوونێرمایی ( نە نێر، نە مێ) کە بە شوێن بوونەوەرێکی جوان بە نێرمايیەتێکی نامەعلوومەوەیە.

لە تەشقی رۆمانی *سەمبۆلیستی* ( Giles Goat Boy ) بەرهەمی جان بارتدا کە داهێنانی کەلامی و زبانی زۆری تێدایە، ئاناستازیا (Anasasia) و پاڵەوانی بزن ئاسای ئەویندارى ئەو لەو کاتەدا سەرقاڵی «نێزیکین»، وڵامی ئەم پرسیارەی کەمپیۆتەرێک بە ناوی وێسکاک ( WESCAC ) کە لێیان دەپرسێ: ( نێرن یا مێ ) بە چەشنێکی هاوکات و دژواز وەڵام ئەدەنەوە: (بەڵێ، نەخێر )، بەم چەشنە گیانیان لە دەست ( سین ـ جیم ) و لێپرسینەوەی کەمپیۆتەرەکە رزگار دەکەن.

## ٢ ـ جێ گۆڕکێ ( جابە جایی )

هەردوو شێوازی نقیساری خوازەیی و مەجازی هەوجێیان بە هەڵبژاردنە و لە هەر هەڵبژاردنێکدا دەبێ پێملی لێبووردن لە برێ شت بین. نووسەرانی پاش نوێ خواز زۆر کات تێدەکۆشن لە ئاوێتە کردنی چەند جێگرێکی جۆرانجۆری گێڕانەوە لە چیرۆکێکی یەکەدا، ئەو یاسا و رێسایەی سەرەوە بشکێنن و وەلای نێن. ئەم کردەیە وەکی چەشنێک پارادۆکس ( دژوازی ) وایە. باوەکوو لە کردەدا وێڕای پۆلێن و دەرەجەبەندی کردنی جێگرەکان بە پێی ئاستی راست و درووست بوونیان، ئەم دژوازبوونە چارەسەر بکردرێ. رێگا و شێوازێکی سەرەکی تر بۆخۆ پاراستن لە هەڵبژاردن، دەکار کردنی تەواوەتی ئاوێتە و رێکەوەندەکانە لە بەستێنێکی تایبەتدا.

لە جیهانی خەیاڵات کردنی یەکێک لە حیکایەتە ئاکارییەکانی بۆرخێسدا (Jorge Luis Borges) کە زۆربەی پۆست مۆدێرنە ئامریکاییەکانی ئەویندارى خۆی کردووە «بەرهەمە ئەدەبە چیرۆکییەکان گەڵاڵەیەکی یەکەیان هەیە، وێڕای چەندان جێ گۆڕکێی شیاوی بۆچوون و رووداوەکانی ئەو گەڵاڵەیە.» گەڵاڵەی دژوازی رۆمانی تسۆیی پێن

(Tsui Pen) لە چیرۆکی بۆرخێس‌دا بە نێوی *باغی دووڕێیانەکان* کـەم و زۆر لە سەر بنچینە و بناغەی ئەم یاسا و ڕێسایەیە:

«لە هەموو چیرۆکەکاندا لە دۆخێکدا کەسێک لە گەڵ چەند جێگردا هەمبەر بێتەوە، یەکیان هەڵدەبژێرێ و لە وانی دیکە چاوپۆشی دەکات. تـسۆیی پـێن لە چیرۆکەکاندا تەواوی ئەو جێگرانـە پێکـەوە هەڵـدەبژێرێ. ئـەو بـەم کـارە ڕووداوی جۆراوجـۆر و جیـاواز لـە داهـاتوودا و لـە زمانـە جیاوازەکانـدا دەخوڵـقێنێ کـە هـەر کامیـان جیاجیـا بـەرین و بـەرفراوان دەبنـەوە و... بـەم چەشنە هۆکاری دژوازییەکانی ڕۆمان خۆیا دەبێ. وای دانێن فـەنگ (Fang) نەهێنییـەکی حەشـار داوە، غەریبەیـەک دێ بـۆ لای و فـەنگ بـڕیار دەدا بیکوژێ. بە چەشنی سروشتی بۆی هەیە چەنـد ڕووداوێـک بقـەومێ: فـەنگ دەتوانێ ئەو سەرەخەرە بکوژێ، کابرای سەرەخەر دەتوانێ فەنـگ بکـوژێ، بەڵکوو هەردووکیان بە کوشت بچن، بەڵکوو هەردووکیان هەڵێن و....

لە شوێنەوارەکانی تسۆیی پـێن دا تـەواوی ئـەم گریمانـەیانـە دەقـەومـێن؛ بـە چەشنێک کە هەر ڕووداوێک خاڵی دەسپێکی چەند ڕووداوی دیکەیە.

بۆرخێس (مەحاڵ و لامەحـاڵ)ـەکـان بـە چـەشـنێکی پاسـاوەبـوو وێنـا دەکات و بەم کارە خەیاڵات لە کۆت و بەند رزگار دەکات. بیکێت کـەمتر لە جێ گۆڕکێ کەڵک وەردەگرێ، بـەڵـام دەتوانـێ کاریگـەرییـەکـی غـەم هێنەرتر بە سەر خوێنەردا دابنێ، وەکوو ئەم بەشەی چیرۆکی *وات*:

«بەڵام سەبارەت بە قاچەکانی، کاتی وابوو هەرکام لنگـە گـۆرەوەیـەکی مـل قوڵی تێ دەکردن، جاری وابوو گۆرەوی مل قوڵی لە پایـەک و گـۆرەوەی مل بڵندی لە لاقەکەی دیکە دەکرد یـا چـەکمـەی مـل قـوڵ، یـا کـەوش یـا دەمپایی، یا گۆرەوی مل بڵند و چەکمەی مل قوڵ، یا گۆرەوەی مـل بـڵند و کەوش، یا گۆرەوەی بڵند و دەمپایە یا هەر هیچ. بڕێجاریش لە هـەر لاقێـگ

و گۆرەوەیەگی مل بڵند، یا لە لاقێک گۆرەوە و لە لاقەکەی دیکەی چەکمەی قوڵە، یا کەوش یا دەمپایە، یا گۆرەوی قوڵە و چەکمەی قوڵە، یا گۆرەوی قوڵە و کەوش و...یا... یا... ».

بیکێت لاپەڕە و نیوێکی دیکەش هەر بەم چەشنە لە سەری دەڕوا. زۆر بەشی دیکەی وەکوو ئەمە لە ڕۆمانی « وات دا هەیە کە لەوێشدا نووسەر هەموو ڕێکەوەندە مومکینەکانی لە کۆیەکی جیاواز و بگۆڕدا نێوبرد کردووە. بەڵام ڕەنگە عالی ترین نموونەی جێ گۆڕکێ لە شوێنەوارەکانی بیکێتدا ڕۆمانی *مێلۆی* بێ. کەسایەتی سەرەکی چیرۆک (کە ناویشی سەردێڕی ئەم ڕۆمانەیە) لە خۆیدا جینگڵ دەدا تاکوو شانزە زیخ بە چەشنێک لە گیرفانەکانیدا بەش بەش بکات هەتا هەموو کەڕەتێ بتوانێ ئەوان بە یاسا و ڕێسایەک و بە دوای یەکدا بمژێ. کەسێتییەکانی بیکێت بە شوێن ئەوەوەن کە بە هۆکاری نەبوونی هەر چەشنە نەریتێکی ئاسمانییەوە، ئەزموونەکانی ژیان لە نەریتێکی ماتماتیک ئاسادا دامەزرێنن. پاڵەوانی ڕۆمانی *مۆرفی* لە یەکێ لە دیمەنەکانی ڕۆماندا لەو کاتەدا کە سەرقاڵی جێ بەجێ کردنی نیوەڕۆژەیەک بە قوڕابییە چەند قاوغ و قەوارەکانە، لە نێوان نەتوانینی هەڵبژاردنی چەشنێکی تایبەتی قوڕابی و زەنجەفیلی دا ئەگەری گۆڕینەوەی هەموو قوڕابیەکان دوو دڵ دەمێنێتەوە.

«بێت و بیویستایە یەکەم هەنگاو بنێتە پێشێ و بە سەر تامەزرۆیی زۆری خۆی سەبارەت بە قوڕابی زەنجەفیلی دا زاڵ بێ، لەو کاتەدا کۆی قوڕابییەکان لە بەرامبەر چاوەکانیدا قوت دەبوونەوە و ئەگەری زێڕینەی گۆڕینەوەی هەمووی ئەوانی بە ڕەزامەندییەوە وەدەردەخست. دەکرا بە سەد و بیست جۆر بیانخوات.»

کاتێک بگۆڕەکان ( مُتغَيّرها ) هەتا دوو بابەت کەم بکەن جێ گۆڕکێ دەبێتە خواردنی ئەم جارە و ئەو جارە، ئەوی دیکە هیوابڕدراو بوونی بارودۆخی مرۆڤ وەدەردەخەن. وایلی یەکێ لە کەسێتییەکانی ڕۆمانی *مۆرفی* بڕوای وایە: «هەرکاتێ ئێش و ژانێک سوکنا دەگرێ، ئێش و ژانێکی دیکە دژوار دەبێ.» »مرۆڤایەتی چاڵاوێکە بە دوو سەتڵەوە... یەکیان دەڕواتە خوارێ تا پڕ بێت و ئەوی دیکە دێتە سەرێ تا بەتاڵ کرێ.»

لە ڕۆمانی *خاڵی بیست و دوو* بەرهەمی جۆزێف هیلێردا (**Joseph Heller** ) باسی سەربازێکی زامدار لە نەخۆشخانەیەکدا دەکرێ کە تەواوی لەشی پەڕۆپێچ کراوە و سیڕۆمێک و کیسەیەکی هەڵمیزتنی پێوە وەسڵە: «هەرکاتێ لە سەر عەرزی (کیسە میز) پڕ دەبوو، ئەو کیسە سیڕۆمەی بە ئانیشکیەوە بوو، بەتاڵ دەبوو، لەوکاتەدا جێ گۆڕکەیان بەم دوو کیسەیە دەکرد، تا ئەو شتە تک تک و دڵۆپ دڵۆپ بگەڕێتەوە ناو لەشی»

## ٣ ـ نەبوونی یەکگرتوویی ( عدم انسجام )

یەکگرتوویی تایبەتمەندییەکە کە لە هەر نووسراوەیەک چاوەڕوان دەکرێ. دەتوانین نووسینەوە بە ئاخافتنێکی یەک لایەنە دابنێین، خوێندکار و ڕەخنە گران دەزانن کە لایەنی هەرە دژواری نووسینی هەموو کتێب و وتار و پەڕتووک و تێزی خوێندکاران ڕاستەوپاستە کردن و نەریتدانان بۆ هزر و ئەندێشە بڵاو و جۆراجۆرەکانە بە چەشنێک کە تێپەڕبوون لە بابەتێکەوە بۆ بابەتێکی دیکە دەبێ حەتمی و لۆژیکی و بە بێ پسانەوە بێت و لە عەینی حاڵدا هیچ خاڵێکی گرینگ نە گۆڕدرێ یا نەقرتێ.

ئەم کتێبەی بە دەستانەوەیە، دەستەواژە و ڕستەی بێ ئەژماری لە خۆی گرتووە کە لە یەکەم قۆناغدا مەبەست لە گونجاندنی ئەوان نەک گواستنەوەی زانیاری و ئاگاداری، بەڵکوو پێکهێنانی پێوەندییەکی ڕەوان لە

نێوان بابەتە جیاوازەکانی ناو کتێبەکەدایە. نووسراوەی مەجازی لە ئەدەبی چیرۆکدا خاوەن چەشنێک یەکگرتوویی زۆر ئاشکرایە لە سەر نێزیکایەتی کات و شوێن، کە فامست و حاڵیبوون لە دەق زۆر ئاسان دەکاتەوە، لە حاڵێکدا فامستی یەکگرتوویی نقیساری خوازەیی ئەوەندە سانا نیە. بەڵام بە هەر لەونێک بێ، دەتوانین سەرەندەری بکەین. راست وەک یەکگرتوویی ئەو بابەتانەی لە دەقێکی بابەتخوازانەدا باسیان لە سەر کراوە، خوێنەر سەبارەت بە راست و دروست بوونی ئەو بیر و بڕوایە رازی دەکات و پەرە بەم گریمانەیە دەدات کە بێج لەم نەریتە، هیچ نەریتێکی دیکە ناتوانێ لە باری هزرەوە ئەمەندە و تا ئەم رادەیە رازی کەرەوە بێ، چیرۆکیش هەر بەم نەریتە ـ بێت و چیرۆکێکی سەرکەوتوو بێ ـ گۆشە نیگایەکی تایبەت بە هۆکاری بایەخی یەکگرتوویی خۆیەوە سەبارەت بە جیهانی هەستی دەدا بە خوێنەر و جیهانێکی خەیاڵی دەکاتە جێگری «جیهانی راستی» ـ بە تایبەت بێت و چیرۆک ریئالیستی بێ ـ خوێنەر لە رێی خەیاڵاتەوە لەم جیهانە خوڵقاوەدا دەژی. پۆست مۆدێرنە سەبارەت بە یەکگرتوویی بەدگومانە. بیکێت بە گۆڕانکاری کت و پڕ و چاوەنوارِ نەکراو لە راوێژی ئاخێوەردا، ئاخافتنی پەرچیرۆکی (فرا داستانی) سەبارەت بە خوێنەر، بە سپێتی هێشتنەوەی بەشێکی دەق، پارادۆکس (دژوازی ) و جێ گۆڕکێ، بە ئانقەستە یەکگرتوویی وتەی خۆی دەشێوێنێ. تاقمێ لە نووسەرانی ئەم دواییانەی ئامریکایی لەمەش بەولاوەتر رۆیشتوون و چیرۆکەکانیان لە سەر بنچینەی نەبوونی یە کگرتوویی نووسیوە. لە رۆمانی **٩٨/٦** بەرهەمی رۆناڵد سوکنیکدا (**Ronald Sukenick**) دەنگی نووسەر قیرسیچمانە دەڵێ: «دابڕان، نەبوونی یەک گرتوویی، کەم و کوڕی، پاڕادۆکس، چارەسەرێک نیە.»

نیشانەی هەرە ئاشکرا و بەرچاوی نەبوونی یەک گرتوویی لە چۆنیەتی نووسینی ئەدەبی چیرۆکی سەردەمدا ـ (تامەزرۆییەکی رۆژ لە رۆژ زیاتر بۆ نووسینی چیرۆک لە چەندان بەشی زۆر کورتدایە) ــ ئەم چەشنە چیرۆکە دەتوانین لە رۆمانی **٩٨/٦** دا بدینین. درێژی هەر بەشێکی ئەم رۆمانە ئەغڵەب لە کۆپلە و دەستەواژەیەک زیاتر نیە و نێوەرۆکی هەرکام لەم بەشانە لە گەڵ بەشەکانی دیکەدا جیاوازی هەیە. جاروبار بۆ مەبەستی تەئکید کردنی زۆرتر لە سەر نەبوونی یەکگرتوویی لە نێوان بەشە جیاوازە کاندا، لە سەرەتای هەر بەشێکدا نووسەر ژمارەیەک یا سەردێرێک بە پیتی درشت دەنووسێ، یان پەنا دەباتە بەر تەکنیکەکانی چاپی نێونجی و مام ناوەندی. رۆمانەکانی زۆر ئەم دواییانەی کۆرت ڤۆنێگات و تەواوی رۆمانەکانی براتیگان چوارچێوە و گەڵالەیەکی ئاوایان هەیە. بە وتەیەکی دیکە بەشەکانیان ئەوەندە کورتە کە ناتوانین وەک واتای باو پێیان بڵێین بەش (فصل). دۆناڵد بار تێلمی بۆ مەبەستی نەبوونی یەکگرتوویی لە نێوان بەشەکانی دەقی رۆمانی *ژیان لە شاردا* لە برێ لە بەشەکاندا لە وێنەی سەیر و سەمەرە کەڵک وەردەگرێ و رایمۆند فێدرمەن (**Raymond Federman** ) لاپەڕە رازاندنەوەی رۆمانی (هیچ)ی بە کەڵک وەرگرتن لە تەکنیکەکانی شیعری کۆنکرێت (**Concrete Poetry** )، ــ چەشنێک شیعری مۆدێڕن کە لە دەیەکانی ١٩٥٠ و ٦٠دا لایانگرانی زۆری بوو، وێنەی رواڵەتی ئەم شیعرانە، باسی لە سەر هەر شتێک کردبایە، وێنەکەشی دەنواند و بەم هۆکارەوە بە خاوەن بەشێک لە تایبەتمەندییەکانی شێوەکاریش دەناسرێ ـ داهێنەرانە دەگۆڕێ تا بە هۆکاری دەکارهێنانی ئەو شتەدا کە لە گێڕانەوەی ژێرەوەدا وەسف کراوە، وەبەر نەفرەت نەکەوێ:

وێنەیەکی زۆر روک و راستی گێڕانەوە        بە بێ ئەوەی هۆش و هەستەکانمان بشێوێنن

به بێ هیچ لەمپەرێک هەر چەشنێکی ساف و سادە
ئاسایی، به یاسا و رێسا
شیاوی خوێندنەوە
ریالیزمی
له راستەوه بۆ چەپ
له شاراوەیی و تەم و مژ بەتاڵ
جیاواز ـ خاڵدانانی باش
شیاوی فامست هیلاک کەرەوە
به بێ مەترسی، خاوەن دەستە واژە
مەحشەر ـ به تام و چێژ ـ به کەڵک
خاوەن نێوەرۆک ـ سانا
پەخشان پەخشان
له پەخشانەوە پەخشان پەخشان
پەخشان ـ سانا
پەخشان

لەم دواییانەدا لیئۆنارد مایکڵز ( **Leonard Michels**) چەشنێک ئەدەبی تەقریبەن نوێی داهێناوە:

کۆیەک ( نەک زنجیرەیەک ) له کورتە پاژەکان (چیرۆک، حیکایەت، تێفکرین، کورتە وتە، پەخشانە شیعر، قسەی خۆش و نوکتە) کە هەر کامیان سەر دێڕێکی جیاوازیان بە پیتی گەورە هەیە. خوێنەر سەری سوور ماوە، بەڵام شادمانە و له نێو ئەم گشتە پاژە بە رواڵەت نایەکگرتووەدا راست وەکوو تۆپێکی کە بۆ ئەم لاوئەولا حەوا دەدرێ، سەرگەردان دەمێنێتەوە؛ تیشک و ترووسکێک لە زەینیدا دەکەونە ترووسکە ترووسک و خێرا بزر دەبنەوە؛ بەرە بەرە ئاگەداری و زانیاری زیاتر دەبێ؛ هەتا نووسەر بە کورتی

پێدەڵێ: «دۆڕاندت». یەکێک لەم کۆبابەتانە لە ژێر سەردێڕی ( بێت و بمتوانیبا، نەجاتم دەدان )دا، لە قەوارەیەکی تازەدا سەرقاڵی لێدوان لە سەر بابەتی لەمێژینەی هەستی، مەرگ، زەمان لە سزادانەوەی ئیعدام دا دەبێ، کە مایکلز نێوی دەنێ *چیرۆکی بەندیی مەحکووم کراو*. ئەم کۆ چیرۆکە حەڤدە بەشی هەیە کە بریتین لە: ١ ـ یادەوەری کردن ـ کورتە تەنزێکی توندوتیژ سەبارەت بە ژیانی یەهوودیەکانی ئامریکایی کە بابەتی سەرەکی ئەو لاڕێ بوونی کوڕی بنەماڵەیەکی جوولەکەیە؛ ٢ ـ جوولەکەی بەرگومان ـ بەهرە وەرگرتنێک لە چیرۆکی *مۆجیزەی غەیبیی* بۆرخێس ـ لە سەر ژیانی نووسەرە جووولەکەیەک بە نێوی جارۆمیر هلادیک کە بە حوکمی گەشتاپۆ (چەکداری ئەڵمانیای نازی) لە دار دەدرێ، بەڵام خودا مۆڵەتی دەداتێ هەتا لە مەودای نێوان تەقاندنی گوللەکان و مردنەکەیدا، بتوانێ شاکاری نیوەتەواوی خۆی لە خەیاڵاتیدا بگەیەنێتە کۆتایی؛ ٣ ـ لە کاتی تێداچووندا ـ بیرەوەرییەک سەبارەت بە باوە گەورەی ئاخێوەر ( یا بەڵکوو دایە گەورەی نووسەر ) کە بە هۆکاری رەچەڵەک کوژی پوڵەندییەکانەوە ئاوارە دەبێ؛ ٤ ـ بارودۆخی ماددی ـ وەسفێکی دوژمنانە سەبارەت بە کارێل مارکس (Karel Marx ) کە لە پاش ئەوەی خاوەن ماڵەکەی سووکایەتی پێدەکا، لە کارێل مارکس‌دا دەبێتە توند و تیژی دژ بە مێژوو؛ ٥ ـ کەسپ و پیشە ـ حیکایەتێکی گەپجاڕ سەبارەت بە مامی ئاخێوەر کە خاوەن چەند تەلاری ئارایش کردنە و پارەیەکی زۆری دەست دەکەوێ؛ ٦ ـ هەڵدێرە بە بێ دارودەوەنەکان ـ گێڕانەوەیەک لە شیعری *شی یۆنی* لۆرد بایرۆن، سەبارەت بە بەندییەکە کە ماوەی مەحکوومبوونی خۆی تێدەپەڕێنێ؛ ٧ ـ گۆرانییەکان ـ نوکتەیەکی سێ دێڕییە سەبارەت بە گۆرانییە ناوچەییەکانی رووسیا؛ ٨ ـ غونچەکان ـ سەبارەت بە ئەزموونە سەرسام هێنەرەکانی مامۆی

ئاخێوەر کە لە سەرەتای نیشتە جێ بوونی لە ئەوڕوپادا بە سەری هاتوو؛ ٩ ـ و... هەڵا و زەنای مناڵان ـ سەبارەت بە عیسا مەسیح، هەلادیک، کافکا و دوایین چارەسەر، هێراکلیتووس، هیگێڵ، جاکیمتی، نیچە، ورد زۆڕت، ستیوێنز ـ سەبارەت بە دەزگا فەلسەفییەکان، نامۆ بوون ـ سەبارەت بە مارکسییەت و مەسیحییەت، نامەی لۆرد بایرۆن. ڕوونووسی نامەیەکی ئەم شاعیرەیە کە باسی ئەو شتانە دەکا کە شاعیر لە شانۆی کوشتنی سێ جینایەتکاردا کە بە گیۆتین دەکوژرێن، دیتوویە. چەشنی ژیان ـ ڕەخنەیەک لە سەر نامەی بایرۆن؛ داستایۆڤسکی ـ کورتە باسێک لە سەر بەتاڵ کردنەوەی حوکمی ئیعدامی داستایۆڤسکی؛ ئەو شەوەی بوومە مارکسیست ـ باسی گۆڕینی ئایین کە چەشنی نووسینەکەی، لاسا کردنەوەیەکی گاڵتەجاڕانە لە شێوازی پاولی «پیرۆز»ە؛ کە لە ئاکام هەڵگرتنەوەکەیدا نووسەر دەڵێ: «بە بیروبڕوای تاقمێک [ یانی بە پێی باوەڕی مردووەکان ] ئەم چرت و پرتانە ئیدی هیچ کامیان بایەخێکیان نیە.» لە پاش ئەوەی ئەم کۆمەڵە دەقە جیاوازە چەند کەڕەت بخوێنینەوە، چەشنێک یەک گرتوویی ناوەرۆکییان لێ وەدەردەکەوێ کە کورتەی کەلام هەمان ڕستەیە کە لە پێشتردا لە چیرۆکی *داستایۆڤسکیی* لیئۆنارد مایکلزدا گێڕامەوە: «ناکرێ بە خەیاڵات کردن یان بە بێ خەیاڵات کردن بژین.» ـ خەیاڵات کردن چ لە قاوغی ئەدەبی، ئایینی، فەلسەفیدا، چ لە قەوارەی ڕامیاریدا ـ بڕابڕ مەرگ بۆی نابێتە دیاردەیەکی شیرین یا شیاوی فامست، کەچی لەم دۆخەشدا لە دونیایەکدا کە «بەردەوام لە مەرگی بەردەوامەوە دەخولقێنەوە» چارەسەرێکی دیکە نیە (ئاکام وەرگرتن). هەر کام لە بەشەکانی ئەم کۆمەڵە دەقە لە ڕادەیەکی تایبەتدا ڕەسەنایەتییان هەیە، (وردبوونەوەی ڕاستینەی بایرۆن، لە خەیاڵات کردنی بۆرخێس و بیرۆکە دەربڕینی مارکس لە پێشترە)، بەڵام

ئەم بابەتە لە ئاکامدا جیاوازییەک پێکناهێنێ. وێڕای ئەمەش دەربڕینێکی ئاوا زۆر بە لاڕێ دا بردنە، لە بەر ئەوەی کاریگەری دەق ( وەکوو سەرسووڕمان، نیگەران بوون و دژایەتی ) هەر لە خودی بە ئەزموون دانانی ئەودا، یانی لە سەرە گێژەی دەرئەنجامی گۆڕانکارییە چاوەڕوان نەکراوەکان و بە بێ پێش بینینەکانی چەشنی کەلام لە بەشە جۆراجۆرەکاندا هەستی پێدەکرێ. ئەم گێڕانەوەیەی خوارەوە لە یەکەم دێڕەکانی چیرۆکێکی دیکەی مایکلز بە نێوی *لە دەیەی پەنجادا* دەگێڕینەوە کە ئالۆزکاوییەکی کەمتری هەیە؛ ئەمە وێنەیەکی باشتری نەبوونی یەکگرتوویی لە چەشنی نووسەری ئەودایە:» لە دەیەی پەنجادا شۆفێری فێر بووم، زوو زوو ئاشق دەبووم، سەبارەت بە ئێستا هەڤاڵانێکی زیاترم بوو ئەو کاتەی خۆروشچۆف ستالینی وەبەر پلاری رەخنە دا، هاوڕێکەم خوێنی هەڵمیزت، رەنگ و رووی زەرد بوو و تەقریبەن تەواوی قژە سەری هەڵوەری. لە یانەی باڵای ئێی ـ بی ـ بێرگم دا بەشداریم کرد هەتاکوو سەناتۆر مەکارتی کۆتایی بە کارەکەی دا.وام بیر دەکردەوە لە زانستگای نیۆیۆرکدا ئاژاوە ساز دەبێ، ئای لەو خوێندکارە بەسەزمانانە؛ لە کاریدۆڕەکاندا دەخولانەوە و چاویان لە یەکدی دەبڕی. شەو و رۆژ تێکۆشام و لە مەودای مانگێکدا توانیم رۆمانێکی بێ کەڵکە بنووسم. زۆرکات دەچووم بۆ زانکۆ ( لە زانستگاکانی نیۆیۆرک، میشیگان، بێرکلەی ). لە حەوتوودا چوار ـ پێنج شەو دەچووم بۆ کافەی (نێربازەکان ) لە [ ئان ئاربێر ] و بە سەر و رووخۆشییەوە قسەی خۆشم لە گەڵ دیتراندا دەکرد. رەخنە و لێکۆڵینەوەی ئەدەبیم بە چەشنێک دەخوێندەوە کە دیتران ئاونەبات دەمژن. لە بۆ من پێوەندی تاکەکەسی لە هەر شتێکی دیکە گرینگتر بوو.

جارێکیان لە گەڵ کابرایەکی قەڵەودا لێمان بووە شەڕ، چونکە خۆی دابوو بە سەرمدا و جووڵەی نەدەکرد. لە گەڵ فوتباڵیست و جازژەن و نێرباز و ژنەحەکەدار و گومڕا و لاڕێیەکی زۆردا کە هەموو کارێکی تاوانبارانەیان دەکرد و هەروەها لە گەڵ خوێندکارە جوولەکەیەکی زۆری زانستەکانی پایەی دوکتۆری پێوەندی کەسانەم بوو. لە گەڵ سی و پێنج مەیموونی باکووری هیندوستاندا کە لە تاقیکارییەک سەبارەت بە ڕەمووده بوون (ئیعتیاد)ی مەیموون بە مۆرفیندا کەڵکیان لێ وەردەگرتن، پێوەندی تایبەتیم بوو. دەیانزانی من هەمان کەسم کە گەندوگووی بۆگەنی نێو رکەکان بە شیلەنگ دەشۆمەوە.»

ئەم چیرۆکە (کە زۆریش ناتوانین بە چیرۆکی بزانین، بەڵام وشەیەکی دیکەش بۆ نێوبردکردنی نیە) هەر بەم چەشنە درێژەی دەبێ. رستەی هەواڵ دەری خالیس کە دەڵێی هیچ پێوەندییەکیان بە یەکدییەوە نیە، بێج لەوەی ژیانی گێڕەوەر لە دەیەی پەنجادا دەگێڕنەوە و بە رواڵەت بە بێ هیچ نەریتێکی تایبەت لە کۆی ئەزموونەکانی خۆی هەڵبژێردراون. چەشنێک بابەت و نێوەرۆکی دووپات و چەند پات لەم کۆیەدا بەرچاو دێن کە خۆیاکەرەوەی داماویی رامیاری لە ماوەی دەیەی پەنجا دایە. بەڵام زۆربەی وتەکانی بگێڕەوە پێوەندییەکی بە ئەم بابەتەوە نیە. رەنگە دەقێکی ئاوا زۆر دژوار بێ بتوانێ کاریگەرییەکی دڵخوازی نووسەر بە سەر خوێنەردا دابنێ، بەڵام لە راستیدا دەتوانێ، چونکە پسپۆڕی لە نقیساری ئەم کارەدا دەڵێی بێ ئامانجە و نووسەر ئێمە رازی دەکات کە نەبوونی یەک گرتوویی دەق، عەینی ئەزموونی ئەوە. ئاخێوەر لە جێگایەکی دیکەدا دەڵێ: «جاران پێموابوو کە ئاخرییەکەی رۆژێک لە رۆژان ژیانی ساویلکانەی خۆم لە دەیەی پەنجادا لە دۆخی چیرۆکێکدا دەنووسم» گۆشە نیگایەکی مەبەستی ئەمەیە

کە ئەندام و پاژە دەڵەمەکانی ئەو ژیانەی کە لە هەمبەری ئێمەدا لە سەر یەک کەڵەکە کراوە، بەڵگەیەکی بایەخدارتر لە هەر رۆمانێکی خۆش ساختە.

لە بەرهەمەکانی دۆناڵد بارتێلمیدا، پێوەندی نێوان رستەکان و هەر وەها پێوەندی دەستەواژەکان یاسای بێ پێوەندی و نامەڕبووت نووسین دابینی دەکات. بۆ وێنە لە یەکێک لە چیرۆکەکانی ئەودا ئەمە دەخوێنینەوە: «ئێدوارد ردێنی سووری خۆی لە کێردی چێشت خواردنەکەدا بینی. لە پاشان ئێدوارد و پیاچوون بۆ سوئیزرا، بۆ مەزرا.» جیاوازی گەورەی نێوان رەهەندەکانی ئەم کردانە و نەبوونی هەر چەشنە پێوەندییەکی هۆکاری (پێوەندی عیللەت و مەعلوول)ی لەواندا دەبێتە سۆنگەی ئەوەی کەمتر سەرنج بدەینە پێوەندی زەمانیی ئەمانە. » چاڕلز لە پەنجەرەی ژوورەکەیەوە تەماشای ( هیلدا )ی کرد، لە ژێر دار هەرمێ رەشەکەدا دانیشتبوو و خۆی دەخافڵاند. گازێکی گەورەی لە هەرمێیەکی رەش گرت. تامێکی ناخۆشی بوو، هیلداش بە وردی لە دارەکە مۆڕ بۆوە. چاڕلز دەستی بە گریان کرد. بەرهەمەکانی بێرگسۆنی دەخوێندەوە. لە گریانی خۆی سەری سووڕ ما. لە دۆخێکی سەیردا بڕیاری دا شتێک بخوات.»

گێڕانەوەی وتەی سەرەوە بە «هانە» و دنەیەکەوە دەست پێدەکا کە خاوەن چەشنێک یەکگرتوویی لۆژیکییە، بەڵام وێڕای دژکردەکانی نایەکدەنگی چاڕلز (گریان، خوێندنەوەی بەرهەمەکانی بێرگسۆن، هەستی برسییەتی) کە نە دەگەڵ یەکدیدا پێوەندییان هەیە و نە دەگەڵ هیلدادا، ئەم یەک گرتووییە تێکدەچێ.

یەکێک لە تەکنیکەکانی پەسندی بارتێلمی ئەمەیە کە چەند کەسێتی یا زەینییەت یا ئاخافتنی خاوەن پێوەندی یا یەک بە شوێن یەکدا هەڵدەبژێرێ

و لە پاشان لە ئاوێتە کردنی ئەوان، تێکەڵاوییەکی دەرهەم و بەرهەم لە چەند پارچە وتە کە بە چەشنێکی سەیر و سەمەرە دژایەتییان لە گەڵ یەکتردا هەیە، پێکدێنێ.

کەسێتیەکی بەرهەمەکانی بارتێلمی لە چیرۆکێکدا دەڵێ: «پارچە لەتکێک تەنیا قاوغێکە کە متمانەم پێ‌ئ هەیە.» ئەمەش نموونەیەک لەم پارچە لەتکانەیە لە چیرۆکی *کوڕی هەڵپەڕکێی ئۆپێرای ڤیەن*:

«کارۆلا (**Carola**) لەو کەسانەی کە لە پشت شانە رووت و سپی و جوانەکانی سەرقاڵی قسە کردن بوون، بیستی کە یەکێک لە هەرە سەربەرزییە مایەی شانازییەکانی مێکۆرمێک (**Mecormak**) ئەمەیە کە لە ماوەی چل و یەک ساڵ ژیانی ژن و مێردایەتی لە گەڵ خێزانیدا، هەرگیز پێشینەی نەبووە کە بە بێ ئەو شێو بخوات. بە یادی ناکۆ (**Knocko** ) لە ڕێژەی «ڕۆژی کشانەوە»دا کەوت و بە یادی وتەیەکی نێوداری بۆدلێر. شیاوی مەرگبوون دوایین پێوانەی هەڵسەنگاندن و نرخاندنی شێوازەکانە. مەبەستی گرینگ، حوکمی ماهیچەیەکی بازنەیی ساخ و سەلیمی هەیە، ئەوەندەی جنین ناکاملتر بێت، لە زگداناندا، دەبێ هەڵدڕینی (موهبەل) زیاتر بێ. لیئۆن جەرێف (**Leon Jaroff** ) سەرنووسەری ڕۆژنامەی *تایم* لە شاری دیترۆیتدا وتی: «بەڵێ، لە پاش نیوەڕۆ گەرمەکانی بەهاردا، لە نێو یانەکەمەوە لە قوتابخانەی تامسدا دەمتوانی ئەوبەری دەرگا کراوەکانی کارخانەی «پاکارد» بدینم. دایکی یاسایی و باوکی یاسایی زۆر ئارمانجی، مرۆڤێکی ئاقڵن، بەڵام نەک هەمیشە دەوڵەمەند بن، لە پێوەندی خۆیان ڕازین، مناڵەکانیان خۆش دەوێ و لێیان حاڵین.

نۆهەمین ڕۆژی نۆهەمین مانگ، جەشنی «کیکۆنۆ سککۆنۆ»ی پێدەڵێن و لەو ڕۆژەدا «ساکی» ـ شەڕابی برنج ـ دەخۆن.»

### ٤ ـ نەبوونی یاسا و ڕێسا (فقدان قاعدە)

نەبوونی یەکگرتوویی وتە لە بەرهەمی براتیگان و مایکلز و بارتێلمیدا، نووسراوەکانی ئەوان بە بێ یاسا و ڕێسا دەنوێنێ. بەڵام دروستتر وایە بڵێین ئەم رۆماننووسانە چیرۆکەکانیان بە پێی لۆژیکی (**absurd**) بە واتای (مەعنا دۆڕاوی) دەنووسن. سەبارەت بەوەی زەینی مرۆڤ خاوەن نەریت و ڕێسایە، دەبێ بێ یاسا و ڕێسایی بە مەعنای دروستی وتە بە چەشنی دەستکرد بە سەر دەقی ئەدەبدا دەکار کرێ، بۆ وێنە بە شێوازی (لەت و پەت کردن) کە ویلیەم بارۆز (**William Burrughs** ) کەڵکی لێ وەردەگرێ. بە وتەی بارۆز «لە نووسینی چیرۆک بە چەشنی خۆڕسک (خود جوش)، تاقە ویستی نووسەر بەس نیە. بەڵام بە مەقەستێک دەتوانین هۆکاری خۆڕسکی پێش بینین نەکراو بێنینە کارەکەوە».

بۆ ئەم مەبەستە، نووسەر چەند پاژێک لە دەقە جیاوازەکان (هەروەها لە نووسراوەکانی خۆی) دەبڕێ، لە پاشان ئەوانە بە بێ هیچ ڕێسایەکی تایبەت بە دوای یەکدا ریز دەکات و بەرهەمی کارەکە تەواوەن روونووس دەکاتەوە. شێوازێکی دیکەی وەک ئەمە بۆ دەکارکردنی بێ یاسا و ڕێسایی بە تەواوی راستەقینەی ئەم کارە، چاپی کتێب لە قاوغی «کلاسوور» دایە، تاکوو خوێنەر بتوانێ جێ گۆڕکێ بە لاپەڕەکانی کتێبەکە بکات و بەم چەشنە دەقی دڵخوازی خۆی پێکبێنێ.بۆ وێنە بی ـ ئێس ـ جانسۆن(**B -S- johnson** ) رۆمانی «*چارەنووس شێواوەکان*»ی هەر بەم شێوازە بڵاو کردەوە. بە رای من، ئەم چەشنە داهێنانانە بۆ راکردن و دەربازبوون لە نەریتی خوازە ـ مەجاز، لە هەموو شێوازێکی دیکە کەمتر لە بەر دڵانن، چونکە زۆر زۆر دەستکردن.

## ٥ ـ زێدە ڕۆیین (زیادە روی)

تاقمێ لە ڕۆماننووسانی پۆست مۆدێڕنە لە کەڵک وەرگرتن لە خوازە و مەجازدا بە ئانقەستە زێدەڕۆییان کردووە و بە قەولی مەعرووف (مەشهوور وتەنی) ئەوانیان داچۆڕاندۆتەوە. بە وتەیەکی تر، لە ڕەوتی دەکار کردنی ئەم ئامێرانەدا ئەوانیان بە گەپجاڕ و گاڵتە ئاسا نیشان داوە هەتا بەم چەشنە خۆیان لە کۆت و بەندی خوازە و مەجاز رزگار کردبێ. بۆ وێنە تامس پینچن (**Thomas Pynchon**) لە ڕۆمانی *کۆلکە زێڕینە*دا بابەتێکی بێ کەڵکە و بێبایەخی وەکوو لە یەکچوونی مووشەک و ئالەتی نێرینەی هەڵبژاردووە و داهاتی ئەم کارەی تا کۆتایی ئەم ڕۆمانە زۆر دوور و درێژە، یەک لە پاش یەک، بە چەشنێکی گاڵتەجاڕانە بژاردووە. لە ڕۆمانێکی دیکەدا هەر لە بەرهەمەکانی ئەم نووسەرە بە نێوی (V) خۆیابوونەکانی چەند جارانە و چەند پات بووی (V) بە چەشنی یەکێک لە بابەتەکانی ئەم ڕۆمانە، راڤە کردن دەکاتە گاڵتە و گەپ (گاڵتە بە راڤە کردن دەکات.)

زێدەڕۆیی دۆناڵد بارتێلمی لە کەڵک وەرگرتن لە خوازەدا زیاتر لە چەند بەشێک لە ڕۆمانەکانیدا بەرچاو دەکەوێ (نەک لە هەمووی ئەواندا ). نموونەکەیشی بەراورد کردنگەلێکی لە خۆڕاییە کە لە گێڕانەوەی وتەی خوارەوەدا سەبارەت بە کۆیەک لە بەردەکانی گۆی مانگ دەکاری کردووە:

«بەردەکانی مانگ ئەوەندە باش بوون کە چاوەنواڕ نەکراوانە کەسێک هەڵخەڵەتێنن و ئەم هەڵخەڵەتاندنە، هەم خاوەن واتا بێ و هەم لە باری سۆزەوە رازی کەرەوە بێت. بەردەکانی مانگ وەک ئەو قسە باشانە وا بوون کە دادوەرانی دیوانی عالی لە ژووری بەرگ گۆڕیندا بە یەکدی دەڵێن.

وەک شەڕ باش بوون. بەردەکانی مانگ لە فەرهەنگی ئینگلیزی ڕێندم هاوس (Random House) کە خودی جێفری چووزێر (Geoffry Chaucer) ئیمزای کردبێتن، باشتر بوون. باشتر لەو فیلمە بوون کە لەودا سەرۆک کۆمار بە خەڵکی نالێ بۆ پاراستنی گیانی خۆیان لەو ڕووداوە سەرسام هێنەرەی کە لە زووترین کاتدا دەقەومێ چی بکەن. کەچی دەشزانێ دەبێ چی بکەن و سەبارەت بەم چارەسەرە «حوکمێکی نەهێنی»شی دەربڕیوە. بەردەکانی مانگ باشتر بوون لەو لیوانە قاوە بە تام و چێژەی لە قاوەجۆشێک دایە بە دەست پاشای زۆرداری چیرۆکدا و دەگۆڕدرێتە سەر چیرۆکی *فیلمێل*.»

رۆمانی *راوکردنی ماسی قزل ئالا لە ئامریکادا* بەرهەمی ریچارد براتیگان بە سۆنگەی ئەو چواندنە سەیر و سەمەرانەی کە تێیدایە، شیاوی سەرنجدانە. ئەم چواندنانە لە سەر بنچینەی فامستی نووسەر لە شەباهەتی نێوان ئەو دووشتەی بە یەک چواندراون و زۆر کات وا دەنوێنن کە لە گێڕانەوەی چیرۆکی دوور کەوتوونەتەوە و بوونەتە چەند چیرۆکی چکۆڵە و سەربەخۆ. ئەڵبەت نەک لە قاوغی چواندنی حیماسەتدا، چونکە نووسەر لە کۆتاییدا ئەوانە بە بابەتی سەرەکییەوە نالکێنێ. ئەمەش چەند نموونە لەو چواندنانە:

«خۆر وەکوو سککەیەکی پەنجا سێنتی گەورە وابوو کە کەسێک نەفتی بە سەردا رشتبێ و لە پاشان بە شقارتە ئاگری دابێ و وتوویێتی (وەرە، ئەمە راگرە تا من دەچم رۆژنامە دەکڕم) و سککەیەکی لە دەستی من نابێ و بیرابیڕ نەگەڕابێتەوە.»

لە کۆتاییدا وەرزەکان هەر چەشنی ئەو ئاشپەزە خەوخەوانەی چێشتی حازری ساز دەکەن و هێلکە لە سەر کەباب پەزی نیزیک وێستگەی شەمەندەفەر دەشکێنن، لە ناوە دارینەکانی ئەوان [ یانی لەو ناوانەیان کە لە سەر خاچە دارینەی سەرگۆرەکەیانە ] ئاگاداری دەکات.

لەشم وەکوو ئەو باڵندانەی سەر سیمی تەلەفۆنەکان وابوو کە تا ئەو سەری جیهان درێژ ببۆوە و هەورەکانیش بە کۆ کردنەوە سیمەکانیان دەلەراندەوە.
چاوەکانی وەکوو قەیتانی کەوشی هارپسیکۆرد (چەشنێک ئامێری مۆسیقا) وابوو.
رووناکایی پشت دارەکان وەکوو چوونە ناو فرۆشگایەکی گەورە بەرە بەرەو نائاسایی بوو.
ئەو جۆبارە وە کوو ریزێکی ١٢٨٥٤ ژووری باجەی تەلەفۆن وابوو کە بن میچەکەی (ساپیتکەکەی ) بە شێوازی بیناکانی سەردەمی ڤیکتۆریا بڵند بێ و هەموو دەرگاکانیان دەرهاوردبێتن و پشتەکەیان هەڵکەندبێ.
شەقامەکان وەکوو رووداوێک بە خێراییەکی زۆرەوە لە نێوان گۆڕستان و ماشینێکی پڕ لە گۆنییە ئاردی سپی و ئیشک بوون.

ئەم چواندنانە (شەباهەتانە ) نیشانەی زێدەڕۆیی لە دەکارکردنی خاڵی چواندن (اصل شباهت ) دان و نێوی رۆمانەکە نیشانەی زێدەڕۆیی لە دەکارکردنی خاڵی جێگر دانان و جێ گۆڕکێیە.
بە پێی ئەو شتەی لەم رۆمانەدا هاتووە *راوی قزل ئالا لە ئامریکادا* دەتوانێ کەسێک بێت.
«ئەمە کتێبێکی ئاشپەزی زۆر چکۆلانە بۆ» *راو کردنی ماسی قزڵ ئالا لە ئامریکادا*یە. دەڵێی راو کردنی قزڵ ئالا لە ئامریکا، چێشت ناسێکی ساماندارە و دۆستی کیژی راوکردنی ماسی قزڵ ئالا لە ئامریکا، ماریا کالاسە (**Maria Callas**)، دەڵێی پێکەوە لە پشت مێزی چێشت خواردن کە لە بەردی مەڕمەڕە دانیشتوون و لە بەر شۆقی مۆمە جوانەکاندا سەرقاڵی خواردنن.»

یا ئەم کتێبە دەتوانێ لاشە و تەرمێک بێ: «ئەمە هەڵدڕینی تەرمی راو کردنی ماسی قزڵ ئالا لە ئامریکادایە. وەک بڵێی *راو کردنی ماسی قزڵ ئالا لە ئامریکا*دا لۆرد بایرۆن بوو و لە میسۆلۆنگی یۆناندا مرد و ئیدی ببڕابڕ لێوارەکانی ئایداهۆ (ئیالەتێکی ئامریکا)ی نەبینیوەتەوە.

یا دەتوانێ ئۆتێلێک بێت: «لە پاش چوار رێ یانی «بڕادوەی» و «کولۆمب» بێتوو نیوەی درێژایی شەقامەکە تێپەڕ کەن، دەگەنە ئۆتێلی راوکردنی ماسی قزڵ ئالا لە ئامریکادا، کە ئۆتێلێکی هەرزان بابیە. ئۆتێلێکی زۆر قەدیمییە کە چەند کەسی خەڵکی چین دەیگێڕن.

نامە دەنووسرێ بۆ *راو کردنی ماسی قزڵ ئالا لە ئامریکادا*، ئەویش وەڵامی ئەو نامانە هەر بە ئیمزای *راو کردنی ماسی قزڵ ئالا لە ئامریکا* دەداتەوە، کە وا بوو دەتوانێ ئاوەڵناوێک بێ:

«دوایین ئاماژە بۆ کورتەڵەی» *راو کردنی ماسی قزڵ ئالا لە ئامریکادا* شاهیدێ دەنگدراو لە لایان ئاشت بوونەی *راو کردنی ماسی قزڵ ئالا لە ئامریکادا*»

*راو کردنی ماسی قزڵ ئالا لە ئامریکادا* دەتوانێ نووکی پێنووس بێ:

لە گەڵ خۆما فیکرم کردەوە کێشانەوەی چەند درەخت بە رەنگی شینی کاڵەوە لە درێژایی لێواری رووبارێکدا، گوڵی خۆڕسک و چەند باڵەیەکی لێڵ بە سەر کاغەزێکدا، چ نووکە پێنووسێکی باش لە *راو کردنی ماسی قزڵ ئالا لە ئامریکادا* ساز دەکات.

بە کورتی *راو کردنی ماسی قزڵ ئالا لە ئامریکادا* دەتوانێ هەر شتێک بێ کە براتیگان دەیهەوێ. یەکێک لە هەمبەرەکانی ئەم چەشنە زێدەڕۆییە لە جێگر دانانی لە سەر تەوەری ئاوێتە کردنی توخمەکانی زبان، جێ گۆڕکێی چەند بگۆڕێکە کە تا هەنووکە باسیان لە سەر کراوە. بەڵام داسەپاندنی لە

ڕادەبەدەری زەق بوونەوە لە وتەدا، کاریگەرییەکی بێ کەڵکەی دەبێ (وێڕای هێنانەوەی بارستاییەکی وا لە پاژەکان کە خوێنەر نەتوانێ لە گشتێکدا تێکەڵاو و ڕێکەوەندیکیان بکات، وتە، خۆڕاگرتنی جیهانی هەستی لە هەمبەری ڕاڤە کردندا دەسەلمێنێ.)

لە ڕۆمانەکانی ئالێن ڕۆب گرییدا وەسف کردنی لە ڕادە بەدەری شتەکان کە بە چەشنێکی پسپۆڕانە وردن و بە بێ هەر خوازەیەکن، لە کردەدا دەبنە هۆی ئەوەی خوێنەر نەتوانێ بیانهێنێتە بەرچاو.

ماوەیەکی دوور لەمەوبەر، تاقمێ لە ڕیالیستەکانی کۆتایی سەدەی نۆزدە سەلماندبوویان کە نقیساریی مەجازی چارەناچار ڕەوت و داهاتێکی ئاوای هەیە. یاکووبسێن بۆ سەلماندنی ئەم بابەتە گلێب ئیڤانۆڤیچ ئووسپێنسکی (**Gleb Ivanovic Upenskij**) ڕۆماننووسی ڕووسیایی بۆ وێنە نێو دەبات و ئەم وتەیەی کامێگۆلۆڤ (**Kamegulov** ) دەگێڕێتەوە کە سازاندنی کەسایەتی لە ڕۆمانەکانی ئووسپێنسکیدا بە چەشنێکە کە «وێنەر لە پاژەکانی پارچە پەخشانێکی کورتدا نقووم دەبێ و بە ڕاستی واتای گشتی بۆ دەرناکەوێ و لە ئاکامدا، ئەغڵەب وەسفەکانی نووسەر بە شێواو و ئاڵۆزکاو دەردەچێ.» وەسفی نێوداری کڵاوی قوتابخانەی چارلز بوواری لە بەشی یەکی ڕۆمانی *خاتوو بووورای*دا نموونەیەکی دیوناسترە لەو شتەی کە «زیدەڕۆیی لە دەکارکردنی مەجازی»دا دەتوانین پێ بڵێین. ئالێن ڕۆب گریی نەک هەر خوێنەری ڕۆمانەکانی نقوومی ئەو پاژە زۆرانە دەکات کە یان هەوجێ یان پێی نیە یا توانای فامستی ئەو شتەیان نیە، بەڵکوو وای بۆ دەچم بە ئانقەستە ئەو پاژانە بە چەشنێکی نایەکگرتوو پێشکەش دەکات. بۆ وێنە ئەم وەسفەی بەندەرگایەک کە ماتیاس لە بەشی یەکەمی ڕۆمانی *چاو*حیزدا لێی نیزیک دەبێتەوە، لە بەرچاو بگرن: «لەنگەرگاکە ئێستا زۆر لە نیزیک دەچوو، چەند

یاردێک بڵندتر لە عەرشەی پاپۆڕەکە قوت ببۆوە، حەتمەن مەد (هەڵـچوونی ئاوی زەریـا) بـوو. لـەو ڕێگـە باریکـەوە کـە بـۆ ئـەوەی سـواری پـاپۆڕ بـبن کەڵکیان لێ وەردەگرت، دەکرا سەرعەرزی ڕێک و پێکی بەشی خوارووی لەنگەرگاکە بدینرێ، سێبەری ڕەشی ئاوەکە بە سەریدا کەوتبوو قەوزەیەکـی مەیلە و شین تەقریبەن داپۆشیبوو. کاتێ نزیک بوونەوە، لێواری لەنگەرگاکە کەموزۆر بە چـەشـنێک کـە هـەسـتی پـێ نـەکـرێ بـەرەو پێـشەوە کـشابوو. سەرەوەی لەنگەرگـا، لـە درێـژەی بـەشـی ژووروری لێـوارەیـەکـی بـەردینـە (قەراغێکی خوار و باریک کە لە دوو تەختی ئـە سـتوونی پێکهـاتبوو و ئـەم دووانـەش یـەکـدییان دادەبـڕی: دیـوارەیـەکـی ئـەسـتوونی ڕاسـت بـە سـەر لەنگەرگادا لە گەڵ پلیکانێکی کە بەرەو سەرەوەی لەنگـەرگـا هـەڵـدەکـشا) هێڵێکی ئاسۆیی تێدابوو کە ڕاستەوخۆ بەرەو لەنگەرگا دەڕۆیی.
لەنگەرگا لەم سووچەوە لەوەی کە لە ڕاستیدا بوو، درێژتری دەنواند. لە هـەر دووک بەری ئـەم هێـڵەوە پایـەیـەک لـە قـاوغی کۆیـەک لـە چـەنـد هێـڵی هاوتەریبدا درێژ دەبۆوە و ئەم هێڵانە بە ڕووناکاییەکەوە کە ڕوونـاکی بـەیـان بە چەشنێکی ئاشکرا زیاتری کردبوو، ریزێکیـان لـەو لاپـەڕە ڕەسـم کراوانـە دەکێشاوە کە یـەک لـە نێـوان یـەکـدا ئاسـۆیی و ئـەسـتوونی بـوون: سـەری لەمپەرێکی گەورە کە بەندەرگای لە بەرامبـەر شـەپۆلـەکـانی پانـایی زەریـادا دەپاراست، لایەنی ناوەکی ئەم لەمپەرە، شەپـۆل شـکێن لـە درێژایـی بـەشـی سەرەوەی لەنگەرگادا، دیوارەیەکی ئەستوونیش کە ڕاستەوخۆ دەڕۆیشتە نـاو ئاوەکانی بەندەرگاوە. دوو پەڕەی ئەستوونی لە تاریکی ڕۆچوون بوون، دوو پەڕەی دیکە لە بەر تیشکی خۆردا دەدرەوشانەوە ـ تەواوی پانـایی لـەمپـەر و تەواوی شەپۆل شکێن، بێج لە باریکەیەکی تاریک: سێبەری لەمپـەر، بـە پێـی یاسا و سروشت دەبایە ڕەسمی ئەم کۆیە لە ئاوەکانی بەندەرگادا بـە دیـارەوە

بێ و هەروەها بە سەر تەختی ئاوەکەشەوە. لە هەمان کردەی هەمبەری هێڵە هاوتەریبەکان، سێبەری دیوارەی ئەستوونی کە یەکڕاست بەرەو لەنگەرگا درێژ ببۆوە.»

ئەو وەرگێڕەی کە ئەم رۆمانەی لە زبانی فەڕەنسی یەوە وەرگێڕابووە سەر زبانی ئینگلیزی، بە جێگر کردنی «دوورتر» لە جیاتی «درێژتر»، هەروەها کەڵک وەرگرتن لە سێ وشەی «لەنگەرگا» و «شەپۆل شکێن» و «جێگەی بارخستن» لە بری چوار وشەی نێو دەقی سەرەکی رۆمانەکە، نەیتوانیوە حاڵیبوون لەم رووانگەیە ئاسان کاتەوە. وەرگێڕ تەنانەت ئەو وشە جێگرانەش کە دایناون، بە چەشنێکی یەکدەست کەڵکی لێ وەرنەگرتوون و لە ئاکامدا لە بری «شەپۆل شکێن» برێ جار، لەنگەرگا، جاروبار شوێنی بارخستن و... داناوە. وێڕای گشت ئەمانەش حەق بە لای وەرگێڕەوەیە. ئەمە ئاشکرایە کە وەرگێڕ دەبایە لە سەرەتادا خەریتە یا گەڵاڵەی بەندەرگای رەسم کردایە و لە پاشان دەقەکەی وەرگێڕایەتەوە. منیش لە سەرەتادا داوام لە خوێندکارەکانم و پاشان لە برێک لە هاوکارانم لە گرووپی ئەدەبی فەڕەنسی زانستگادا کرد، گەڵاڵەیەکی ئەو بەندەرگایەی وەسف کرا، بۆمی رەسم کەن. بەڵام هیچکامیان دەروەستی ئەم کارە نەهاتن. دەسا دەردەکەوێ کە ئەم وەسفە، ئەو یەکگرتوویییەی نیە کە گشتێکی شیاوی رەسم کردن دەبێ هەیبێ. ئاخافتنی سەبارەت بە زێدەڕۆیی کەڵک وەرگرتن لە مەجاز، دەتوانین وێڕای ئاماژە بۆ یەکێک لە چیرۆکەکانی خۆرخە لوویس بۆرخێس بە ناوی *فیۆنێسی بیر تیژ* کۆتایی پێ بدەین. نووسەر لەم چیرۆکەدا وەسفی کابرایەک بە نێوی فیۆنێس دەکات کە لە پاش رووداوێکی داچڵەکێنەر، دەتوانێ سەرەندەری تەواوەتی ئەو شتانە بکات کە لە دەوروبەری ئەودا دەقەومێن و ئیدی ناتوانێ هیچ شتێک فەرامۆش بکات: «ئێمە مرۆڤە ئاساییەکان دەتوانین

به روانینێک هەست بە هەبوونی سێ شەربە لە سەر مێزەکە بکەین. بەڵام فیۆنێس تەواوی گەڵاکان و لاولاوەکان و میوەکانی دارێکی لە بەرچاو بوو. ئەو هەر لە بەر دەیزانی هەورەکانی باشوور لە بەرە بەیانی سیی ئاپریلی ١٨٨٢دا چ قاوغێکیان بوو، دەشی توانی لە بیرگەی خۆیدا ئەو هەورانە لە گەڵ هێڵە رەنگاورەنگەکانی سەربەرگی کتێبێک بە رووبەرگی ئیسپانیۆلییەوە کە تاقە جارێک دیتبووی بەراورد بکات، یا دەگەڵ ئەو هێڵانەی دەوری ئەو کەفەی کە بە سۆنگەی هام و شۆی بێلی گەمییەکەوە کە بە سەر رووباری «ریۆنیگرۆ»دا شەوی پێش لە شۆڕشی «کێبراچو»دا پێکهاتووە)

فیۆنێس لە جیهانێکدا دەژی کە هەموو شتێ لەوێدا بە چەشنێکی وزەکوژ زەق و جیاوازە. تەواوی کات و توانای ئەو لە پێناوی کاری بێ کەڵکە و وزەکوژی پۆلێن کردنی پاژبەپاژی ئەو شتانەدا دەفەوتێ کە دۆزیویەتەوە، بە بێ ئەوەی زەڕڕەیەک لەو دۆزراوەیانە لە قەڵەم بخات یا گشت بیژی بکات:

«فیۆنێس بینەرێکی تەنیا و دوورە پەرێز و فرەزانی جیهانێکی رەنگاورەنگ و جۆرانجۆر بوو کە هەموو شتێکی بە بێدرەنگ و تەقریبەن بە چەشنێکی وزە پڕووکێن، ورد و حیساب بۆکراو بوو... وێڕای گشت ئەمانە، پێمابێ توانایەکی زۆری بۆتێفکرین نەبوو. تێفکرین یانی فەرامۆش کردنی لایەنەکانی جیاوازی دوو شت، یانی پەرەپێدان و بەگشت کردن، رووت کردنەوە و جیاوازی دانان. لە جیهانی لە رادەبەدەر بێ کەم و کووڕی فیۆنێسدا، هیچ شتێک هەبوونی نەبوو بێجگە لە پاژەکان، بەڵکوو بتوانین بڵێین پاژگەلێکی هاوسێ.»

## ٦ ـ کورته پێوەندی (اتصال کوتاه )

بێتوو جیاوازی نێوان خوازە و مەجاز بە مەعنای هەرە فرەلایەنی خۆی دەکار بکەین، لەو دۆخەدا خودی ئەدەب سروشتێکی خوازەیی و غەیری ئەدەب سروشتێکی مەجازی هەیە. دەقی ئەدەبی هەمیشە خوازەیە بەو واتایەی کە کاتێ دەقێکی ئاوا راڤە دەکەین، لە راستیدا ئەو دەقە لە حوکمی خوازەیەکی تەواو عەیاردا بۆ جیهانی هەستی دەکار دەکەین. پێش گریمانەی ئەم رەوتی شرۆڤەیە ئەوەیە کە لە نێوان دەقی ئەدەبی و جیهانی راستیدا ـ یا بە وتەیەکی دیکە، لە نێوان هونەر و راستی ژیاندا ـ مەودایەک هەیە. تایبەتمەندی نووسراوە پاش نوێخوازییەکان، تێکۆشان بۆ مەبەستی پێکهێنانی کورتە پێوەندی لەم مەودایە دایە تا خوێنەر سەری سوورِ بمێنێ و نەتوانێ نووسراوەی ئاوا بە سانایی لە نێو وتەزای باوی دەقە ئەدەبییەکاندا تێکەڵ بکات. شێوازەکانی دەکارکردنی ئەم وتەیە بەم چەشنەن: ئاوێتە کردنی لایەنە زۆرزۆر دژوازەکان (لایەنی بە ئاشکرا چیرۆکی و لایەنی بە رووالەت لە سەر بنچینەی راستەقینە) لە بەرهەمێکدا؛ هێنانە گۆڕێی نووسەر و بابەتی نووسەری لە دەقدا؛ ئاشکرا کردنی نەریتەکانی ئەدەب کاتی کەڵک وەرگرتن لەوان. ئەم شتانە هەر لە خۆڕا بە دۆزینەوە و داهێنانی نووسەری پاش نوێخواز دانادرێن و لە چیرۆکە پەخشانییەکانی هاوتەمەنی *دۆن کیشۆت* و *تریسترام شەندی*دا کەڵکیان لێ وەرگیراوە، بەڵام لە بەرهەمە پۆست مۆڕێڕنەییەکاندا ئەوەندە زۆر وەبەرچاو دەکەون، ئەوەندەش بە دوور و درێژی کەڵکیان لێ وەردەگرن کە دەتوانین بڵێین وێڕای ئەو خاڵانەی دیکە کە شرۆڤەیان کردوون، بە دەستکەوتێکی تەواوەن تازە دادەندرێن.

ڤۆلادیمیر ناباکۆف (**Vladimir Nabokov**) ـ یەکێ لە رۆماننووسانی سەردەمی نێوان مۆدێڕنە و پاش مۆدێڕنە ـ لە سەرەتای نووسەریدا، یانی لە دووهەمین

رۆمانی خۆیدا بە نێوی *«شا ـ بی بی ـ سەرباز»* کە بۆ یەکەمجار ساڵی ١٩٢٨ بە زبانی رووسیایی بڵاو بۆوە، زۆر شەنگ و شۆخانە خۆی و خێزانەکەی لە دەور و بەری چیرۆکەکەیدا دێنێتە گۆڕێوە. لە بەشێک لەو رۆمانەدا، لەو کاتەدا کە فڕانس (**Franz**) پاڵەوانی فیکر ئاڵۆز و شێواوی چیرۆک بەرەبەرە زیاتر لە بازنەی مەکر و فڕ و فێڵدا یەخسیر دەبێ، لە شوێنێکی رابواردنی لێوارەی زەریا لە ئالمانیادا ژن و مێردێک دەبینێ کە بۆ رابواردنی وچان و پشوودان هاتوونەتە ئەوێ و بە زبانێک قسان دەکەن کە بۆ ئەو نامۆیە؛ هەروەها ئەم ژن و مێردە تۆڕی پەپوولە گرتنیشیان پێیە. (کە ئەڵبەت لە ساڵی ١٩٢٨دا، یانی ئەو زەمانەی کە هێشتا ناباکۆڤ نێودارترین پەپوولەناسی جیهان نەبوو، زیاتر لە گەمەیەک دەچێ: «لە ناخیا فیکری کردەوە، تەماشایەکی ئەوی دەکەن و ئاخافتنەکەیان بۆ ساتێ دەبڕنەوە، لەو کاتەدا کە بە بەر دەمی ئەودا تێپەڕین، دیسانەکە دەستیان کردەوە بە ئاخافتن. وای بۆ دەچوو سەبارەت بەو قسان دەکەن و تەنانەت نێوبردیشی دەکەن. کە دەیدیت ئەم هەندەرانییە نەکبەتە سەرخۆشەی کە دەگەڵ یارە ئەسمەر و قژ بۆر و دڵڕفێنەکەی بە پەلەپەل دەچن بۆ لێواری زەریا و پاژ بە پاژی گێرە و کێشەی ئەو دەزانن، نیگەران دەبوو و قینی هەڵدەستا....»

ناباکۆڤ لە رۆمانی *ئاگری رەنگ بزربوودا* ـ ١٩٦٢ـ وێڕای زیرەکی تایبەتی خۆی، دوو شێوازی نڤیساری خوازەیی و مەجازی لە دژایەتی دەگەڵ یەکدیدا دادەنێ. ئەم رۆمانە بریتییە لە شیعرێک و راڤەی ئەو شیعرە. ئەغڵەب شیعر لە خەیاڵاتەوە سەرچاوە دە گرێ و راڤە کردن لە سەر بناغەی راستەقینەیە. لە بەر ئەوەی شیعر سۆنگە و ئامێری دەربڕینی خوازەیی و پەخشان ئامێری دەربڕینی مەجازییە. بەڵام لە رۆمانی *ئاگری بزربوودا* ئەم راڤەیەی بە پەخشان نووسراوە بە ئاشکرا لە شیعر خەیاڵاوی ترە، بە و واتایە

کە کینبۆ (**Kinbote**) ـ شیکاری شیعرەکە ـ شێتێکە کە لە خەیاڵات کردنی خۆیدا خۆی پێ پادشای وڵاتی شایەتی «زێمبلا»یە، لە دۆخێکدا ئەو شیعرەی جـان شـێید (**John Shade**) تێفکرینێکـە لـە سـەر ئـەزمـوونی تـەواوەن راستینەی تایبەتی. یەکێک لە شاهیدانی شێتی کینبۆت ئەمەیە کە قیرسیچمانە و لە خۆڕایی تێدەکۆشێ شیعری شـێید وەکـوو رایـەڵـەیـەکـی تێکپێچـراو و ئاڵۆزکاوی تەلبەندی کـراو بـە خـەیاڵـاتی خۆیـەوە راڤـە بکـات. بـەڵـام زۆر ساویلکانەیە بێت و بڵێین ناباکۆڤ دەیهەوێ بە سۆنگەی هەمبـەر کردنـەوەی نێوان کینبۆت و شێید، جیاوازی نێوان خەیاڵات و راستەقینە نیشان بـدات. بـە دوو هۆکار: یەکەم، کینبۆت بە وەها خەیاڵات کردنێکی بە هێز و توانایەکـی کەلامییەوە، زێمبلا بە یاد دێنێتەوە کە زۆر شانازی پێوە دەکەین بـێ بـاوەڕی خۆمان فەرامۆش کەین و بە چەشنێکی کاتی قسەکانی ئەو بسەلمێنین و لـەو کاتەدا جیهانی شێید ئیدی ئەوەندە لە بەر دڵان نابێ؛ دووهـەم، خـودی شـێید بوونەوەرێکی خەیاڵات ساختە یا گومان ساختەیە و مەخلووقی نووسـەرێکـی راستی ناباکوڤـە کە سەربووردە بە نێوبانگـەکـەی هـاودەنگییـەکـی زۆرزۆر زیاتری دەگەڵ ژیانی کینبۆتدا هەیە تا دە گەڵ ژیانی شێیددا. تـەنانـەت بـە کوشـت چـوونی شـێید (کـە بکـەری ئـەم رووداوە بـە پێـی ئـەو شـتەی لـە رۆمانەکەدا هاتووە، «لە راستیدا» تاوانبارێکی راکردە بوو کە شـێیدی دەگـەڵ ئەو دادوەرەدا کە ئەوی بە تاوانبار دانا، بە هەڵە گرتبوو، بـاوەکـوو بـە وتـەی کینبۆت بە کوشت چوونی شێید بە هۆکاری هەڵەی پیاوکوژێکی پیشەییـەوە رووی دا کە بۆ کوشتنی پاشـای دوورخـراوەی زێمـبلا نـاردرابوو) ئـەمـە لـە ئـەزموونـەکـانی خـودی نابـاکۆڤـەوە سـەرچـاوە دە گـرێ، لـە بـەر ئـەوەی پیاوکوژانێکی پیشەیی باوکی ئەویان کوشت کە بە شوێن کوشتنی کەسێکی دیکەوە بـوون. ئـەم چـەشـنە تـەلبـەندییـە شـۆخ و شـەنگانـە بـۆ نووسـەر، لـە

رۆمانەکانی دواتری ناباکۆڤیشدا دەدۆزرێنەوە. لە چیرۆکی پێش دوایین چیرۆکی جی ـ دی ـ سەلینجێر (**Gerome David Salinger**) دا سەبارەت بە بنەماڵەی گڵاس بە نێوی «*سیمۆر، پێشەکییەک*»، ئاخێوەر (بادی گڵاس) ئاماژە دەکات کە دوو چیرۆکی دیکەشی سەبارەت بە براکەی (سیمۆر) نووسیوە: «نەجارەکان، ئەستوونەکانی بن میچەکە لە سەرووتر بگرن» (کە لە بۆ خوێنەری ئەم زنجیرە چیرۆکانە سەرسوورِ هێنەر نیە)، هەروەها *رۆژێکی خۆش بۆ بێنانفیش* کە ئەمە داواکارییەکی سەیر و سەمەرەیە، لە بەر ئەوەی بگێڕەوەی ئەم چیرۆکەی دوایی نەدەناسرا و لە راستیدا چەند ساڵ پێشتر لە کۆچیرۆکێک لە نووسراوەکانی سەلینجێردا کە لە ژێر سەردێڕی *نۆ چیرۆک*دا لە ١٩٥٣دا بڵاو بووبۆوە کە حەوت چیرۆکیان پێوەندییەکی بە بنەماڵەی گڵاسەوە نەبوو. بادی گڵاس لە درێژەدا داواکاری نووسەرایەتی یەکێک لەم حەوت چیرۆکە دەبێ یەکێک لە رۆمانەکانی ناو دەبات کە زۆر لە ناوی رۆمانی هەرە پڕ فرۆشی سەلینجێر بە نێوی *دەشتەوان*ەوە نیزیکە. لە پاشان ئاماژە بە رەخنەی بەرهەمەکانی و دەنگۆکان سەبارەت بە ژیانی کەسانە و تایبەتی خۆی دەکات کە زۆر لە رەخنە و دەمگۆکان سەبارەت بە ژیان و بەرهەمەکانی خودی سەلینجێرەوە نیزیکن. ئەم وتانەی ئاخێوەر گێژ دەکات. بە داواکارییەکانی بادی گڵاسدا وا دەردەکەوێ کە ئەو چیرۆکەی وا ئەو نووسیوە، ـ یانی چیرۆکی *سیمۆر، پێشەکییەک* ـ بە چەشنێکی لۆژیکی بناغەکەی لە سەر ئەم گریمانەیە کە جی ـ دی ـ سەلینجێر کە واماندەزانی چیرۆکی *رۆژێکی پیرۆز بۆ بێنانێفیش*ی نووسیوە، نازناو یا ناوی خوازراوەی بادی گڵاسە و ئەڵبەت ناوی جی ـ دی ـ سەلینجێر بە سەر هەردوو کتێبەکەوە نووسراوە. کاتێک لە ناچاریدا ئەم پرسیارەمان لێ قوت دەبێتەوە کە لەم دوو کەسە (بادی گڵاس و سەلینجێر) کامیان مرۆڤێکی

بەڕاستین، هزری ساخ و سەلیم وڵامی درووست دەزانێ، بەڵام زبانبازی بادی گڵاس ئەم وڵامە رەفز دەکاتەوە. تێکـەوە هاڵـاندنی بـە ئانقـەستی چیرۆکـی خەیاڵی بنەماڵەی گڵاس و بنەماڵەی کۆلفیلد دەگەڵ سەربـوردی سـەلینجێـر، تایبەتمەندی بەرهەمەکانی دواتری سەلینجێرە کە لەواندا وێـڕای هـاودەنگـی خوێنەر، نووسەر دەست دەکات بە گاڵتەیەکی شۆخ و شەنگانە ـ بەم چەشنە: «لایەنی خەیاڵی رووداوەکە زیاتر دەکات و هاوکات دەگەڵ ئەمـەدا لایـەنی ئەدەبی و شێوازی وەسف کردنی رووداوەکە کەم دەکاتەوە». بـادی گـڵاس وا دەنوێنێ کە سەربوردی (راستینەی) بنەماڵەیەک دەگێڕێتەوە و هەروەها بـە تێکۆشانێکی زۆر بۆ کاریگەر کردنی ئەم باوەڕە کـە ئـەو و سـەلینجێـر هـەر کەسێکن، بە قیرسـیچمەیـی و تـەئکیـدەوە لـە سـەر (خودسـالاری) هونـەر و نامەڕبووت بوونی ئەو رەخنەیانەی کە پێداگری لـە سـەر ژیاننامـەی نووسـەر دەکەن، جەخت دەکات. لەم گێڕانەوەیـەدا، فـەلسەفـەیـەکـی لـە رادەبـەدەر مـەزنایـەتی خـواز (استـعلایی) سـەبـارەت بـە ژیـان، خـاوەن سـەلمانـدن و وەرگرتنی مۆجیزە و فامستی ئەوپەڕی هەستەکان، هێندراوەتـە گۆڕێـوە. ئـەم فەلسەفەیە بە ئانقەستە لە قاوغێکی سادە و ساکاردا، لە پـشت حـەشـارێک لـە کورتە راڤەکان، وە درۆ خستنەوەکان، سەلماندنی بە ئاشـکرا و بـە نـەهـێنی، هـەروەهـا بـە سـۆنگەی شـێوازێکەوە پێـشکەش بـە خوێنـەر کـراوە کـە بـە پێچەوانەی هەموو ئەدا و ئـەتـوار و یاسـاکانی زبـان بـازی بـێ راوێـستان، بـە ئاشکرایی لە هەر چەشنە دەنگدانەوەیەکی شاعیرانە (ئـەدەبی) بـێ بـەشـە. بـە قەولی ئیهاب حەسەن (یەکێک لەو رەخنەگرە دەگمەنانەی کە سەلینجێـر بـە پۆست مۆدێرنە دەزانن): ئـەم گێڕانـەوە قـاوغ ناحـەزانـەی کـە وزە بـەزێـن و تەلبـەنـدی کـراو و ئاڵـۆزکاون، رووداوی دە گمـەن و سـەیـر و سـەمـەرە و هەروەها نەبوونی بنەمایەکی خاوەن نەریت و یاسـا دەسـەلمێـنن، نیـشاندەری

چەشنە دژایەتییەک دەگەڵ «فۆڕم»ن. پەند و ئامۆژگارییە گوستاخانەکانی ئەم ریوایەتانە بۆ خوێنەر و نووسەر، بناغە و بنچینەکانی هێزی ئافراندنی هونەری لەرزۆک و بێ هێز دەکەن.
وێڕای گشت ئەمانە، ناباکۆڤ و سەلینجێز لە گەمە کردن بە چەمکی وەکوو خەیاڵات و نووسین و نەریتی ئەدەب، کەم و زۆر رێزی خۆیان دەپارێزن. چیرۆکەکانی ئەوان لە ترۆپکی جوانیدا ئێخسیری هەڵخلیسکان دەبن، بەڵام قەت هەڵنادێردرێن. باوەکوو ناباکۆڤ و سەلینجێر دوو شێوە نقیساری خوازە ومەجاز ئاوێتەی یەکدی دەکەن، بەڵام لە هەر دۆخێکدا چەشنێک هاوسەنگی (تعادل ) و هاوتایی دەپارێزن. ئەم بابەتە سەبارەت بە بەرهەمەکانی دووریس لێسینگ (**Doris Lessing**) یش هەر بەم چەشنەیە و دوو رۆمانی *پەڕتووکی زێڕین* و *پاساو، لە پێش سەرەو خوار بوون بەرەو دۆزەخ* لە برێ لایەنەوە وەکوو بەرهەمەکانی ناباکۆڤ و سەلینجێرە.
رۆمان نووسانی ئێستای ئامریکا، زۆربەیان بە بێ پەڕوایی زیاترەوە راستی و خەیاڵات ـ یا بە وتەیەک، ژیان و هونەر ـ ئاوێتە دەکەن و لەم کارەدا، کۆت و بەربەستێکی کەمتر قەبووڵ دەکەن. بۆوێنە لە رۆمانی *راوکردنی ماسی قزڵ ئالا لە ئامریکادا* زۆر نیشانە وەبەر چاو دێن کە بە ئێمە رادەگەیەنن ئەو کتێبە ژیاننامەی ساز و پەرداخ نەکراوی خودی نووسەر «براتیگان»ە. دەقی کتێبەکە چەند کەڕەت خوێنەر حەواڵەی رەسمی نووسەر کە بە سەر بەرگی کتێبەکەوەیە دەکەن و دەبنە خاوەن بەڵگەیەکی زۆر. (بەڵگەی وەکوو: نامە، شێوەنامە، نامەی کردە، پێرستی کتێب ناسین و... ) لە عەینی حاڵدا برێک لە رووداوەکانی بە جۆرێکی ناماقووڵ خەیاڵین، وەکوو ئەم رووداوەی خوارەوە کە ئاخێوەر لە (کارگای کۆنە ساختی کلیولەند) ـ (جۆبارێکی ماسی قزڵ ئالای دەستی دوو) ـ دەکرێ:

«ئەندازە جۆرانجۆرەکانی بە سەر یەکدا رژابوون و کۆمایان پێکهێنابوو: سێ مەتری، چوار و نیو مەتری، شەش مەتری و... کۆمایەکیشی لە سی مەترییەکان لێ بوو. سەندووقێکیش لە لەت و پەتەکانی، چوومە پێشترەوە و تەماشای ئەندازە جۆرانجۆرەکانی جۆبارەکانم کرد، بڕێک ماسی قزڵ ئالایان تێدابوو... دەتوت جۆبارێکی باشە. دەستم خستە نێو ئاوەکە، فێنکاییەکی بە تام و چێژی بوو.»

ئاخێوەر ئەم رووداوە بە شێوازێکی هەژڵ (جیددی) و ریالیزمی دەگێڕێتەوە و هەروەها رووداوە ئاساییەکان بە کەڵک وەرگرتن لە چواندنە خەیاڵاوییەکان وەسف دەکات. نووسەر کاری یەکدەست کردنی ئەم شێوازە تەواو جیاوازانە دەخاتە ئەستۆی خوێنەر و لەم بابەتەوە هەر هیچ زەحمەتێک وە ئەستۆی خۆی ناگرێ.

کۆرت ڤۆنیگات لە رۆمانی *قەسابخانەی ژمارە پێنج*دا شێوازە جیاوازەکانی نڤیساری زەق و زیندە و داهێنەرانە و زۆر سانا ئاوێتە دەکات هەتا ناوەرۆکی رۆمانەکە بەو چەشنەی بۆخۆی دەیهەوێ بە سەر خوێنەردا داسەپێنێ و کاریگەری هەبێ. ڤۆنیگات لە دواییەکانی شەڕی جیهانی دووهەمدا دەبێتە ئێخسیری جەنگی و لە ئۆردووگای جەنگی «درێسدێن»دا رادەگیرێ. لە پاش بۆمباردمان و وێرانبوونی درێسدێن (**Dresden**) ـ شارێکی ئالمانیا ـ بە سۆنگەی هێرشی هەواییەوە ئەو لە ریزەی ئەو کەسانەدا بوو کە لە بۆ دەرهێنانەوەی تەرمی سووتاوی سەد و سی هەزار قوربانیی ئەم بۆمباردمانە لە ژێر وێرانەکاندا کاری دەکرد. ئەو لە یەکەم بەشی رۆمانی *قەسابخانەی ژمارە پێنج*دا پێی لێدەنێ کە ساڵانێکی زۆر بە شوێن بە رۆمان کردنی ئەم رووداوەوە بووە، بەڵام تایبەتمەندی رۆمانگەلی ئاوا ئەمەیە کە ئەو شتەی لە نەهێنیدا بە دڵیانە، بە رواڵەت ناشیرینی نیشان دەدەن و زۆر ئاسان دەبنە

فیلمگەلێک بە بەشدار بوونی جان واین (**John Wayne** ) و فرانک سیناترا (**Frank sinatra** ). تاقە رێگای نووسینی رۆمانی دژ بە شەڕ، نووسینی دژە رۆمانە، «رۆمانێکی ئاوا دەبێ زۆر کورت و ئاڵۆز و پڕپڕ لە هەرا و زەنا بێ... لە بەر ئەوەی قەڵاچۆ کردن هیچ لایەنێکی ئاقڵانەی نیە کە بتوانین قسەی لە سەر بکەین.»

رۆمانی *قەسابخانەی ژمارە* پێنج چل تیکەیەکی تێکەڵ و پێکەڵە لە پارچە پەخشان و کورتە نووسراوەی جار و بارە خەفەتبار و بڕێجار گەمە و گاڵتەجاڕ و سەیر و سەمەرەیە کە لەواندا ئەزموونەکانی پاڵەوانی دوو رەهەندی رۆمان بە نێوی بیلی پیل گریم (**Billy pilgrim** ) دەگێڕدرێنەوە: ئەزموونەکانی ئەو لە شەڕدا (کە زۆر لە ئەزموونەکانی ڤۆنیگات دەچن)، ژیانی پاش سەربازیی ئەو وەکوو پیاوێکی خاوەن ژن و مناڵ و پسپۆڕی ئەندازە گرتنی بینایی چاو و خاوەن مواجب و داهاتی باش یانی (بەزمەساتی ژیانی بنەماڵەیی و کۆمەڵایەتی) هەروەها خەیاڵاتی لە خۆڕایی ئەو سەبارەت بەوەی کە بوونەوەرانی نەناسراوی گۆیەکی دیکە بە نێوی ترالفا مادوور (**Tralfamadore**) ئەویان رفاندووە (لاسایی کردنەوەیەکی گاڵتەجاڕانەی چیرۆکە زانستی ـ خەیاڵاتییەکان). بیلی بۆی دەردەکەوێ کە زەمان بە لای خەڵکی ترالفا مادوورەوە، مەیدانی رووداوە هاوکاتەکانە. (چەند رووداو لە کاتێکدا)، ئێمە ئازاد و سەرپشکین هەر کامیان هەڵبژێرین. بە گومانی بیلی ئەم واتایەی زەمان، وڵامێکە بۆ کێشەی لە خۆڕا مردن کە نموونەکانی تەقریبەن لە هەموو لاپەڕەکانی رۆمانی *قەسابخانەی ژمارە* پێنجدا بەرچاو دەکەوێ و (هەر جارێک کە لەم رۆمانەدا، کەسێک لە خۆڕا دەمرێ، نووسەر بە کورتی دەڵێ: «بەم چەشنەیە»)، لە بەر ئەوەی بە پێی ئەم بیروبڕوایە ـ کە رەنگە لاسا کردنەوەیەکی گاڵتاجاڕانە لە بڕوا مەسیحی

ئاساكان بێ ـ «بێجگە لەوەی كە جاروبار چەندە وەكوو مردووان دێینە بەرچاو، هەمووومان بۆ هەتا هەتا زیندوو دەبین» ئەم واتایە پاساوكردنێكە بۆ دەستكاری كردن و شێواندنی توند لە رەوتی زەمانی رووداوەكانی رۆمان كە لە ئاكامی ئەودا خوێنەر ناتوانێ سەرەندەر بكات كە ریوایەت بەرەو كوێ دەچێ و هەروەها ناتوانێ دۆخێكی یەكەی دەروونی بپارێزێ. ئەم واتایەی زەمان ئەو دەسەڵاتە بە نووسەر دەدات هەتا جیاوازییەكان و دابڕانەكانی مێژوویی سەردەمی تازە بكاتە سەرمەشق و ئەزموونە جیاوازە چەند دەنگ و رەنگەكان بە چەشنێكی شێواو و ئاڵۆزكاو ئاوێتە بكات. لایەنە جۆراوجۆرەكانی گێڕانەوە (ریوایەت) وەكوو (سەربوردەی كەسانە و تایبەتی، چیرۆك، خەیاڵات و...)ش لە یەكدی جیا نەكراونەتەوە. بۆ وێنە كاتێك بیلی پیلگریم و ئێخسیرەكانی دیكەی ئامریكایی بۆ یەكەم جار دەگەنە ئۆردووگای ئێخسیران لە ئالمانیا، تاقمێ لە ئێخسیرە بەریتانیاییەكان بەخێر هاتنیان پێدەڵێن و كۆڕێك بۆ خزمەت كردن بەوان دەڕازێننەوە، بەڵام ئامریكاییەكان كە تەقریبەن هەتا سنووری مەرگ برسییەتییان كێشاوە، لە پاش بەشداری كردن لەم كۆڕەدا تێكچوونی لەش و زگە شۆرە و تەقەفیڕەیان ئاوقا دەبێ. لە ئاكامدا مەبالەكانی ئۆردووگا پڕپڕ لەم چارە رەشانە دەبێ: «یەكێك لە ئامریكاییەكانی شانی بیلی بە ناڵە ناڵەوە دەیوت: كەمی ماوە تەنانەت ئەقڵیشم بكەوێتە مەبالەكەوە. چەند چركەیەكی دیكە وتی: [ دیتت رۆیی، بینیت رۆیی.] ئاماژەی بە عەقڵی خۆی دەكرد، ئەوە من بوو، ئەوە من بوو، ئەوە نووسەری ئەم كتێبە بوو.»

وتەی بگێڕەوە لێرەدا، كاریگەرییەكی دوو لایەنەی سەیری هەیە. لە لایەكەوە پێمان دەڵێ چیرۆكێكی بەڵگەنامەیی و لە سەر بناغە و بنچینەی ژیان نامە دەخوێنینەوە؛ بە وتەیەكی دیكە چوونكە خودی نووسەر «لەوێ

بووە» دەیجا ئەم گێڕانەوەیە «ڕاستی»یە. لە لایەکی دیکەوە، ئەم وتەیە لە عەینی حاڵدا وەیادمان دەهێنێتەوە کە بیلی پیلگریم و نووسەر سەر بە لایەنە جیاوازەکانی ڕاستییەکن؛ یانی ئێمە کتێب یان چیرۆکێک دەخوێنینەوە کە (بێج لەوەی بە وردی چەندی ڕاستییە و چەندی خەیاڵاتە) بە پێی پێویست زۆر جیاواز و زۆریش دەستکردە و مەودایەکی زۆری دەگەڵ «عەینی ڕاستی» دا هەیە.

لە ڕۆمانی *بەرقەندەی قارەمانان*دا، ڤۆنیگات خۆی لە پلە و پایەی نووسەردا، بە نێو «زەمانی ئێستا»ی ڕیوایەتدا دەکات. نموونەیەک لەم کارە لە گێڕانەوەی خوارەوەدا دەخوێنینەوە:

«واین (**Wayne** ) گوێی لێ بوو ژنە خزمەتکارەکە دەڵێ: (ڕەش و سپی‌یەکم بدەیە) ـ ڕەش و سپی چەشنێک ساردییە ـ واین دەبایە بۆ بیستنی ئەم وتەیە گوێ قوڵاغ بایە. ئەم ساردییە تایبەتە، بۆ مرۆڤ ئاسایی نەبوو. ئەو ساردییە بۆ کەسێک بوو کە هۆکاری هەموو ڕۆژە ڕەشییەکانی واین تا ئەو ڕۆژە بوو، بۆ کەسێک بوو کە دەیتوانی واین بە کوشتن بدات، یا بیکاتە میلیۆنێر، یا بینێرێتە زیندان، یا هەر غەڵەت و هەڵەیەکی دیکە کە دڵی پێوە بایە، ئەو ساردییە بۆ من بوو.»

ئەمە هەمان کارێکە کە فۆرمالیستەکانی ڕووس (نەسەن خوازەکان) پێیدەڵێن «ئاشکرا کردنی تەکنیک». بەڵام لە قاوغی زۆر توندڕۆی خۆیدا. لە بەرهەمە پاش مۆدێڕنەییەکاندا، زوو زوو ئەم تایەتمەندییە دەبینین. بۆ وێنە ڕۆنالد سوکنیک لە یەکێک لە چیرۆکەکانی خۆیدا بە نێوی چیرۆ*کی تۆ چیە؟* ئاوا دەنووسێ: «دڵۆپە وردەکانی باران، لە گوێسوانەی سەربانەوە دادەتکێن. سێبەری پەڵە هەورێک،ترووسکە ترووسکی بەفر لێڵ دەکات. جۆرج

واشینتۆن لە رووباری «دێلوێر»ی سەر دیوارەکانەوە تێدەپەڕێ. مـن لـە پـشت مێزی نڤیساریم دادەنیشم و لە خۆمەوە ئەم قسانە ساز دەکەم...»

چیرۆکـی *سـیخی جـادووی* رابێـرت کوڤـێر (**Robert Coover**) بـەم رستەیەوە دەست پێدەکا:

«لە دوورگەدا پیاسـە دەکـەم و دایـدەهێـنم.» کوڤـێر دیمـەنـەکـانی چـیرۆک پسپۆڕانە لە زەینی خوێنەردا رەسم دەکات و هـەروەهـا بـە پێکهێنـانی ئیبـهام (شاراوەیی) خوێنەر بۆ خوێندنـەوەی چیرۆکـەکـە تامـەزرۆ دەکـات؛ بـەڵـام دەربڕینی زوو بە زووی ئەم بابەتە کە ئەو لە چیرۆکەکەدا ئامادەبوونی هـەیـە و دەستی تێـوەردەدات)، پـسپۆڕی هونـەرمـەندانـەی ئـەو کـەم بایـەخ نیـشان دەدات:

«لەو سەری مەزرادا، لە نیزیک کوێرە رێیەک کە دەگاتە یەکـەم میوانخانـە، سیخێکی ئاسنینی لێیە. سیخێکی درێژ و باریکە و دەسکێکی زەریفـی هـەیـە، کە بە ژەنگ و ژاری نارنجی داپۆشراوە. ئەم سیخە لە بەر سێبەر دایە، بـەڵـام نەک سێبەری چڕوپڕی گیایەک کە لەو دەور و بەرە شین بـووە. مـن لـەوێم داناوە».

رەخنەگران و راڤە نووسان (بە تایبەت لە بـەریتانیـادا) بـە گـشتی رەخنـە لـەم چەشنە نووسینانە دەگرن و دەڵێن: (دیـسانەکـەش چیرۆکێـک سـەبـارەت بـە نووسەرێک کە سەرقاڵـی نووسـینی چیرۆکێکـە؛ دیـسانەکـەش بزووتنـەوەی بەرەو پاشی بێ برانەوە! ئەوە کێیە هونەرێک پەسند نەکات کە لانی کـەم بـە ئاشکرا لاسای شتێکی بێج لە تەکنیکەکانی خۆی دەکات؟ ئەو هونەرەی کـە بەردەوام راناگەیەنێ سەرنج بدەن من دەسکردم! ئەو هونەرەی کە سروشـتی گێڕانەوەی خۆی لە راستیی، بە شـتێکی حـەتمـی دەزانـێ، دەیجـا ئیـدی بـە

مەبەستی نەک زۆر ریایی کەرانەی رەفز کردنەوەی ئەو سروشتە، پێداگری لە سەر ناکات، یا بە پێچەوانەوە».

ئەڵبەت ئەم رەخنەیە بە تایبەت لە نووسراوەیەک بە قەڵەمی جان بارتدا هاتووە کە بە یەکێک لە هەرە پسپۆڕان و داهێنەرەکانی زانیاری و ئاگەداری پاش نوێخوازانە دەژمێردرێ. جەوهەری وتەی جان بارت بۆ لایەنگرانی زۆر قیرسیچمەی ریالیزمی سەلەفی، خۆش نیە. لە وتەی ژێرەوەدا بارت لاسایی کردنەوەیەکی گاڵتە جاڕانەی سەیر لە چەشنێک ریالیزمی سەلەفی پێشکەش دەکات:

(«س» دەست نووسی حەوادا لایەک و بە بێ وزە لە دەرگا شووشەییەکەی ژووری متاڵاوە کە خاوەن دیواری رووکەش کێشراوی دار بەڕوو بوو، چووە هەیوان و لە قەراخ محەجەرییە بەردەکان هەڵوێستەیەکی کرد تا پیپە دارینەکەی خۆی داگیرسێنێ و لە نێوەڕاستی دیوارەی ئەرخەوانیی ویستریاکانەوە (چەشنێک گیا) وتی: «گولووریا»ی دەست و لاق بلووری! گولووریای چاو شەرمن و سنگ پان! دیسانەکەش لەنگەرگای لۆتکەکان ئەوی بۆ حەمام کردنی ژێر خۆر هەڵبژاردووە.)

نووسەر پسپۆڕانە نیشانی داوە کە چۆن بابەتی گێڕانەوە بە سۆنگەی جیرانەتی زەمانی و مەکانی (کات و شوێن) بە دڵەڕاوکەیەکی زۆرەوە سەبارەت بە پاژە زیادییەکان درێژە دراوە. هەروەها لە کەسێتی گولووریادا، پاڵپشت بەستنی نووسەرانی ریالیست بە مەجازی مۆرسەل بە چەشنێکی دڵڕفێن گاڵتەی پێکراوە.

ئەو دەست نووسەی لە وتەی سەرەوەدا ئاماژەی پێکراوە، خودی چیرۆکی «چیرۆکی ژیان»ە کە نووسەرێک لەوێدا بەردەوام تێدەکۆشێ چیرۆکێک سەبارەت بە نووسەرێک بنووسێ کە گومان دەکات جیهان چیرۆکێکە و بۆ

خۆی یەکێک لە کەسایەتییەکانی ئەو چیرۆکەیە ـ گریمانەیەک کە بێتوو بسەلمێندرێ، داهاتەکەی داوێنگیری هەر دوو نووسەر دەبێ ـ (لە راستیدا هەموو نووسەران و لە ریزەی ئەوان جان بارت‌یش.) لە رەوتی بە چیرۆک بوونی ئەم ئیدە و فیکرە سەرەتاییە چارەناچار بیر و رایەک سەبارەت بە چیرۆکن، بەڵام لە پاشان وەدەردەکەوێ ئەمانە بەشێک لە چیرۆکەکەن. «چیرۆکی ژیان» پەڕ چیرۆکێکە (فرا داستان) کە زیرەکانە بۆ وەسەرکەوتن بە سەر رەخنەگرانی پەڕچیرۆکیدا نووسراوە، چوونکە لێرەدا دەگەڵ قاپی رەسمێکدا هەمبەر دەبینەوە کە قاپی پەڕچیرۆکییەکەی هەمیشە لە رەسمەکەدا دەتوێتەوە. ئەم جووڵانەوە پاشەوپاشە بێ کۆتاییە لە ئاکامدا بە کەڵک وەرگرتن لە تەکنیکی «کورتە پێوەندی» کۆتایی پێدێ:

لە کۆتاییدا چ دەکات؟ کەمی مابوو بە چیرۆکەکەی خۆیەوە هەڵواسرێ، بەم هۆکارەوە کە بە یەک چواندنی لە مێژینەی نووسەر و خوا، رۆمان و جیهانی هەستی، ئیدی ناتوانێ دەکار کردرێت. مەگەر بە ئانقەستە بە چەشنی چواندنێکی درۆیین. دەسا وا دەردەکەوێ:

«١. ئەدەبی چیرۆکی دەبێ خەیاڵی بوون و بێ بایەخبوونی خوازەیی خۆی قەبووڵ بکات.

٢. یان ئەمە هەڵبژێرێ کە بایەخ نەداتە ئەم کێشەیە، یان بە بێ پێویستی دابنێ.

٣. یان پێوەندییەکی جیاواز و شیاوی سەلماندن لە نێوان خۆی و نووسەر و خوێنەرەکەیدا پێک بێنێ.

بەڵام تا ئەو کارەی کرد، ژیانی راستی و ماشووقە خەیاڵییەکانی هاتنە ژووری متاڵاکەیەوە. بە پێکەنینەوە بەوی وت: «بڕێک لە نیوەشەو تێپەڕیوە؛ هیچ دەزانی ئەمە یانی چی؟!»

بڕانەوەی چیرۆک بەو قاوغە، نیشان نووسەری ئەدات کە: (بە هەر چەشنێک نووسەر ناتوانێ کەسێتییەک لە چیرۆکێکدا بێ، لە بەر ئەوەی چیرۆکێکی ئاوا، دەگەڵ بۆچوونی ئەو لە چیرۆک بە گشتی جیاواز دەبێ.)

هەروەها کاتێک خێزانەکەی بە سۆنگەی ساڵڕۆژی لە دایکبوونی نووسەرەوە ماچی دەکات، ئیدی ناتوانێ دەست نووسەکەی بە جوانی ببینێ، دەسا بە شکاندنی نووکی پێنووسەکەی و کۆتایی هێنان بە چیرۆک، دوایی چیرۆکی خۆی بە بێ کۆتایی تەواو دەکات، خودی بارت نڤیساری بە شێوازی پاش نوێخوازانە بە نێوی (ئەدەبی ئەگەرە تێر و تەسەلەکان) یا بە ئەدەبی (ئیشباع) نێوبرد دەکات و ستایشی بۆرخێس دەکات، چوونکە ئەو نیشانی داوە کە: «هونەرمەند چۆن دەتوانێ بە چەشنێکی دژواز نوێنانە غایەتە هەست پێکراوەکانی دەورە و زەمانەی ئێمە بکاتە هەوێنی خاو و ئامێر و کەرەسەی کاری خۆی؛ دژواز نوێنانە بەم هۆکارەوە کە هونەرمەند بەم کارە، ڕێ دەباتە ئەوپەڕی ئەو شتەی کە دەڵێی باتڵ کردنی خودی ئەو بێ».

بە بێ گومان نڤیساریی پاش نوێخوازانە لە تێکۆشان بۆ دۆزینەوەی «پێوەندییەکی جیاواز... لە نێوان خۆی و نووسەر و خوێنەرەکەیدا»، پێوەندییەکی جیاواز لەو شتەی کە لە نەریتەکانی پێشووی ئەدەبدا باو بووە، دەگەڵ ئەم مەترسییە گەورەیەدا هەمبەر دەبێتەوە کە لە دۆخی سەرکەوتنی ئاکامیشدا، لە خامۆشی، نەبوونی یەکگرتوویی ئەو شتەی فیدلەر (فامست و دژە کردەی پڕ شەڕ و شۆری خوێنەری پێدەڵێ) (یانی جوانی نەناسانە) کە ئەمانەش هەموو بزر دەبن و تێدا دەچن. هیچ ئەم داواکارییەم نیە کە هەموو دەقە شرۆڤە کراوەکانی ناو ئەم وتارە بە قەرای یەک سەرنجی خوێنەر رادەکێشن و رازیی دەکەن. کاریگەری نووسراوە پۆست مۆدێڕنەییەکان بە سەر خوێنەردا ئەغڵەب دەتوانێ هەر ئەوەندە سەرکەوتوو بێ کە سەرکەوتوو

نەبێ؛ ویڕای گشت ئەمانە زۆرێک لەم کتێب و چیرۆکانە تا رادەیەکی زۆر دەرفەتی رزگار بوونی خەیاڵات پێکدێنن و بەشێکی شایانیان لە جێبەجێ بوونی کاری نڤیساری بە شێوازە جۆرانجۆرەکان بووە. وەک ئەوەی لە عەینی حاڵدا ئەگەری نڤیساری بە دیوناسترین شێوازەکان، لەواندا بە تەئکیدەوە بە کۆتایی هاتوو دادەندرێ. بەڵام بێتوو بە راستی بسەلمێندرێ کە نووسین و نڤیساری بە شێوازەکانی پێشوو ئەگەری نیە، بە وتەیەکی دیکە: چما پۆست مۆدێڕنە بە راستی لە رەفز کردنەوەی چەمکی سامان لە ئەدەبی مۆدێڕندا سەرکەوێ (چ سامانی مەجازی، چ سامانی خوازەیی) لەو دۆخەدا بە راستی دەبێتە هۆکاری تێداچوونی خۆی، چوونکە بەم کارە پێوەرەکانی ئێمە بۆ حاڵی بوون لە راکردن لە یاسا و رێسای پۆست مۆدێڕنە لە نێو دەبات. پێش بەستێنی بە بێ پاش بەستێن، چارەناچار دەبێتە پاش بەستێنی شتێکی دیکە. بیرگەی مێژوویی شێوازەکانی نڤیساری مۆدێڕنە و دژە مۆدێڕنە ناتوانێ پاش بەستێنێکی بە متمانە بێ بۆ پاش نوێخوازی. لە بەر ئەوەی پاش نوێخوازی لە راستیدا چەشنێک هونەری یاساو رێساشکێنە و ئەڵبەت شکاندنی رێساکان کارێکی لە خۆڕاییە کە تەماشا کردنەکەشی خۆشییەکی نیە، مەگەم هێشتا کەسانێک بە پێ و شوێنی پاراستنی ئەو رێسایەوە بن.

## تێبینی و پەراوێزەکان:

١ــ سامۆئێل بیکێت: نووسەری نێودار و خاوەن خەڵاتی نۆبێل، خەڵکی ئیرلەندیا. نووسراوەکانی کە زیاتر شانۆنامە و رۆمان و چیرۆک بوون بە دوو زبانی فەرەنسی و ئینگلیزی دەنووسی. لە ساڵانی (١٩٨٩ – ١٩٠٦)دا دەژیا. نێودارترین بەرهەمەکانی ئەمانەن: مێلۆی، لە چاوەنواڕی گۆدۆدا، مالۆن دەمرێ، وات، مۆرفی و . . . .

٢ــ دۆناڵد بارتێلمی: (. . . . ــ ١٩٣٠) رۆماننووسی زۆر پۆست مۆدێرنەی ئەمریکی خاوەن رۆمانی زۆر نێوداری سپیلە بەفری و . . . .

٣ــ جان بارت: (. . . . ــ ١٩٣٠) رۆماننووسی پۆست مۆدێرنەی ئەمریکی کە خەیاڵ و زانست لە رۆمانەکانیدا بەرچاون و زۆر کات زیاتر لە چەند کۆتایی بۆ چیرۆکەکانی پێشنیاز دەکات.

٤ــ جان فاولز: (. . . . ــ ١٩٢٦) رۆماننووسی پۆست مۆدێرنەی ئینگلیزی خاوەن رۆمانی نێوداری ژنی سیتوانی فەرەنسایی و . . . .

٥ــ ریچارد براتیگان: (١٩٨٤–١٩٣٥) رۆماننووسی پۆست مۆدێرنەی ئەمریکی خاوەن رۆمانی زۆر نێوداری راوکردنی ماسی قزل ئالا لە ئامریکادا.

٦ــ رۆمەن یاکوبسەن: (١٩٨٢–١٨٩٦) زبان ناس و خاوەن بیرۆکە و تیۆرزانی ئەدەبی رووسیا کە لە پاشان خۆی کردە ئەمریکی.

٧ــ کۆرت ڤۆنێگات: (. . . . ــ ١٩٢٢) رۆماننووسی پۆست مۆدێرنەی ئەمریکی خاوەن ئەزموونێکی زۆر لە شەڕی گەردوونی دووهەمدا کە لە رۆمانەکانیدا بە تێر و تەسەلی لە سەریان دەدوێ وەکوو لە رۆمانی «قەسابخانەی ژمارە پێنج»دا. بەرهەمەکانی تری: شەوی دایک، بەخێر بێن بو ماڵی مەیموون، دەزووبازی و . . . .

٨ــ پەرچیرۆکی: لەولای چیرۆکەوە، فارسەکان پێی دەڵێن: «فَرا داستانی»

٩ــ پەرمرۆڤ خوازی: لەولای مرۆڤ خوازییەوە، فارسەکان پێی دەڵێن: «فرا انسانگرایی»

# داهاتوویەک بۆ رۆمان

نووسەر: ئالێن ڕۆب گرێ (Alain Robbe Grillet)

لە یەکەم نیگادا، زۆر چاوەنوارییەکی دوورەکەرۆژێک ـ بۆ وێنە هەرلەم سەردەم و زەمانەی خۆماندا ـ بینەری سەرهەڵدانی چەشنێکی تەواوەن نوێی ئەدەب بین. ئەو تێکوشانە جۆراوجۆرانەی لەم سی ساڵەی دواییدا بۆ کۆتایی پێدانی کۆنەیی و چەندیات بوونەوەی ئەدەبی چیرۆکی کراوە، لەباشترین دۆخی خۆیدا هەر توانای ئافراندنی برێ بەرهەمی بڵاوبڵاوی بووە و زۆر دەبیستین کە هیچکام لەم بەرهەمانە ـ بەپێچەوانەی ئەو هەموو سەرنجەی رایکێشاوە ـ بە قەرایی رۆمانە بۆرژواییەکان پێشوازی گشتی لێنەکراوە. لە راستیدا، هێشتاکەش هەر هەمان بۆچوونێک کە بەلزاک لە رۆمانی بوو، باوە و برەوی هەیە. یان بۆچوونی خاتوو لافیت رۆماننووسی فەڕەنسی (١٨٥٠ ـ١٧٩٩) شیکردنەوەی دەروون ناسانە کە لە سەردەمی ئەودا پلەوپایەیەکی بەرزی هەبوو، بنەمای پەخشانە جۆراوجۆرەکان دەژمێردرا و ئافراندنی هەر رۆمانێک، وەسفی کەسێتییەکان و بەرەوپێشەوە چوونی رووداوەکانی ئەوی دابین دەکرد لەو سەردەمەوە هەتا ئێستا، رۆمانی باش یانی تۆژینەوەیێ لە سەر هەستە بەسۆزەکان ـ یان ململانێ یەک لە نێوان ئەم هەستانەدا، یان نەبوونی ئەوان ـ لە کۆمەڵگایەکی گریمان کراودا زۆربەی ئەو رۆماننووسە هاوچەرخانەی داستانەکانیان بە شێوازی سەلەفی دەنووسن ـ

بە زبانێکی دیکە، ئەو نووسەرانەی پەسندی لای خوێنەرانیانن ـ دەتوانن چەند بەشی دوور و درێژ لە رۆمانی *خاتووشازادە کلێوی* خاتوولافیت یان *بابە گۆریۆی* بەلزاک لە بەرهەمەکانی خۆیاندا بنووسنەوە بە بێ ئەوەی ئەوخۆێنەرە زۆرانە کە هەموو بەرهەمەکانی ئەوان بە ئیشتیاوە دەخوێننەوە لەم بابەتە ئاگادار ببنەوە. هەر ئەوەندە بەسە کە لێرەو لەوێ کۆپلەیێ بگۆڕن، برێ وشە و زاراوە بە چەشنێکی ساناتر بنووسنەوە و جاروبار بە وشەیێ، یان وێنەیەکی تازە، یان رەستەیەکی خاوەن ریتمی مۆسیقایی و... برێ لە، چەشنی نووسینی خۆیان پێ نیشان بدەن. بەڵام ئەم رۆمان نووسانە هەموویان دەیسەلمێنن کە روانگەی بینینی ئەوان مێژینەیەکی چەند سەدساڵەی هەیە و ئەم بابەتە بە هیچ لەونێک مایەی سەرسوڕمانی ئەوان نیە.

بەڵام دەبا بزانین بۆچی ئەم بابەتە سەر سووڕهێنەرە؟ زبانی فەڕەنسی کە دەورێکی وەکی هەوێنی خاوی چیرۆکنووسی هەیە، لەم سێ سەد ساڵەی دووابیدا تەنها ئاڵوگۆڕی زۆر چکۆلەی بەسەردا هاتووە و بە پێچەوانەی پێشکەوتی بەردەوامی کۆمەڵگا پێشکەوتی سەرنجڕاکێشەری تەکنیک، شارستانیەتی فیکری ئێمە کەم و زۆر بە بێ ئاڵوگۆڕ ماوەتەوە. مەیل کردن و بێ مەیلی ئێمە ـ چ لەو خواردەمەنیانەدا کە دەیخۆین و چ لە بەستێنی کێشەی ئاکاری و ئایینی و نیرمایی و پاک و خاوێنی لە بناغەدا هەروەکوو رابردوو وایە. بێج لەمانە «دڵ»ی ئینسان و هەستەکانی ئەو کە هەمووومان دەزانین لە سەرەتاوە پێکهێنەری ئەو بووە، بە بێ ئاڵووگۆڕ ماوەتەوە. کورتی ببڕینەوە لە جیهانی ئێمەدا، هیشتێکی تازە هەبوونی نیە، هەموو قسەکان لە بەرهەمی ئەدەبی رابردوودا وتراوە، ئێمە درەنگمان دەست بە چیرۆکنووسین کردووە و، هتد...

چما زات بکەین و داواکاری ئەوە بین کە نووسینی ئاوەها ئەدەبێک نەک هـەر لـە داهـاتوودا دەکـرا، بەڵـکوو لەمەوبـەرەوە دەسـتی پێکـردووە و پشکووتنی وی پێ نیشاندەری شۆڕشێکی هەمەلایەنەتر لەو شۆڕشانە دەبێ وا لە رابردوودا پێکهێنەری قوتابخانەگەلێ وەکوو رۆمانتیزم و نـاتۆڕالیزم بـووە، لەوکاتەدا زیاتر لەگەڵ ئێمەدا دژایەتی دەکردرێ.

هەڵبەت ئەم وادەیەی کە «لەمەو دووا بارودۆخ دەگۆڕدرێ!» بڕێ جێگـەی پێکەنینە. بارودۆخ لەچ بارێکەوە دەگۆڕدرێ؟ لایـەن و بـەرەی ئـەم گۆڕانـە چییـە؟ لـە هـەموو شـتێکیش گرینگتـر، بـۆچی ئێـستا بـارودۆخ خەریکـە دەگۆڕدرێ؟

دەسـا، هونـەری رۆماننووسـین بەتونـدی ئەسـیری قـەیران بـووە و هـەموو رەخنەگرانی ئەدەب پێ بەم قەیرانەدا دەنێن و لەم بابەتەوە بـاس و خواسـیان کردووە. بارودۆخەکە جۆریکە زۆر دژوارە پێش‌بینین بکردرێ ئـەم هونـەرە بەبێ گۆڕانێک لەرەگ و ریشەوە بتوانێ ماوەیـەکی زۆر بـەردەوام بـێ. ئـەم وەزیعەتـە، بـە تـەواوی ئاشـکرایە: یـانی بـە هـۆی نـەبوونی ئەگـەری ئـەم گۆڕانکارییەوە، هونەری رۆمان خەریکە دەمرێ. بەڵـام ئاوەهـا چارەنووسـێ بەگومانی مـن حەتمـەن و بڕاوەنیـە. مێـژوو تـاکوو چەنـد دەهەیـەکی دیکـە پـێ‌نیـشانی ئـەدا ئـەم تێکۆشـان و تەقالایانـە، نیـشانەی قـەیران و مـردنن یـان نیشانەی لە دایـک بـوونێکی دیکـەن. بەڵـام ئـەو دژوارییـە گەورانـەی وا لـە سەرەڕێی ئاڵوگۆڕێکی ئاواگەورەن نابێ لەبەرچاونەگرین و بەکەم دابندرێن.

هەموو زەنجیرە پلەوپایەی تـاقمی ئـەدەبی ئێمـە (هـەر لـە بڵاوەکەرەوەوە بیگرە تاکوو خاکینەوخۆڵینەترین خوێنـەر، هـەروەها هـەمووکتێبفرۆشـان و رەخنەگران) بە ناچاری لەگەڵ قەوارەی تـازە و بـەبێ پێـشینەی ئەدەبـدا کـە تێدەکۆشێ خۆی قایم کات، دژایەتی دەکەن. ئەو زەینانەی پێویست بـوونی

ئەم گۆڕانەیان لێ‌حاڵی بووە، ئەو کەسانەی والەگەڵ تازەگەری لە ئەدەبدان و تەنانەت پێشوازیشی لێدەکەن؛ بەم حاڵەشەوە میرات بەرانی دۆخی سەلەفین. قەوارە تازە ئەدەبیەکان هەمیشە بەبێ هەرجۆرە قاڵبێکی ئەدەبی دادەندرێن چوونکە ئێمە لە خۆڕا نەزانانە قاڵبە سەلەفیە پیرۆزکراوەکان پێوانەی دادەوەری بەسەر ئەواندا دادەنێن. لە یەکێ لە بەناوبانگترین کتێبە سەرچاوەکانی فەڕەنسیدا، لە وتارێکدا ئاوا سەبارەت بە شۆنبێرگ دەخوێنینەوە: دانەری بەرهەم گەلێکی گۆستاخانە کە بەبێ لەبەرچاوگرتنی هیچ جۆرە یاسایێ بەرهەمەکانی دەخولقاند. «ئەم دادوەریە کورتە لەسەرەتایەکی مۆسیقاڕیدا و بەڕواڵەت بە قەڵەمی کارناسێک نووسراوە.»

[illegible]

لەبەر ئەوەی چما ئەو پێوانەیانەی زەمانی رابردوو بەشی زەمانی ئێستاش بکەن، ئەوا پێکهێنەری زەمانی ئێستاشن. نووسەر بە پێچەوانەی مەیلی خۆی بۆ سەر بەخۆیی، لە چوارچێوەی فەرهەنگ و ئەدەبی رابردوودا

بەرهەمەکانی دەخولقێنێ و توانای نیە خۆی لەوشێوازە سەلەفیانەی بەرهەمی ئەوە بەتەواوی رزگار بکات.

جار و بار وادێتە بەرنیگا بەوردی هەمان ئەو توخمانەی ئەو سەخت دژایەتی لەگەڵیاندا هەیە لەهەمان بەرهەمدا کە هیوای لە ناوبردنیانی بوو، بە هێزتر لە هەرکاتێکی دیکە ژیان رادەبوێرن و هەڵبەت لایانگرانی ئەدەبی رابردوو بە خاترجەمی یەوە پیرۆزبایی پێدەڵێن کە ئاوەها ئەویندارانە ئەو شێوازە سەلەفیانە بڵاو دەکاتەوە.

بەم پێیە، کۆتایی پێهێنان بە یەک کەش و هەوابوونی رۆمان، زێدە لە هەمووان بۆ کارناسانی ئەم کارە (یانی رۆماننووسان، رەخنەگران و خۆێنەرانی وردبین) دژوار دەبێ.

تەنانەت ئەو بینەرەش کە هەتا کەمترین ئاست خووی بە جیهانی دەوروبەری خۆیەوە گرتووە ناتوانێ رووداوەکانی ئەوا بە چاوانێکی تەواوەن بێلایەنەوە تەماشا بکات. هەڵبەت مەبەستی من ئەو راستەقینە خوازییە ساویلکانەیە نیە کە لەکاری شیکارانی رۆحدا (کە لایەنێکی تەواوەن زەینی هەیە) زۆر گاڵتەجاڕ دەژمێردرێ. تەواوەن ئاشکرایەکە راستەقینە بەمانای ئاسایی وشە -یانی بینینێکی بەبێ هیچ ڕایەکی تایبەتی- خەیاڵێ زیاتر نیە. بەڵام دەبێ لە بینیندا دەستەڵاتمان هەبێ، لە حاڵێکدا لە راستیدا کارەکە لەمە جیاوازە.

لە هەرکات و ساتێکی پرۆسەی بینیندا، توخمەکانی دەوروبەری فەرهەنگ وەکوو: (دەروونناسی ئاکاریگەری، فەلسەفەی مێتافیزیک و...) دائیمەن لەو شتانەدا دەیان بینین خۆ تێ هەڵدەقورتێنن و ئەوان دیوناستر و شیاوی فام کردنتر و متمانە بەخشتر دەکەن برێ جاریش ئەم پەردەی حەشاردانە راپۆشەیەکی زیاتری هەیە: هێما و ئاماژە لە زەینی ئێمەدا جێگەی خۆیان

ئەدەنە ئەو سۆزانەی ئەوانی خولّقاندووە و دیمەنێک بە ئاوەڵناوی «ئیشک وبەتاڵ» یان «هێدی و هێمن» وەیادمان دەهێنێتەوە بەبێ ئەوەی بتوانین بیچمێکی گشتی یان یەکێ لە ئەندامە گرینگەکانی ئەو دیمەنە لە زەینی خۆماندا سازکەینەوە. بێتوو بێوەستان فیکر بکەینەوە، «ئەمە وەسفێکی ئەدەبیانەیە» نامانەوێ ئەم فیکرە رەفز کەینەوە. دەیسەلمێنن کە وەسفی ئەدەبیانە (ئەم وشەیە، بە کار هێنانێکی سووک و چروکی بەسەرهاتووە) وەکوو تۆڕ، یان پەردەیەکی کە بەلەتکی چکۆلەی شووشەیەکی رەنگاوڕەنگ رازاندرابێتەوە و دەبێتە هۆی تێشکانی مەیدانی بینینی ئێمە لە چەشنی تەختانێکی چکۆڵە و وەکی‌یەکدا.

بێتوو توخمێ لە هەمبەری ئەم لایەنگرییە یاسامەندە بۆ پرۆسەی (بینین)پێداگری بکات، چما هۆیەک لە جیهان‌دا بینینی ئاسایی ئێمە تێک بشێوێنێ و لە ڕادەی ئەو بەتوانابین، دائیمە دەتوانین بەسانایی لە چەمکی «پووچ و پووچ خوازی» بۆ مەبەستی سڕینەوەی ئەمجۆرە شتە عاجباتیانە کەڵک وەرگرین.

بەڵام جیهان نە واتادارە و نە «پووچ»ە، بەڵکوو هەر هەبوونی هەیە. سەرنج راکێش‌ترین تایبەتمەندی جیهانیش هەر ئەو (هەبوون)ەی ئەوە. ئەم بابەتە، لە گەڵکوو سەبارەت بەوەی فیکر بکردرێتەوە، وەها ئاشکرا دەنوێنێ کە هیچ چارەیەکمان بێج لەوەی بیسەلمێنین نامێنێ. لەوکاتەدا تەواوی خەیاڵەکانی پێشووی ئێمە وەک بینایەکی شکۆدار بە جارێک تێک دەڕووخێ. کرانەوەی بە بێ‌چاوەنوارِی چاوەکانمان بەرەو ئەو راستەقینە گیان سەختەی کە وامان دەنواند بە سەریدا زاڵ بووین، زەبرێکی سەرسام هێنەرە. شتەکانی دەورو بەرمان، بە بایەخدانان بۆ ئێمە و ئەوگشتە ئاوەڵناوانەی بۆی دادەنێین، هەبوونیان هەیە. پانتایی‌یە ئاشکرا و ساف و دەست لێ نەدراوەکەیان، نە

بەجۆرێکی گومانساز لە خۆیەوە نوور ئەداتە دەرێ و نە نوور بە خۆیدا تێپەر دەکات. ئەدەبی ئێمە بڕابڕ نەیتوانیوە تەنانەت سووچێکی چکۆڵەی تەختی ئەوان لە نێو بەرێ و یان چکۆلەترین داواکاریەکان ڕاستوساخ کاتەوە. فیلم گەلێکی بێژمار کە لە ڕووی ڕۆمانەوە سازکراون و لەسەر پەردەی سینەما گەلێکی زۆر نیشان دراون، توانای دووپات و چەند پاتکردنەوەی ئەم ئەزموونە سەیروسەمەرەیەیان بۆ چەندان کەڕەت کە پێمان خۆش بێ جێ بەجێ کردووە. سینەما کە لە میرات بەرانی شێوازە سەلەفیەکانی دەروونزانستی و سروشت خوازییە «ناتۆڕالیزم» بە گشتی ئامانجێکی نیە بێج لەوەی چیرۆکێک بکاتە رەسم و وێنە. بەبارێکیتردا لە فیلمی سینەماییدا هەر دوای ئەم مەبەستە دەکەون کە ئەو واتایانەی رستەکانی ڕۆمان لە ڕێگەی تایبەتی خۆیەوە بەخۆێنەری دەوت، سینەما بە هۆی وێنەی هەڵبژاردە و تایبەت بیخاتە زەینی بینەرەوە. بەڵام جیاوازی نێوان فیلم و نێوەرۆکەکەی ـچ ڕۆمان و چ فیلمنامەـ لەوەدایە کەگێڕانەوەی فیلم هەرکاتێ دەتوانێ هێمنایەتی ناوەوەی ئێمە تێکدا و بەزۆر بمانکێشێتە جیهانی رەسم و وێنەوە. هەموان دەزانن چ ئاڵووگۆڕێک بۆ گۆڕانکاری ڕۆمان بۆ فیلم پێک دێ. ئەو شتانەو هێما و ئاماژەکان کە بیچمی ڕۆمان گیاندار دەکەن، بەجارێ حەوا دەدرێن و هەر دەلالەتەکان دەمێننەوە. کورسی بەتاڵ ئاماژەیە بۆ نەبوونی کەسێ یان چاوەنواڕی، دەستی کەسێتی‌یەک کە لە سەر شانی کەسێتیەکی دیکەبێ، نیشانەی هەستی دۆستانەیە و نەردەی پەنجەرە بە واتای نەگونجان تەرک کردنی شوێنێکە. .

.

بەڵام لە فیلمی سینەماییدا، ئەوکورسییە، و بزوتنەوەی دەست و قەوارەی نەردەی پەنجەرەکە دەبینین. دەلالەتەکانی ئەوان هەروەها ڕوونە، بەڵام ئەم

دەلالەتانە ئیدی تـەواوی سـەرنجی ئێمـە بـەرەو خۆیـان ڕاناکێـشن، بەڵـکوو دەبنە شتێکی دیکەش زیاتر لەبەر ئەوەی ئەو شتەی شوێن پێ و کارتێکردنی بەسەر ئێمەدا هەیە، ئەو شتەی لە زەیـنی ئێمـەدا سـەقامگیر دەبـێ، ئەوشـتەی ناسنامەیەو وادێتە بەر نەزەر بۆ چەمکە تاریکەکانی عەقڵانی کەم ناکات و لە ڕاستیدا هەمان هێما و ئاشێرانەیە و هەمان شت و جۆڵانەوەکانن کە وێنەکانی فیلم لە کات و ساتێکدا (نابەدڵی ئێمەیان بـێخواسـتی ئێمـە) ڕاسـتییـەکانی ئەدەنەوە. ڕەنگ‌بێ بەلامانـەوە سـەیربێ کـە ئـەم جـۆرە ڕاسـتەقینە ڕووت و قووتانە- کە گێڕانەوەی کراوە بە فیلم چارێکی بۆ نۆمایش نـەدانیان نیـە، زۆر شیاوی لەمس و زیندوو دێنە بەر نەزەر، لە حاڵێکدا شانۆی ئاوەهـا لـە ژیـنی ڕاسـتەقینەدا نـاتوانن چـاوی ئێمـە بـەرەو ڕاسـتەقینەکان بکەنـەوە. دەڵـێی لـە ڕاسـتیدا شـێوازەکان و گێـرەوکێـشمەکانی فـیلم «وەکـوو نومایـشی دوو ڕەهەنـدی، وێنـەی ڕەش‌وسـپی، کـادری پـەردەی سینەما، جیـاوازی نێـوان ئەندازەکانی شانۆ جیاوازەکان» یارمەتی‌یان ئەدەن تاکوو خۆمـان لەرەوشـت و کێشمەکێشمەکانی خۆمان ڕزگارکەین. لـە عـەینی حاڵـدا، لایـەنی‌کـەم و زۆر «ناسروشـتی» ئـەم جیهانـە دیـسان‌سـاز کراوەیـە، خووخـدەی نائاسـایی جیهـانی دەوروبـەری ئێمـە ئاشـکرا دەکـات: جیهـانی ڕاسـتەقینەش چونکـە لەگەڵ ڕەوتی حاڵیبوون و نیزامی پۆلێن کردنی چەمکەکان لە لایان ئێمـەوە نایخوێنێتەوە، نائاساییی‌یە.

دەسا، دەبێ حەول بدرێ لە جیـاتی ئـەم جیهـانی «دەلالەتـە» (چ دەلالـەتی دەروون زانستی، چ کۆمەڵـایەتی‌یـان کردەوەیـی)، جیهـانێکی بـەردەوامتر و ڕاستەوخۆتر سازکرێ. بەشکەم بتوانین هەبوونی شتەکان و هێما و ئاماژەکان لـە یەکـەم پلـەدا بـە هـۆی هـەبوونی ئەوانـەوە بـە بـوودەی یـەقین دابنـێین، دیـسانەکە بەڵـکوو ئـەم بوودەیـە هـەروەها بەسـەر هـەر جـۆرە تیۆرەیـەکی

راڤەیی‌دا کە حەولی گەمارۆدانی ئەوی لە یاساو نەریتی حەواڵەکردنەکاندا هەیە سەرکەوتوو بێ »جائەم حەواڵە کردنە عاتیفی بێ، کۆمەڵ زانستی بێ، فرۆیدی‌یان میتافیزیکی بێ«. لە جیهانی‌داهاتووی رۆماندا، هەبوونی شتەکان و هێما و ئاماژەکان فەخریان بەسەر دەلالەتەکانی خۆیاندا دەبێ، هەبوونیان هەروەها بەردەوام دەبێ، هەبوونێکی رەسەن، بەبێ ئاڵوگۆڕ و دائیمە حازر کە گاڵتە بە «واتاکان» دەکا، هەمان واتایەک وا بە خۆڕایی تێدەکۆشێ ئەوانە تا رادەی ئامێرێکی عەجالەتی «کاتی» راکێشێتە خوارێ کە هەوێنی بێدەوامەیی و مایەی شەرمەزاری ئەوە، بە تەنیا و بە ـ ئەنقەستەـ راستینەی عالی‌تری ئینسانەتی لەودا وادەرکەوتوو هەر لەودا تێکەڵ بوو تاکوو ئەم زیادینە نەحاواوەیە، حەواداتە فەرامۆشی وتاریکانی ئانییەوە. لەمەوبەدوا، بەپێچەوانەی رابردوو، شتەکان وردەوردە لایەنی بە بێدەوامە و تەم و مژاوی خۆیان لە کیس ئەدەن، بە زبانێکی دیکە، نهێنی‌یە درۆیینەکان یان ئەو هەبوونە دەروونیە جێی‌گومانەی وا رۆڵان بارت (فەیلسوفی فەڕنسی، ١٩٨٠-١٩١٥)، ناخی رۆمانسی شتەکانی، ناو لێناوە، حەوائەدرێتە لاوە. شتەکانی دیکە هەر رەنگدانەوەیەکی لێڵی رۆحی تەمومژاوی پاڵەوانی رۆمان یان ئاماژەیێ لە ئەو ئەشکەنجە و ئازارانەی دەیکێشا یان سێبەری ئاواتەکانی ئەو نابێ. لە راستیدا، بێتوو شتەکان بۆکات و ساتێکش نیشاندەری هەستەکانی ئینسان بن، ئەم کارە هەر لایەنی کاتی هەیە و شتەکان هەر بەڕواڵەت ـ دەکرێ بوترێ گاڵتە جاڕانەـ زاڵبوونی زاڵمانەی دەلالەتەکان قەبوڵ دەکەن تاکوو لەم ڕێگەوە نامۆ بوونی خۆیان لە ئینسان باشتر نومایش بدەن.

پێرسۆناژەکانی «کەسێتی‌یەکانی» رۆمانی داهاتووش جورێک دەبن کە دەکرێ ئەوان بەچەند لەونی جیاواز لێکدەینەوە. بە سۆنگەی سەرقاڵبوونی ئەم کەسێتی‌یانەوە، لەهەر لایەنێکەوە دەکرێ ئەوان لێکدەینەوە (وەکی

لایەنی دەروون زانستی، دەروون شیکاری، ئاینی یان رامیاریگەری)، بەڵام گرینگی نەدانی ئەوان بە ئاوەها «دەلاتگەلی زاتی» زۆر زوو ئاشکرا دەبێ. بە پێچەوانەی پاڵەوانی سەلەفی کە بەم لێکدانەوەیانە سەبارەت بەمەبەستی نووسەر، دائێمە فریو دەخوا، دەکەوێتە تۆڕەوە و زایە دەبێ، بەردەوام حەواڵەی کوێندەر ـ کوێیەکی غەیری ماددی و بە بێدەوامە دەکرێ و هەمیشە بەدوور لە دەست پێگەیشتن و تەماوی دەنوێنی، پاڵەوانی داهاتوو هەبوونێکی بەرهەستی دەبێ. ئەم جۆرە راڤەکردنانە لە هەمبەری هەبوونی حاشا هەڵنەگریی پێرسۆناژەکانی رۆماندا، بێ‌کەڵکە و زیادی و تەنانەت ناشیاویش دێنە بەرنیگا و بەم لەونە، لەکوێندەرکوێدا بەحاڵی خۆیاندا فڕێ ئەدرێن. بەڵگەی ئەسپاردراوی چیرۆکی پۆلیسی، بەجۆرێکی دژواز نوێنانە وێنەیەکی رووناک لەم دۆخەمان ئەداتە دەست. لە یەکەم نیگادا وا دێتە بەرچاو ئەو شایەتمانانەی بازڕەسەکان وەچنگیان کەوتووە (وەکوو ئەو شتەی لە شوێنی جینایەتدا بە جێماوە، جووڵانەوەیێ وا لەکاتی خۆیدا وێنەی لێ‌هەڵگیراوە یان رستەیێ وا لە شایەدانی چیرۆک بە هەڵکەوت بیستوویەتی ئەمانە دەبێ پاساو بکرێن، یان بە چەشنێکی دیکە، دەبێ هەبوونیان لەگەڵ دەوری ئەوان لەو بەستێنەدا وا تێیدان، پێکەوە بلکێنەوە. ئێستاش ئیدی بەرەبەرە گومانەدانراوەکان قەوارە دەگرن: قازی دادگا تێدەکۆشێ پێوەندییەکی لۆژیکی و پێویست لە نێوان ئەم بەڵگانەدا پێک بێنێ. وادێتە بەرنیگا کە دەتوانین گشت نهێنی‌یەکان بە شێوازی ئاسایی و بەیارمەتی کۆمەڵەیێ هۆ و سۆنگەی تەماکان و هاوکاتی رووداوەکان و... بسڕێنەوە.

لەلایەکی دیکەوە، چیرۆکیش بەجۆرێکی پەرێشانکەرەوە بەربڵاو دەبێتەوە، شایەتمانەکان قسەکانی یەکدی دەشکێنێتەوە، بوختان بۆکراو چەند هۆی جۆراوجۆر بۆ سەلماندنی ئەوەی لە شوێنی جینایەتەکەدا نەبووە

دەگێڕێتەوە، چەند بەڵگەی تازە وەدەست دەکەون کە پێشتر لەبەرچاو نەگیرابوون... ئێمەش هەروەها دەگەڕێینەوە سەر ئەو بەڵگانەی لە دەوسیەدا تۆمار کراون: کەلوپەلەکە و شوێنی وردی دانانەکەیان لەو ژوورەدا، قاڵبی جێ پەنجەیەک، چەندکەڕەت ئەمە دووپات بۆتەوەو ئەو وشە نادەقیقانەی کوژراوەکە لە کاتی مردندا نووسیویەتی وردە وردە ئەم هەستە لە ئێمەدا بە هێز دەبێ کە: چ شتێکی دیکە بەڕاستی نیە.

ئەو توخمانەی گاڵتە بە دام و دەزگا فیکرییەکان دەکەن، باوەکوو دەلوێ نهێنییەک ئاشکرا بکەن یان بیشارنەوە بەڵام تاقەخاوەنی تایبەتمەندییەکی هەژڵ و ئاشکران و ئەویش هەبوونی هەست پێکراوی ئەوانە. ئەم بابەتە، تەواو جیهانی دەورووبەری ئێمەش دەگرێتەوە. وامان دادەنا کە واتادانان بۆ جیهانی هەستی، بەسەرجیهاندا زاڵمان دەکات و ئاوەها دەهاتە بەرنیگا کە بە تایبەت هونەری ڕۆمان تەواوەن تایبەتی ئەم کارەگرینگەیە. لەحاڵێکدا ئەم بۆچوونە تاقە سادەکردنەوەیەکی تەماوییە و جیهانی هەستیش لە جیاتی ئەوەی بەبێ گرێ و گۆڵتر بێ و بکەوێتە پێوەندییەکی چڕوپڕتر لەتەک ئینساندا، ئیدی هیچ گیانێکی نامێنێ بەوەیدا کە ڕاستەقینە بوونی جیهان بەگشتی لە هەبوونی ئەودا خۆی نیشان ئەدات ئەرکی ئێمە لەم ئاستەی ئێستادا،پێکهێنانی ئەدەبێکە وا ئەم هەبوونە لەبەر چاوبگرێ.

چما پێوەندی بەشەر لەگەڵ جیهانی هەبووندا لە ئاستی ئاڵوگۆڕدا نەبایە (ئەویش ئاڵوگۆڕێکی هەمەلایەنە و حەتمی)، ئەم قسانە زۆر تیۆرئاسا و تەم و مژاوی دەهاتە بەرچاو. هەربەم هۆیەوە بەرەبەرە وڵامی ئەم پرسیارە تەوساویەمان لێ ڕوون دەبێتەوە: «بۆچی ئێستا؟».

لە ڕاستیدا ئەمڕۆکە هۆیەکی تازە بۆتە سۆنگەی جیابوونەوەی بنەڕەتی سەردەم و زەمانەی ئێمە لەگەڵ سەردەمی بەلزاک یان ژیدا (ئاندرێ

۱۹۵۱ـ ۱۸٦۹ رۆمـاننووس و رەخنـەگری فەڕەنسی) یـان لەگـەڵ لافیـتدا، ئەویش بێ بایەخ بوونی ئۆستووره قەدیمیەکانی «ناخ»ە. دەزانین کە بەگشتی رۆمان لەسەر ئەم ئۆستوورانەـ لە راستیشدا تەنها هەر لەسەر ئەم ئوسـتوورانەـ بـووە. بـەداب و نـەریت وا دادەنـدرێ کـە دەوری نووسـەر، لێکۆڵـینەوە لـە سروشـتەو دەبـێ ئەوەنـدە رەهۆڵـە لـە دڵـیدا هەڵکۆڵـێ تـاکوو دەگاتـە هەرەقووڵـایی نـاخی لایەنـەکانی سروشـت و وردکـە و پردکـە و پاژەکـانی نهێنییـەکی سەیروسـەمەرە بدۆزێتـەوە. رۆمـاننووس لەپاشـی رۆچوونـە نـاو قووڵایی هەستی ئینسانەوە، پەیامی سەرکەوتوانە بـۆ جیهـانی بێکەڵکەڵـەی «دنیای ئەوپەڕی هەسـتەکانی ئینـسان» دەنێـرێ و لـەو پەیامـەدا وەسـفی ئـەو دیاردە تەم و مژاوییانە دەکات کە بە دەستەکانی خۆی لەمسی کردوون. ئەو سەرەگێژە بەهەشتی‌یەی لەو کاتەدا خوێنەر هەستی پێ دەکات، نابێتـە هـۆی هیچ جۆرە حاڵەتێکی نیگەرانی یا ڕشانەوە لەودا، بەڵکوو متمانە ئەدا بەو کـە هێزی زاڵبوون بەسەر جیهانی هەستیدا هەیە.

حەتمـەن رەهۆڵـەگەلێکی زۆر قـووڵ هـەبووە، بەڵـام لـە بەرەکـەتی ئـەم ئەشکەوتناسە ئازایانەوە قووڵایی ئەو رەهۆڵانە ئەندازەگیری کراوە. لە ئاوەها دۆخێکـدا، جێگـەی سەرسـوڕمان نیـە چمـا دیـاردەی ئـەدەبیی هەڵـکەوتە هەڵقوڵیوی ئاوەڵناوی گشتی و بێ وێنەیەک بـێ کـە حـەولی داوە تـەواوی تایبەتمەندیەکانی ناوەوە، تەواوی رۆحی حەشار دراوی شـتەکان بەیەکیـەتی بگەیەنێ. بەم پێیە، وشە لە حوکمی تەڵەیەکدا بـوو کـە نووسـەر بـەو تەڵـەیە تـەواوی کائینـاتی دەخـستە داوەوە تـاکوو بیداتـە دەسـت کۆمەڵـگا. ئـەو شۆڕشەی رووی داوە، شۆڕشێکی چۆنچۆنییە: نەک هەر ئـەم جیهانـە بـە ئـی خۆی و ملکی تایبەتی خۆی نازانێ کە دەتوانێ حەوجێکانی خۆی لـە ڕێـی

ئەوەوە چارەسەر بكات و بەسانایی بەسەریدا زاڵ بێ، بەڵكوو تەنانەت ئیمانی بە «قووڵایی» ئەویش نەماوە.

لە كاتی تێداچوونی ئایدیالۆژییە واتا خوازەكاندا سەبارەت بە ئینسان و لەوكاتەوە كە چەمكی «بارودۆخ» بۆتە جێگری «سروشت» ئیدی رووالەتی رووكەشی شتەكان وەك دەمامكی ناوەوەی ئەوان دانانێین (ئەمەش هەمان ئەو نیگایەیە كە بۆتەهۆی هەموو چەشنە هەڵچوونێكی مێتافیزیكی).

دەسا بەم پێیە، تەواوی زبانی ئەدەب دەبێ ئاڵووگۆڕی بەسەردا بێ (هەر وەكوو ئەوەتانێ ئەم ئاڵووگۆڕە دەستی پێكردوە). هەر رۆژێك كە تێپەڕ دەبێ زیاتر شایەدی بێزار بوون و بێزرانی مرۆ لەو وشانە دەبین كە خووخدەیەكی غەریزی، قیاسی (بەراورد كردن) یان ئەفسووناوی‌یان هەیە.

لەلایەكی ترەوە ئاوەڵناوی بینین (بـصري)یان وەسفی، ئەو وشەیەی كە لە سەر ئەندازە گرتن، دابین كردنی شوێن، سنووردار كردن و مەعلووم و ئاشكرا و عەینی كردن قنیات دەكات، دەربڕینی رێگەیەكی دژوار و چەتوونە بو پێدارۆشتن، بەڵام زۆر شیاوی دەست پێگەیشتن بۆ هونەری تازەی رۆمانە.

### تێبینی و پەراوێزەكان

١ـ ئاندرێ شۆنبێرگ بە رەگەز خەڵكی ئۆتریش «نەمسا» بوو، بەڵام لە پاشان خۆی كردە ئەمریكی. مۆسیقارێكی نوێكار و سەلەف‌شكێن بوو لەساڵانی (١٨٧٤ـ١٩٥١)دا دەژیا.

٢ـ كوێندەركوێ: ناكجاباد، شوێنێكی نامەعلووم

٣ـ ئالێن رۆب گرێ: (. . . ـ ١٩٢٢) لە شاری «برێست»ی فەرەنسادا هاتە سەر دونیا، نوێنەری چیرۆكنووسانی نوێی فەرەنسی و رۆماننووس و تیۆرزانە. بەرهەمەكانی ئەمانەن: پیلان بۆ شۆڕش لە نیۆیۆركدا، قەڵەم سڕەوەكان، لابیرێنت، بینەر و . . . .